پێناسی کتێب:
ناوی کتێب : پێداچوونەوە (گەشتێک بە نێو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە کوردستانی ئێران)
نووسەر : کەریمی حسامی
پیت چنین و مۆنتاژ : ناسری ئیبراهیمی
چاپخانەی : ماردین ، سوێد 1996
ISBN. 91- 630- 3405-0
وێنەی سەر بەرگ رەشید عبداللە (کاکە عەبە)

(پێشکێش بە گیانی شەهیدانی کۆماری کوردستان)

# پێداچوونەوە

ستۆکهۆلم- ۱۹۹٦

کەریمی حسامی

**بۆ تێگەیشتنی ئەوە کە چیت دەوێ، بە دوای چیدا دەگەڕێی، بە کۆ کێدا دەچی، جگە لەوەی کە خوت بناسی، هیچ ڕێگای دیکەت نیە . - ماکسیم گۆرکی.**

لە ماوەی نووسین و بلاو کردنەوەی بیرەوەریەکانمدا، گەلێک لە دۆست و برادەر و ناسیاران رەخنەو پێشنیاریان ئەوەبوو کە بیرەوەریەکانم وەک نووسینی ڕووداوەی ڕۆژانە بە بێ شیکردنەوە و هەلسەنگاندن بلاو دەکەمەوە. زۆریش لە برادەران پێشنیاریان ئەوە بوو ئەگەر بکرێ گەشتێک بە نێو بزوتنەوەی نیشتمانیو ڕاپەڕینی کوردەکانی کوردستانی ئێراندا لەوانەیە هیچ زیانی نەبێ، بە تایبەت سەیرێکی ڕووداوەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بەو ئیعتیبارە کە کەسێک بووم لە ڕۆژی دامەزرانیەوە تا سالی ١٩٨٤ لە کۆڕی خەبات و تێکۆشانی ئەو حیزبە دا هەنگاوم هاویشتوە و لەگەلْ سیاسەت و تێکۆشان و هەلس و کەوتیدا ژیاوم تا سالی هەشتاو چواریش بە گوێرەی بەر پرسیەتی کات و زەمانی تێکۆشان لە هەلەو ئسکۆ و کەم و کوڕیەکانی حیزبی دیموکراتدا ( ئەگەر خوا نەخواستە ڕوویاندابێ ) بەشدار بووم.

لە گەلْ سوپاس بۆ دلسۆزی ئەو دۆست و برادەرانە بیری لێکۆلینەوەو نووسینی ڕووداوە مێژووییەکانی کوردستانی ئێران هەمیشە لە مێشکمدا لە جمو جۆلدا بوەو هەمیشە بیرم لێکردۆتەوە بەلام لە خۆم ڕانەدیوە بریاری لە سەر بدەم ،

شانی بدەمە بەرو دەست بدەمە پێنوس و خۆم گرفتاری ئەرکێکی وا قورس و دژوارو پر لە گرێ و کۆڵ و دەردە سەری بکەم. چونکە مێژوو نووسین هەر وا هاسان نیە. حکایەت گێرانەوە نیە. ئەو کەسەی بخوازێ مێژوو بنووسێ، پێویستە بە سەر روو داوەوبە سەرهاتی مێژوویی کەون و نوێی نەتەوەکەیدا زاڵ بێ. دەبێ لە سەربردەو بەسەرهاتی گەلانی جیهان شارەزا و بە تایبەت لە رووداوەکانی نەتەوەی خۆی تەواو ئاگادار بێ. مێژووخۆی زانستە و بە قەولی بەرێز دوکتور کەماڵ مەزهەر «مێژوو زانستی زانستەکانە. لە هەموان گرنگتر مێژووی ژیانە کە گشت زانستەکان و روداوەکانی رۆژانە و ئاڵ وگۆرەکانی کۆمەڵ دەگرێتەوە.» (١)

بۆ چونێکی زۆر راستە. هەر بۆیەش نووسینی مێژوو ئەگەر بە راستی بنووسرێ و رووداوەکان وەک خۆی تۆمار بکرێن و دەوری راستە قینەی بزوێنەر و پاڵپێوەنەرانی مێژوو، واتە تاک و کۆمەلانی خەڵک نیشان بدرێت، کارێکی فرە دژوار و ئەستەمە و کاری هەموو کەس نیە. بەلاَم دەبینین لە بەر نە بوونی ئەم هەل و مەرجانە زۆر جار ئەم زانستە گرنگەش لە بواری پاراستنی راستی بابەتەکان و خاوێنی ویژدان و پێنوسەوە تەواو بەرێوە نەچوە. زۆر جار مێژوو نووس لە شەقامی راستی لایداوە. بە ناهەق دەوری کۆمەلانی خەڵکی لە رەوەندی رووداوەکاندا کەم کردۆتەوە و بە ناهەق بە شان و باڵی پاشا و میر و سەرۆک عەشیرەت و سەرۆک حیزب و سەرکردەکانی هەلا گوتوە. ئاوی بۆ ئاشی فەرد پەرستی و بوت پەرستی هەڵبەستوە. رەنگە پێویست نەکا لادان و مەرایی ئەم جورە مێژوو نووسانە یەک بە یەک باسبکرێن، بەلاَم هەڵدانەوەی لاپەری نووسراوەکانی بە ناوی مێژوو رەنگە ئەم راستیانە بە جوانی دەربخەن بەرای من نووسینی مێژووی راستە قینە و تۆمار کردنی بابەت و روداوەکان پێویستیان بە چەند بارو دۆخ و ئامرازی سەرەکی هەیە.

یەکەم کەش و هەوای ئازاد و دێموکراسی و ژیانی پر لە ئاسایش و دوور لە گوشار و ترس و هەرەشەی دەسەلاتداران.

دووەم ویژدانی پاک و خاوێن و نەترس و خاوەن ئیرادەی نووسەری مێژوو.

سێیەم دەست پێڕاگەیشتنی بەڵگە و فاکت و کەرستە و وتو ویژ لە گەڵ کەسانی ئاگادار. نە بوونی ئەم هەل و مەرجانەزۆرجار بۆنەتە هۆی ئەوە کە راستی مێژوو پشێوێنرێ و بە سەر و گوێلاکی رێبەرێک هەلاّ بگوترێ و دوای چەند ساڵ ناراستی و هەڵەی نووسەر روون بێتەوە. دوور نە چین هەر لە نێو حیزبە کوردیبە کانی خۆماندا بە سەدان رۆڵەی قارەمان شەهید دەکرێن، بە سەدان ماڵ و خێزان شوێنەواریان کوێر دەکرێتەوە. بەلاّم باسیان لە کولەکەی تەریشدا نیە. قەت باسی ئەو پیرێژنە نانوسرێ کە دوو کوری پێشمەرگەی شەهید کرا بوون و لە شنۆیە را هاتبوە گوندی بانی ناوچەی برادۆست کە یارمەتی شەهیدان وەر بگرێ. کاتێکی چووم بە خێر هاتنی بکەم و دڵخۆشی بدەمەوە، گوتی : « زۆر پەرۆشی کورەکانم نیە، دوو کورم ماون ، خولاّ بکا لە رێگای ئازادی کوردستاندا شەهید بکرێن »
یان قەت باسی ئەو پیرە مێردە ناکرێ کە سێ کوری پێشمەرگەی شەهید کرا بوون و لە مزگەوتی گوندی کیتکە لە سەرە خۆشیدا هەستاوگوتی:« لە ررێگای ئازادی کوردستاندا سێ کور بۆ قوربانی کەمن. هێشتا دووی دیکەم ماون » بەلاّم ئەگەر یەکێک بە ناوی (رێبەر) بە هۆی هەڵە و نەزانتم کاریەوە شەهید بکرێ، هەموو ساڵێ لاپەری رۆژنامەکانی بۆ رەش دەکرێتە وەو بە ناهەق و ناراست بە شاخ و باڵانی هەلاّ دەگوترێ. کە وابوو نووسینی مێژوو کارێکی دژوارە. شتێکی تریش هەیە نازانم زاناپانی مێژوو چەندە لە گەڵم هاو دەنگن. بە بۆ چوونی من ئەگەر مێژوو بە چەشنی رووداوە نوسی تۆمار نەکرێ و نەخرێتە بەردەستی حەشیمەتی ئەم سەر دەمەی کە تێیدا دەژین، پاش تێپەر بوونی چەندین ساڵ لە بەسەر هات و رووداوەکان، ئیتر ئەوەی دەنووسرێ بۆ بەرەی دوایی وەک حیکایەت و چیرۆکی لێ دێت، لاوی ئیمرۆ ئەگەر روداوێکی پێش ٥٠ ساڵ بخوێنێتەوە، بە تەواوی لە راستی و چەوتی روداوەکە سەردەرناکات. کەوابوو رەنگە مێژووی راستە قیتە بریتی بێ لە رووداوە نوسی بەو مەرجەی لە سەر دەمی خۆیدا بکەوێتە دەستی

خەڵک و راستی و پاکی قەڵەمیش بپاریزری.

دەکری و رەنگە چ قەیدیشی نەبیٚ ئەگەر کەسیٚک نە زانا و میٚژو نووس و نە نووسەرێکی لیٚهاتوو بیٚ، بەڵام بیری لە هیٚندی شت کردبیٚتەوەو لە خویٚندنەوەی هیٚندیٚ بابەت و بەرهەم کەلکی وەر گرتبیٚ و ژیان وتەمەنی لە نیٚو خەڵک و لە گەڵ رووداو کارەساتەکاندا بردبیٚتە سەر، دەست بداتە پیٚنوس و ئەوانەی بە میٚشکیدا دیٚن و ئەو رووداوانەی لیٚیان ئاگادارە و بە گویٚرەی ئەو بەڵگانەی وەدەستی دەکەون تۆماریان بکات و بیانهیٚنیٚتە سەر کاغەز و لە فەوتان رزگاریان بکا و ناوێکیشیان لیٚ بنیٚ. جابا ئەم ناوە میٚژوو نەبیٚ، **پیٚدا چوونەوە** بیٚ.

ئەم نووسراوەی لە بەر دەستی خویٚنەرانی بە ریٚز دایە، رەنگە بکەویٚتە ئەم چوار چیٚوەیە و لەم چەغزەدا جیٚ بگریٚ. واتە بە میٚژوو حیساب نەکریٚ. میٚژوو نیە. باسی رووبەرێکی رووداوەکانی کوردستانە. باسی بار ودۆخی بەشیٚکی نیشتمانی داگیرکراو وگەلیٚکی مافخوراوە. نووسراوەی کوردیٚکی دیٚهاتیە کە لە هەموو ژیانیدا لە کویٚرەوەریدا بوە و بە دوای ئازادی و دیٚموکراسی و رزگاری نیشتمان و نەمانی زوڵم و زۆری و نەهیٚشتنی چەوسانەوەی زەحمەتکیٚشان دا ویٚڵ بوە. چەرمە سەری ژیان و زوڵم و زۆری دەرەبەگی خۆماڵیکوردو ژاندارمی حکومەتی دیکتاتور وای لیٚ کردوە کە **رزگاری نیشتمان** و **ئازادی** و **دیٚموکراسی** لە لای ئەو ماناو مەفهومی تایبەتی بە خۆوە بگرن .

**رزگاری نیشتمان و مەسەلەی نەتەوەیی** بە بۆ چوونی من یەک لایەنەو مجرد و وشک نیە. بۆ سەرمایە دار و بۆرژوازی چەوسیٚنەر و دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتی کورد، رزگاری نیشتمان و مەسەلەی میللیو سەر بە خۆیی هەر چەندی رەنگ و شەقڵی نەتەوەییشی پیٚوە دیار بیٚ، لە ئەنجامدا بریتییە لە وەگەر خستنی سەرمایە و وەدەست هیٚنانی سودو قازانجی بیٚ سنووروگیرفان پرکردن و چەوساندنەوەی زەحمەتکیٚشان . **ماموستا حەسەنی قزڵجی** رەوانی شاد بیٚ، دەیگوت: « دوای تیٚکچوونی کۆماری کوردستان **خانانی هەرمیٚلەش**

رایکرد بوو، ئەویش لە ماڵی شێخ لەتیفی ڕەحمەتی لە سولەیمانی گیر سا بزوە. ماڵی شێخ لەتیف بۆ لیقەوماوانی ڕاکردوو ببوە پەنا. ئێمە هیچمان نەبوو. نە پارە و نە خەبەری ماڵ و خێزان و نە هیچ کەس. خانانیش هەموو ڕۆژێ لە تاوچەی بانەوە پیاوەکانی خۆی دەهاتنە لای و پارەو لیباس و تەنانەت کولێرە ناسکەشیان بۆ دەهێنا. بەلام خانان هەمیشە داماو ونێو چاوان گرژ و تورە و نارەحەت بوو. ڕۆژێک محێدینی پیاوی شێخ لەتیف گوتی : ئەرێ خانان تۆ بۆ هەمیشە گرژ و نارەحەتی؟ خۆ شوکر وەزعت باشە و لە هیچت کەم نیە و هەموو ڕۆژێ خەبەری ماڵەوەت بۆ دێت. لە وەلام دا گوتی : « کورە محێدین کوا ئەوە ژیانە؟ لە سەر بانی ڕاتەوەستی و دوو کرمانجان نەهێنی دوو سەگبابیان پێ نەڵێی و دوو شەقیان تێهەڵنەدەی بۆ دەبێتە ژیان »

سەروان ابوالحەسەنی تەفرشیان لە یاد داشتەکانی خۆیدا کە باسی مەلا مستەفای ئەمر دەکا دەڵێ: «خەڵکی کوردستان لە شار و لە گوند دڵیان بۆ سەربەخۆیی لێدەدات. بەلام سەر بەخۆیی لە ڕوانگەی ئەوانەوە مانای تایبەتی هەیە. ڕۆژێک لە خانێکی تێگەیشتووی ئەوانم پرسی: مەبەست لە ئازادی و سەر بە خۆیی کوردستان چی‌یە؟ لە وەلام دا گوتی: ئازادی ئەوەیە کە من ئازاد بم لە کوێ بەوێ پەزی خۆم بلەوەڕێنم، بە هەر قیمەتێکی پێم خۆشە بیانفرۆشم، شیرو ڕۆنی خۆم بە کەیفی خۆم بفرۆشم و یا ببدەم بە هەر کەسێ کە خۆم دەخوازم. حکومەت کاری بە کاری منەوە نەبێ. بەلام مەلا مستەفا جۆرێکی تر لە وشەی سەر بەخۆیی تێدەگەیشت .» (٢)

ڕزگاری نیشتمان و مەسەلەی سەر بە خۆیی لای من ئەوە نیە کە بە وشە بێتە سەر کاغەز و خەڵکی هەژار و نەخوێندەوار و زەحمەتکێش بۆی ببنە دەستە چیلەی ئاگری شەر و هێندێکیش گیرفانی خۆیانی پێ پڕ کەن. ڕەزگاری و سەر بە خۆیی لای من ئەوەیە کە لە گەڵ ڕزگاری نیشتمان لە ژێر دەستی بێگانەی زۆردار، کۆمەلانی خەڵک لە زوڵم و زۆر و چەوسانەوەی خودی و بێگانەش

رزگاریان بێ. دابینکردنی ژیان و کار و بەرێچونی کۆمەڵانی نەدار و زەحمەتکێش خەڵکی لە گەڵ بێ و وڵات لە هەموو بارێکەوە بەرەو ئاسایش و پێشکەوتن وگەشانەوە و پێگەیشتن بەرەو پێش بڕوا.

**ئازادی:** بە لای منەوە ئازادی ئەوەیە کە لە کۆمەڵدا هەموو کەس بە بێ لە بەر چاو گرتنی هەڵکەوتی چینایەتی و رەگەزی و ئاینی و جینسی دەرەتانی بۆ پێک بێ کە لێهاتوویی خۆی تەجروبە بکات و بە کاری بهێنێ و رەنجی شان و پیل و تێکۆشانی خۆی بە ئازادی کەلک لێ وەر بگرێ. واتە کۆمەڵانی خەڵک لە ژێر باری زوڵم و زۆری دەسەڵات داری بێگانەو خۆیی رزگار بن و دوور لە باج و بێگار و چەوسانەوە و دوور لە ستەمی نەتەوەیی ژیان بەرنە سەر و دەرەتانی ئازاد بۆ پشکوتنی لێهاتوویی هەموو کەس دابین بکرێت. ئازادی ئەوەیە کە موخالیفەکەشت لە دەربڕین و بڵاو کردنەوەی بیرو رای خۆیدا ئازاد بێ و بە تاوانی دەر برینی بیر و رای جیاواز و موخالیف کەس نە کەوێتە بەر گوللە و ئازار و ئەشکنجە و راونان.

**دێموکراسی** بە لای منەوە هەر ئەوە نیە کە لە سەر کاغەز بنوسرێ و تاقمی دەسەڵاتدار تەبلیغاتی بۆ بکات و خۆی پێوە رازێ. دێموکراسی سیاسی بە بێ دیموکراسی ئابووری و بە بێ داد پەروەری کۆمەڵایەتی تەنیا دروشمێکی بریقە دار و راوی سەر کاغەزە. دیموکراسی تەنیا هەڵبژاردن و ئاخافتن نیە. ئیمرۆ لە نێو روناکبیرانی پێشکەوتووی دنیای سەرمایە داری رۆژئاوادا باسێکی ئەوتۆ لە ئارا دایە کە : ئەسڵی مەشروعیەتی نیزامی سیاسی تەنیا هەڵبژاردن نیە. بەڵکوو جگە لە هەڵبژاردن پێویستە تا رادەیەک داد پەروەری کۆمەڵایەتی ودابینکردنی ویست و ژیانی هەموو هاونیشتمانانی لە تەکا بێ.

زۆر کەس هەڵبژاردنی پارلمان بە لوتکەی دیموکراسی دەزانن . بەڵام لە دیموکراسی هەڵبژاردندا تەنیا ئەم مافە دراوە بە خەلک کە هەر سێ چوار ساڵ جارێک فلانکەسێک هەڵبژێرن کە حکومەتیان بە سەر دا بکا و خۆشیان لە ژێر

چەوسانەوەی چینایەتیدا بنالێنن. دیموکراسی راستە قینە ئەوەیە کە کۆمەلانی خەڵک بە گشتی لە هەموو بریارێکی بەرێوەبردنی کار وباری ولات و لە دیاریکردیی سیاسەتی ناوەکی و دەرەکی نیشتمانی خۆیاندا بەشدار بن..

**ویلی برانت** سوسیال دیموکراتی بە ناو بانگ و سەرۆکی ئینترناسیونالی سوسیالیست لە نامەیەکی خۆیدا بۆ **ئۆلوف پالمەو برونو کرایسکی** دەنووسێ :« مەبەستی من لە وشەی دیموکراسی هەڵوەشانەوەی هەموو جورە سەر پشکی‌یەکە. لە پلەی یەکەمدا دەبێ رێگای هەموو جورە پشکوتن و لێهاتوویی و لێ زانی بدرێ بە هەموو کەس بە بێ فەرق و جیاوازی. دەبێ بە شکڵی جۆر بە جۆر خەڵک وا لێبکرێ کە لە بریار داندا بەشداری بکەن و لە بەر پرسی و چارە سەر کردنی مەسەلە کۆمەلأیەتیەکاندا بەشدار بن .» (٣)

**موریس توریز** رێبەری پێشووی حیزبی کومونیستی فەرانسە جۆرێکی تر بۆ مانای دیموکراسی چوە.: « دیموکراسی ئەم ئەسڵ و رەوشتەیە کە ئامانجی هەموو رێکخراوە کۆمەلأیەتیەکانی بریتی بێت لە باشکردنی باری کۆمەلأیەتی و ئەخلاقی و فیکری و بەدەنی نەدارترین چینەکانی کۆمەڵ کە زۆریەی حەشیمەت پێک دێنن.» (٤)

هەر وەک گوترا رزگاری و سەر بە خۆیی و ئازادی و دیموکراسی لای من مەفهوم و مانای تایبەتی خۆیان هەیە.

بەلأم بۆچی ناکرێ ئەم نووسراوەیە بە مێژوو دابنرێت؟ چونکە دەزانم نووسینی مێژوو بە شێوەی **ئەمیر شەرەفخانی** بیتلیسی و **محمدامین زەکی بەگ** و یا وەک **دوکتور کەماڵ مەزهەری** رێزدار کاری من نیە. هەر چەند ئەمیر شەرەفخان (رۆستەمی زابلی و بەهرامی چوبین وگورگین میلا و فەرهادی کێو بری بە کورد داناوە و بۆ من هیچ جێگای شانازی نین.)* دیارە ناشتوانم وەک **رەشیدی یاسمی** بە نیتی دوژمنی کورد و بە ناوی مێژوو کورد بکەمە وەحشی و بیابانگەرِ و تورەمەی فارس و حاشا لە زمان و کولتور ومێژووی بکەم. لە بەر

ئەوەی جارێکی دیکە یادەدەمەوە سەر کتێبی **رەشیدی یاسمی**، جارێ لێرە بە سەریدا باز دەدەم و دەچمەوە سەر رچەی باسەکەم ودرێژە بە نووسینەکەم دەدەم.

*بروانە شەرەفنامە.هەژار کردوویە بە کوردی لە چاپدانی کۆڕی زانیاری کوردی ۱۹۷۲ ل ۲۳-۲٤

بە راستی نووسینی مێژووی کورد بە تایبەت نووسینی مێژووی نوێی خەبات و تێکۆشانی نەتەوەکەمان ئەوەندە ئالۆز و پڕ لە ماجەرا و کێشە و هەڵس و کەوتە لام وایە تاقە کەسێک هەر چەندی زانا و لێهاتووش بێ، بۆی زەحمەتە بینووسێ و هەقی خۆی بداتێ. بە تایبەت « لە بەر گەلێک هۆی ئاشکرا زۆر لاپەری مێژووی کورد شێوێنراوە. بە داخەوە هەلپەرستی ئەوتۆ هەیە دەیەوێ مێژووی کورد بکاتە پەیژەی« سەر کەوتنی» خۆی. گەر لەم روانگەوە سەیری باسەکە بکەین و هەڵیسەنگێنین ئەو ساکە دەتوانین بڵێین بەڵێ مێژووی کوردیش « پێویستی بە پیدا چوونەوەی زانستی» هەیە. »(٥)

. جا بەم حاڵەمرۆڤ دەتوانێ لە سەر کورد و مێژوەکەی چی بنووسێ؟ مەگەر بە قەولی وەرگێر و نووسەری ناسراوی کورد کاک **برایمی یونسی** :« لە کابرایەکی خوراسانیان پرسی : مەغولەکان هاتن چی‌یان کرد ؟ کابرا لە وەڵام دا گوتی: « هاتن کوشتیان و سوتاندیان و رۆیشتن » ئەگەر پرسیار بکەن: کوردەکان چی‌یان کرد ؟ دەبێ بێژین « شۆرشیان کرد، خەیانەتیان بە یەکتر کرد، یەکتریان کوشت و کوژران و شکان و هیچ » (٦)

بە راستی جێگای لێ رامانە. تا ئێستا گەلێک نووسەر و مێژوو نووسی کورد و بێگانە لە سەر کورد نووسیویانە و بیرو راو بۆ چوونی جیاواز و جۆر بەجۆر لاپەری مێژوویان پێ رەشکراوەتەوە. بەڵام قەت روون نەکراوەتەوە و تا ئیستاش وەک تەلیسم ساخ نە کراوەتەوە کە بۆ چی زیاد لەو هەموو گەل و نەتەوانەی جیهان، هەر نەتەوەی ۲٥ میلیونی کورد بە بن دەستی و بە دابەشکراوی و بێ دەسەڵات و بێ کیانی سیاسی ماوەتەوە.؟ خۆ کورد لەو نەتەوانەی کە دوای شەری

دووەمی دنیا گر بوونە دەوڵەت و سەربەخۆییان وەدەست هێناوە لە باری حەشیمەتەوە لە زۆربەیان زیاترە و لە بواری خەبات و فیداکاریەوە کەمتر لە خەڵکی تر لە رێگای ئازادیدا قوربانی نەداوە. لە بواری جوغرافیایی و پانتایی زەویشەوە بە قەدرایی سێ چوار دەوڵەتی ئوروپای رۆژ ئاوا خاکی هەیە. لە بواری خاکی بە پیت و بەرەکەت و کانگای پر لە نیعمەتی ژێر زەویشەوە لە ریزی وڵاتە دەوڵەمەندەکانی جیهاندایە.

لەوانەیە بگوترێ کوردستان کۆلۆنی نیە، ئەگەر کۆلۆنی و ژێر دەستی دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان بایە، تا ئێستا ئەویش وەک وڵاتانی دیکەی کۆلۆنی سەر بە خۆیی دەستاند و دەبوو بە خاوەنی کیان و دەوڵەت و دەسەلاتی نەتەوەیی و حاکم بە سەر زێد و نیشتمانی خۆیدا و نوێنەریشی لە بارەگای رێکخراوی دەوڵەتە یەکگرتوەکان(نەک نەتەوە یەکگرتوەکان)* قوت دەبۆوە.

راستە کوردستان ئەم چەشنە کۆلۆنیە نیە کە لەو بەری دەریاکانەوە هاتبن و

---

* نامەوی بە وشکی بەم وشە و زاراوانەوە بنووسێم کە لە حقوقی نێو نەتەوەیی و یاسا و دوکومێنتی ئەم رێکخراوە نێو دەولەتیەدابۆتە باو و بە کاری دێنن. چونکە ئێستاش لە دوکومێنت و بۆ چوونی ئەم رێکخراوەیەدا کورد لەم وڵاتانە بە کەمایەتی حیساب دەکرێ. دەمیکە گەیشتوومە ئەو بیر و رایە کە زاراوی « رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان» زاراوێکی تەواو نیە. ئەو حکومەتانەی نوێنەریان لەم رێکخراوەیەدا هەیە، لە سەتا هەشتایان نوێنەری راستەقینەی خەڵک و نەتەوەی وڵاتی خۆیان نین. لە رێگای هەلبژاردنی ئازاد و دیموکراسیەوە نە هاتوونە سەر حوکم. بەشی هەرە زۆریان بە گوێرەی ویست و داخوازی ئیمپریالیزم و لە رێگای کودیتاوە دەسەلاتیان گرتۆتە دەست و پارێزەری بەر ژەوەندی زلهێزەکان و شیرکەتە چەند میللیەتەکان و سەر کوتکەری خەڵک و نەتەوەی خۆیان بوون. بە بۆ چوونی من زاراوی « رێکخراوی دەوڵەتە یەکگرتوەکان» لە جێگای « نەتەوە یەکگرتوەکان» رەنگە بە جێتر بێ. چونکە بە راستی کۆمەلانی خەڵک لە سیاسەت و کار و باری ئەم رێکخراوەیەدا هیچ نەخشێکیان نیە. لە زۆر وڵاتانی جیهان نەتەوەکان قەلاچۆ دەکرێن و لە هەموو مافێکی بێ بەش دەکرێن و بەلام حکومەتەکانی ئەندامی ئەم رێکخراوەیە هەر وەسەر خۆشیان ناهێنن.

داگیریان کرد بێ. بەڵام خۆ نکولی وحاشا لەوە ناکرێ کە کوردستان بە فیت و نەخشەی ئیستیعمار و ئیمپریالیستەکان لەت و پەت و دابەشکراوە. کوردستانی عیراق و سوریا بە زۆری و بە ناهەق بەو ولاتانەوە لکێنراون. بەشەکانی دیکەش بە پشت ئەستوری ئیمپریالیزمی‌ئینگلیز و ئەمریکا و بێدەنگی دەوڵەتی شورەوی لە بندەستی ئێران و تورکیادا ماونەوە.

کاتێ باسی کۆلۆنی و دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان دەکرێ، هەق نیە تەنیا رووکاری وشەو زاراوە کلاسیکیەکانی سواو لە بەر چاو بگیرێن. جەوهەر و سیاسەتی کۆلۆنیالیستی لە پێوەندیەکانی نێوان دەوڵەتی کۆلۆنیالی دەسەلاتدار و ولاتی کۆلۆنی داگیر کراودا خۆ دەنوێنێ. ئەم پێوەندیە بەر لە هەموو شت لە بواری نیزامی و سیاسی و کولتوری و ئابوری و کۆمەلایەتیدا دەر دەکەوێت. دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان کاتێ ولاتێکیان داگیر کردوە، لە رێگای نیزامیەوە هەموو بەرهەڵست و بەربەرەکانی و بزوتنەوەی خەڵکی ئەم ولاتەیان سەرکوت کردوە و بە زۆری سەر نێزەو بە کوشتار و حەپس و دوور خستنەوەی خەڵک دەسەلاتی نگریسی خۆیان بە سەر ئەم ولاتەدا سەپاندوە.

لە بواری سیاسیەوە چارە نووسی کارو باری خەڵکی ئەم ولاتەیان گرتۆتە دەست و لە رێگای دانانی یاسای دژی گەلی و پولیس و حاکم و کار بە دەستی خۆیانەوە ولاتیان بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆیان بەرێوە بردوە.

لە بواری ئابوریەوە سەروەت و سامانی ژێر زەوی و سەر زەوی ئەم ولاتەیان بە تالان بردوە. لە هێزی کاری هەرزانی خەڵک بۆ پەرە پێدانی سەنعەتی خۆیان کەلکیان وەرگرتوە. ولاتی کۆلۆنیان لە دوا کەوتوویدا راگرتوە و کردوویانەتە بازاری کۆنە شتو مەکی بە کار نەهاتووی خۆیان.

لە بواری کولتوریشەوە رێگایان نەداوە کولتور و زمانی خەڵکی ئەم ولاتە ببوژێتەوە و پەرە بستێنێ. فەرهەنگی ئیستیعماری، فەرهەنگی گوێ لە مستی و راهاتن بە ژێر دەستی و کۆیلەتی و رازی بوون بە قەزاو قەدەریان لە نێو خەڵکدا

بلاو کردۆتەوە و پەرەیان پێداوە. ئەگەر بە روونی و بە شێوەیەکی بابەتیانە پێوەندی و کردەوەو سیاسەتی دەوڵەتە کۆڵۆنیالیستەکانی ئوورووپی لە گەڵ ولاتانی کۆڵۆنی و پێوەندیی و سیاسەت و کردەوەی حکومەتەکانی ئێران و تورکیا و عێراق و سوریا لە گەڵ کوردستان و گەلی کورد بەراورد بکەین و پێکیان بگرین، نەک هەر فەرقێکی ئەوتۆ نابینین، بەڵکو لە زۆر بارەوە سیاسەتی ئەمانە درندانە تر و زاڵمانە ترە. چونکە دەوڵەتی کۆڵۆنیالیست و دەسەلاتدار هەر چەندی دوا کەوتووتروکۆنە پەرستتر و خەرافاتیتر بێ، درندەیی و زوڵم و زۆری و بێ ئەخلاقیشی توند و تیژ تر دەبێ.

کوردستانی ئێمە راست لەم بارو دۆخە دایە. واتە بۆتە بندەست و کۆڵۆنی حکومەتە کۆنە پەرست و دواکەوتوەکانی سەر دەم و دژی کورد دەست لە هیچ جنایەتێک ناگێرنەوە. لە کاتێکا لە بواری کولتور و زانیاری و شارستانیەوە جگە لە ئەرتەش و چەک و چۆلی مودێرن و کوشتاری خەڵک و سوتاندنی دێهات ، هیچ زیندەیێکی دیکەیان بە سەر کوردەوە نیە. نەک هەر ئەوە، بەڵکوو لە باری فەرهەنگ و شارستانیەت و ئەخلاقی مرۆڤایەتیشەوە کورد لەپێشترە لەو حکومەتانەی کە وا حوکمی بە سەر دادەکەن. ئەوەندەیە ئەوان بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی رەوای کورد و درێژە پێداتی دەسەلاتی ئیستیعماری خۆیان ئاین و ئیسلامیشیان لە داپڵۆسین و کوشتار و سەر کوتکردن زیاد کردوە.

رزگاری لە ژێردەستی و دارنینی کۆت و زنجیری کویلەتی کۆڵۆنیالیزم جگە لە وەدەستهێنانی مافی دیاریکردنی چارە نووس و سرینەوەی شوێنەواری نگریسی کۆڵۆنیالیستی هیچ رێنێکی تری نیە. مافی چارە نووسیش بە پێچەوانەی هۆنینەوەی زرە تیئۆری هێندێ کەس و حیزبی بێ دەسەلات، جگە لە پێکهێنانی دەوڵەتی سەر بە خۆی نەتەوەیی هیچ ماناو مەفهومێکی دیکەی نیە. ئەوەی ئێستا لە کوردستان حیزبە سیاسیەکانی کورد کردوویانەتە دروشمی سەرەکی خۆیان و دەیان هەزار کەسیان بۆ بە کوشت داوە، تە مەسەلەی کورد لە بنە رەتەوە

چارە سەر دەکات و نە جێگای مافی چارە نووس دەگرێتەوە وەک لینین گوتویە :« ئەگەر بمانەوێ مافی نەتەوەکان لە دیاریکردنی چارە نووسی خۆیان تێبگەین و هەر لەو کاتەشدا خۆمان بە تاریفە قەزاییەکانەوە نە خافڵێنین و تاریفی وشک دانەتاشین، بەڵکو هەل و مەرجی مێژوویی و ئابوری بزوتنەوە نەتەوایەتیەکان شی بکەینەوە، ئەو دەم ناچار بەو ئەنجامە دەگەین کە مەبەست لە مافی نەتەوەکان بۆ دیاریکردنی چارە نووسی خۆیان، یانی مافی ئەوان بۆ جیا بوونەوە لە کۆی نەتەوەکانی غەیری خۆیان و دامەزراندنی دەوڵەتی سەر بە خۆی نەتەوەیی» (٧)

مەبەست لەم نووسراوەیە کە ناوی نراوە « پێدا چونەوە » و پێی ناڵێم «مێژوو» ئەوەیە لە تەک نووسینی هێندێ رووداوی تازەدا بە نووسراوەکانی رابردووی خۆم و بە سیاسەت و تێکۆشانی بزوتنەوەی ٥٠ ساڵەی نیشتمانی کوردستانی ئێراندا بچمەوە و بە گوێرەی توانا تیشکی روناک و بابەتی و واقیع بینانە بخەمە سەر رەوەندی ئەم قۆناخەی بزوتنەوەی کورد لەم بەشەی نیشتمانی دابەشکراودا. ئێستا کە لەم دوور ولاتیەو لە بەر دەست نەبووتی گەلێک بەڵگەو فاکت و دوکومێنتی پێویست و بە کەڵک دەستم داوەتە نووسینی ئەم دێرانە، لە رەوەندی سیاسەت و رەوتی بەرەو پێشچوونی جیهاندا پێمان ناوەتە قۆناخێکی نوێ کە لە گەڵ کات و قۆناخەکانی پێشوودا فەرقێکی زۆری هەیە. ئاڵو گۆرێکی ئەوتۆ بە سەر رەوتی جیهاندا هاتوە کە هەموو بەشەکانی ژیانی ماددی و مەعنەوی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی‌گرتۆتەوە. ئەوە نەک هەر سیاسەت و ئابووری کەوتوونەتە بەر ئەم گۆرانکاریە. بەڵکوو بیرو باوەر و بۆچوون و لێکدانەوەو ئاوات و ئامانجیش نەیانتوانیوە لە تەوژمی ئەم لافاوە خۆ دوور رابگرن. تووشی وەستان و بادانەوە هاتوون. بیرو بۆ چوون لە بارەی مێژوو، سیاسەت، رووداوە، و بە سەرهات گۆراون دنیا وەک لە جێگای خۆی بزووتبێت و جێگۆرکێی کرد بێ وایە. لە زۆر شوێنی جیهان تەنانەت نەخشەی جوغرافیاش گۆرانی بە سەردا هاتوە. ئەم گۆرانکاریە لە هەموو بەشەکانی ژیانی کۆمەڵ دا بەر چاو دەکەوی . لە سیاسەت و

ئابوریەوە بگرە تا شێوەی چۆنیەتی کارو دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان و پێوەندیەکانی نێو خەڵک و پێوەندی خەڵک و سروشت و پێوەندی‌یەکانی نێو نەتەوایەتی و..هتد. کاری کردۆتە سەر بیرو ئەخلاق و ئیدیولۆژی و هەموو شت. هەر بۆیەش نووسینی ڕووداوەکانی قۆناخی ئێستا لە گەڵ نووسینی قۆناخەکانی پێشوو فەرقی هەیە. لە نووسینی ئێستادا ، ئەگەر بکرێ پێویستە قورسایی بخرێتە سەر تای تەرازووی لێکدانەوەی زانستی و بابەتی و دوور لە لادان و بە لادا کەوتن بەلای چەپ و ڕاستدا و شێواندنی بابەت و ڕووداوەکان. هەر چەندە ئەمەش خۆی کارێکی زێدە قورس و دژوارە .

لەم پێدا چوونەوەیەدا، جگە لە و بەڵگەو سەر چاوانەی وەدەستم کەوتوون، لە شارەزایی و ئەزموونی چەند ساڵەی نێو بزووتنەوەدا کەلکم وەرگرتوە. قەزاوەت و داوەریش دەدەم بە خوێنەرانی کوردی تینووی زانینی ڕاستی و بابەتی لە بزووتنەوەدا. لە ناتەواوی و کەم و کوڕی و هەڵە داوای لێبوردن دەکەم.

**پەراوێزەکان :**


١ - د. کەماڵ مەزهەر ئەحمەد. مێژوو بەغدا ١٩٨٣. ل . ٨

٢ - ابوالحسن تفرشيان. قيام افسران خراسان . تاران .١٣٦٧ ل ١١٤ - ١١٥

٣ - ويلي برانت. پيوند با ازادي، تاران. ١٩٧٨ ل .١٨ - ١١

٤ - موريس توريز. فرزند خلق . تاران ١٩٣٧ . ل ١٥٣

٥ - دوکتور کەماڵ مەزهەر. ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە ٨١٩ - ١٩/١٢/ ١٩٨٥

٦ - درک کينيان، کردها و کردستان ، پێشەکی برايمی یونسی. تاران .ل ٥

٧ - لینین . لە بارەی مافی نەتەوەکان لە دیاریکردنی چارە نووسی خۆیاندا.. فارسی چاپی موسکو. .١٩٨ ل

## بەشی یێکەم :

# کوردستانی ئێران.

ئەگەر چی مێژوو نووسان کەم وابە بوێرن یان لە قازانجیان بێ روو داوی رۆژگار راست بنووسن جا یان لە ترسان، یان لە برسان، یان بە شوێن ئارەزووی خۆیاندا ئەچن. بەلاّم دیسان لە تێک خستنەوەی ئەو بزگورانەی کە لێ یان بە جێ دەمێنێ، دەکرێ دێو جامەیەک لێک بدرێ و راوی دەنگ و باسی ئەو سەر دەمەی پێ بکرێ. هەژار.

فرە بەگرنگی نازانم ئەگەر لە نووسیندا کوردستانی ئێران یا رۆژ هەلاّتی کوردستان بە کار بێنم. گالّتەکردن بە وشە و زاراوە لام وانیە دەردی زامی تەشەنە کردووی جەستەی کوردستان بتوانێ تیمار بکات. چ ئەوێ و نە مانەوێ نیشتمانی ئێمە لە نێوان چوار ولاّتی بێگانەدا لەت و دابەشکروە. لە هیچ یەک لەم ولاّتانەدا جگە لەناوچەی سنە کە لە بەلّگە رەسمیەکانی حکومەتی ئێراندا بە کوردستان ناو دەبرێ، بەشەکانی دیکەی نیشتمان و نیشتەجێی کورد بە کوردستان ناو نابەن.

«کوردستان لە ئێران بە « رۆژ ئاوا » و لە عیراق بە « شیمال » و لە تورکیا بە « ئەنە دۆلی رۆژ هەلاّت و ئەنە دۆلی جنوبی رۆژ هەلاّت » ناو دەبرێ.» (١)

نووسەرانی کوردیش بە گوێرەی سەلیقە و بۆ چوونی شەخسی خۆیان کوردستانی رۆژ هەلاّت و رۆژ ئاوا و باکور و باشور و ئێران و عیراق و تورکیا بە کار دێنن و جاری واهەیە کوردستانی سوریا و روسیاشی لێ زیاد دەکەن. بەلاّم

ئەوانە هیچیان لە ئەسڵی مەسەلە گرنگ و پڕ لە تەنگ و چەڵەمەی کوردا گۆڕانێک پێک ناهێنن.هیچ شتێکیش لەوە مەترسیدارتر نیە کە لەسیاسەتدا خەیاڵ وویست وئاوات لەجێگای واقعیەت دابنرێ و کۆمەڵانی زەحمەتکێشی ساویلکەو ناشارەزای سیاسەت بە وشەو زاراوەی جوان و بریقەدار گێژ بکرێن.

وەک دەزانین ناوچە کورد نشینەکانی ئێران، واتە کوردستانی ڕۆژ هەڵات لە نەخشەی جوغرافیایی ئێراندا، وەک کوردستانی گەورە لەت و پەتکراوە و بەچوار ئوستان دابەشکراوە.« ئوستانی ئازربایجانی ڕۆژ ئاوا ، ئوستانی کوردستان (سنە)، ئوستانی کرماشان، ئوستانی ئیلام وئەگەر لورستانیشی ڕەگەڵ خەین، ئەوا دەبێتە پێنج ئوستان.

ئەم دابەشکردنە، هاوکات لە گەڵ سیاسەتی شۆڤینیستی حکومەتی ئێران، لە بواری دیاری کردنی سنورو پانتایی خاک و سەر ژمێری حەشیمەتەوە، ئەوەندەی گیرو گرفت ساز کردوە کە وەدەست هێنانی ڕاژەو ئەژماری ڕاست و دروست و لێکدانەوەی بابەتی تا ڕادەیەکی زۆر وەزەحمەت خستوە. لێرەدا هەر ئەوەندە دەکرێ کە بە کەلک وەر گرتن لە بەرهەمی نووسەرانی ئێرانی لە بواری جوغرافیایی و پانتایی زەویەوە، بتوانرێ سنورر وشارەکانی کوردستان دیاری بکرێن بێ ئەوەی ڕاژەیەکی تەواوی بێتە دەست. پانتایی خاکی کوردستانی ئێران هەر وەک گوترا هەر چەندە لە جوغرافیای سروشتی ئێراندا باسی نەکراوە، بەڵام بە گوێرەی لێکدانەوەی هێندێ لە نووسەرانی کورد دەگاتە ... ١٢٥ کیلو میتری چوار گۆشە. دوکتور **عبدالرحمانی قاسملو** پانتایی خاکی کوردستانی ئێران بە ١٢٤،٩٥. کیلو میتر دادەنێت . (٢)

سنوری کوردستانی ئێران لە سەرووی ڕۆژ هەڵاتی ئاراراتەوە دەست پێدەکا و بە داوێنی زنجیرە چیاکانی زاگروس دا دێتە خوارێ تا دەگاتە پشتکۆ. ڕۆژ ئاوای کوردستانی ئێران دەبێتە کوردستانی تورکیا وکوردستانی عیراق، یا ( کوردستانی باکورو باشور). ڕۆژ هەڵاتی کوردستانی ئێران دەبێتە هەمەدان و بەشێکی

ئازربایجانی رۆژ هەلاَت. لە لای خوارو وخوارووی رۆژ ئاواشەوە لە گەلْ ئوستانی خوزستان و عیراق سنوریان لیک دەگەرێتەوە. بە راستی دیاریکردنی سنوری کوردستانی ئێران سەبارەت بە دەست تێوەردان و شێواندنی باری جوغرافیایی ئەوەندە دژوارە کە بە زەحمەت دەکەوێتەوە سەریەک.ژەنرالْ مەحمودی پەناهیان دەنووسێ:« لێکۆلینەوەو دیاریکردنی ناوچە کورد نشینەکان کارێکی لە رادە بەدەر پێویستە. سیاسەتی دابەشکردنی ئیداری ئوستانەکانی ئێران لە سەر بنچینەی سیاسەتی ئیمپریالیستی بۆ کارو باری خەلْکانی ئاسیا دامەزراوە. هەر هەمان سیاسەتی لورد گەرزنە بە کورتی فۆرمۆلە کراوە:« بەش بەشکە، دوو بەرەکی بخە ناو و حکومەت کە» بۆ نمونە ئوستانی ئازربایجانی رۆژ هەلاَت ١٢٣ گوندی کورد نشینی لە خاکی کوردستانی ئێران جیا کردۆتەوە و داویە بە ئازربایجانی رۆژ هەلاَتی تورک نشین. ئازربایجانی رۆژ ئاوا لە ٦ شاری کورد نشین : مەهاباد، بۆکان، سەردەشت شنۆ نەغەدە، خانێ و چوار شاری هاو بەشی کورد وتورک پێکهاتوە وەک ورمێ، شاپور، خۆی، میاندواو. لە ٢٢٥٥ گوندی ئازربایجانی رۆژ ئاوا ١٣٣٨ گوندی کورد نشینن و ٣٠ گوندی تێکەلْی کورد و تورکی لە خاکی کوردستانی ئێران دابریوە و داویە بە ئازربایجانی تورک نشین بە ناوی ئازربایجانی رۆژ ئاوا. کارو باری شار و دێهاتی کورد نشینی کە هەموویان کوردن، دراوە بە ئوستانداری ئازربایجانی رۆژ ئاوا. لە فەرمانداری هەمەدان ١١٧ گوندی کورد نشین لە خاکی کوردستان جیا کراونەوەو دراون بە فەرمانداری هەمەدان.» (٣)

ئەگەر ژەنرال مەحمودی پەناهیان سالْی ١٩٧٢ ئەم راستیەی درکاندوە و سیاسەتی شۆڤێنیستی حکومەتەکانی تارانی دەرخستوە، دوای ٢٠ سالْ ئەمجارە کۆنە پەرستی ئێران کە کەولْی ئیسلامیشی بەخۆ داداوە هەنگاوی چەپەلْتری بۆ دابرانی دێهاتی کورد لە خاکی کوردستان هاویشتوە. ئێستا حکومەتی دلْرەشی ئاخوندی گوندەکانی ناوچەی شامات و دەور و بەری لە فەرمانداری مەهاباد دابریوە

و خسترونیه سەرمیانداو. لە سنووری لای کوردستانی خوارووش بە دەیان گوندی کورد نشینی ویران کردوەو حەشیمەتەکەشی ئاوارە و دەر بە دەر بوون.

## چیاکانی کوردستان

دوو زنجیرە کێو کوردستانی ئێرانیان گەمارۆ داوە. لە لای سەرو لە بەرزاییەکانی ئەراراتەوە دەست پێدەکات تا لوتکەی چیای دالانپەر و دەگاتە چۆمی کەڵوێ. لە وێنشەوە خوارە پێچە بە کێوە کان دەکرێ تا دەچێتەوە چل چەشمە و دەگاتە چیای دەماوەند. بە گشتی ئەم زنجیرە چیایەی کوردستانیان گرتۆتە باوەش بە زاگرۆس ناسراوە. چیاکان بەرز یا نەوی لە هەر ناوچە و مەڵبەندێکی کوردستان ناوی خۆیان هەیە.

کوردستانی ئێران لە بواری سەر چاوەی ئاو ورووبار دەوڵەمەندە و لە بەر نەبوونی دەریا کە یەکێ لە هۆکارە گرنگەکانی نەهاتی و گەمارۆ دراوەیی خاکی کوردستانە، ئاوەکان دەرژێنە نێو گۆل و دەریاچەکانی دەرەوەی کوردستان و بۆ کورد خێریان پێوە نیە.ئەوەش یەکێ لە نەهامەتیەکانی کوردە کە وڵاتەکەی کەوتۆتە ناوچەیەکی داخراوی جوغرافی و لە هیچ لایەکەوە رێگای دەریای نیە و دەستی بە ئاوی ئازاد راناگا. لەم هەموو چەم و روبارە تەنیا لە پێش چۆمی جەغەتو و چۆمی مەهاباد و لە نیزیک سنە لەنپەری ئاو ساز کراون و کەڵکیان لێ وەردەگیرێ. چۆمە کانی هۆیەتو، خور خورە، قرنقو، سارالْ لە چیاکانی کوردستانەوە لە خوارووی رۆژ ئاوای دیواندەرە سەر چاوە دەگرن و دوای تێپەر بوون لە زەنگان و میانە لە خوارووی شاری رەشت تێکەڵ دەبنەوە و ناویان نراوە (سفید رود ) و دەرژێنە دەریای قەزوێنەوە. چۆمەکانی جەغەتو و تەتەهو لە چیاکانی چل چەشمە سەر چاوە دەگرن، لە گەڵ چۆمی مەهاباد کە لە چیاکانی مەنگورانەوە دێتە خوارێ و چۆمی گادەریش کە لە چیای گەلاز و دالانپەرەوە

سەر چاوە دەگرێ، هەموویان دەرژێنە گۆلی ورمێوە. چۆمی کەلوێ و سیروان دەچنەوە نێو دەجلە و دەرژێتە نێو کەنداوی فارسەوە.

دیارە سەبارەت بە نەبوونی نەخشەی تایبەتی و تەواوی کوردستانی ئێران، ئەم زانیارانە تەواو نین و پێویستیان بە ورد کردنەوەو لیکۆلینەوەی زیاتر هەیە. بێجگە لەوە لە بەر ئەوەی نووسینەکەی من پێوەندی‌یەکی ئەوتۆی بە شیکردنەوەی جوغرافیای سروشتی کوردستانەوە نیە، خۆم ئەوەندە بەم بەشەوە هیلاک نەکردوە. تەنیا ویستوومە سەر پێی چۆنیەتی بارو دۆخی سروشتی کوردستانی رۆژ هەلات بە کورتی بخەمە روو.

## حەشیمەتی کورد لە کوردستانی ئێران.

لەم بوارەشدا هیچ ژمارە و حیسابێکی راست نایەتە دەست. چونکە سەر ژمێری ئێران ژمارەی میللەتەکانی دانیشتووی ئێران دیاری ناکات و ژمارەیەکی گشتی دەداتە دەست. بە گوێرەی سەر ژمێری سالی ١٣٦٥(١٩٨٦)حەشیمەتی ئێران بە گشتی ٨٧٤، ٧٦٤، ٤٩ کەس بوە.(٤)

بێگومان ناکرێ ئەم ژمارەیە بە راست بزانین، بە تایبەت کە ئەم سەر ژمێریە لە کاتی شەری ئێران و عیراق دا کراوە. جگە لەوەی پتر لە دوو میلیون کەسی ئێرانی لە دەست حکومەتی ئیسلامی رایان کردوە، و ئاوارەی هەندەران بوون، بەشێکی زۆری لاوانی تازە پێگەیشتوش لە ترسی سەر بازی و ناردنیان بۆ جەبهەکانی شەر خۆیان شاردۆتەوەو ناویان نە نووسیوە. ئەم وەزعە لە کوردستان و لە نێو کوردەکان زۆر روونتر دیار بوە. بەلام ئەگەر بە ناچاریش ئەم سەر ژمێریە بگرین و لەم بوارەدا پشت بە بۆچوونی دوکتور **عبدالرحمانی قاسملو** ببەستین کە « نیسبەتی کورد بە هەموو دانیشتوانی ئێران ٪١٦ دادەنێت (٥)، ئەوا دیسان ژمارەی کورد لە ئێران دەگاتە ٨ میلیون کەس.

کوردستانی ئێرانیش هەر وەک بەشەکانی دیکەی کوردستانی گەورە ولاتێکی

شاخاوی پر لە چیاو کەژی بەرز و نەوی و خرو شیو و دۆلی قولْ و لێک دابراو و لە سەر یەک پێدەشتی پان و بەرینی کەمە. ئەم سرشتەی چیاو کەژی بەرز و لێک دابراو، روباری گەورەو خڕو دۆلی قولْ، کاریان کردۆتە سەر پسیکولۆژی و روحیە و ئەخلاقی گەلی کورد و بارو دۆخێکی ئەو تویان پێکهێناوە کە هەر ناوچە و مەلْبەند و هەرێکی کوردستان حەز لە دەسەلاتی خۆی بکاو داب و رەسمی ناوچەیی خۆی بپارێزێ و نەیەوێ سەر بۆ دەسەلات و سەروەری مەلْبەند و ناوچەیەکی تری کوردی دابنوێنێ.

نە بوونی رێگاو بانی بەرینی بازرگانی لە نێوان شار و گوندی بەشە جیاوازەکانی کوردستان، ئیمکانی پێکهاتنی بورژوازی خۆمالْی و دامەزراندنی بنیاتی پیشە سازی و کز بوونەوەو ماسانی دراوی پێک نەهێناوە کە ببێتە هۆی بە هێز بوونی بنکەی ئابووری و موحتاج نەبوونی کورد بە بێگانە و بە تایبەت بە دەسەلات دارانی فارس و تورک و عەرەب.

رۆژنامەی مەنچە ستێر گاردییەن لە ژمارەی ١٩٦٢/٥/٢٣ نوسیبووی :« ناکۆکی و ململانی عەشیرەتی و تەنسیری سنورە سیاسیەکانی نێو نەتەوەیی و گیرو گرفتی پێوەندیی و هاتو چۆ لە نێوان بەشەکانی کوردستاندا، کۆسپی گرنگی رێگای یەکێتی نەتەوەیی ئەوان بوە. »

دەسەلاتێکی نەتەوەیی کوردستانیی بە هێزی سەرانسەریش نەبوە کە ناوەند و مەرکەزێکی هێز و دەسەلات پێک بێنێ و ئەو هەموو لق و ناوچەو مەلْبەند و عێل و عەشیرەت و تایفە کوردانە تێک بکاتەوەو رێکیان بخات و لە ژێر ئالاْی دەسەلاتێکی میللی دا کۆیان بکاتەوە. کوردەکە نەیتوانیوە لە ئایینی ئیسلامیش کە بە شەق و بەزۆری شمشێر بەسەریدا سەپێنرا، بۆ رێکخستنی کۆمەلْێکی یەکگرتووی کورد و دامەزراندنی دەولْەتێکی بە هێزی کوردستانی ئیسلامیش کەلک وەر بگرێ. تورک وەک عێلێکی کۆچەر و گەریدە و هەلْوەدای لەوەرگا گەلێک درەنگتر لە کورد هاتوونە ئەم ناوچەیەو بەناوی ئیسلام کە قەتیش بروایان

پێ نەبوە و یاسای ئیسلامیان نە پاراستوە ولاتەکانی دراوسییان بە کوردستانیشەوە داگیر کردوەو ئیمپراتوری ئیسلامیان پێک هێناوە. شا **ئیسماعیلی سەفەوی** تەنیا لە رێگای سەپاندنی مەزەبی شیعە توانی عێل و تایفە و تیرە و رەگەزی دانیشتوانی ئێران بکاتە یەک و دەولەتی شیعە دابمەزرێنێ. ئەگینا پێشتر مەزەبی سوننی لە ئێراندا زیدە و زاڵ بوو. کوردەکە لەوانە لە هەموان زیاتر خزمەتی ئیسلامی کردوە و لە پێناو گەشە پێدانی زمان و ئەدەبی بێگانەدا زمان و ئەدەبی نەتەوایەتی خۆی وەلا ناوە، بەلام قەت نەیتوانیوە ئەم ئیسلامەتیە بە قازانجی پێکهێنانی دەسەلاتی میللی و دەولەتی نەتەوەیی بەکار بێنێ.

ئەو ئەمارەت و ئەمیر نشینە کوردانەش کە مێژوونووسانی کورد و بێگانە باسیان دەکەن هەموویان لە ژێر تەئسیری ئایینی ئیسلام دا، هیچیان دەسەلات و دەولەتی میللی سەر بەخۆی کورد نەبوون و خزمەتکارو بەردەستی پاشاو ئیمپراتوریەکانی ئیسلام بوون و بە قیت و دهۆ و بە ئەمری ئەوان یەکتریان کوشتوە و هیچیان سەریان بۆ ئەمیر و سەردارێکی کوردی هاو رەگەز و هاونیشتمانی خۆیان دانەنواندوە. عاشیرەتگەری و ململانەی بێ جێ و لێک دابرانی ناوچە و مەلبەندی کوردستان، زیانێکی زۆریان بە یەکگرتنەوەی کورد گەیاندوە. ئەگەر بێژین بوونەتە یەکێ لە هۆکارە گرنگەکانی نەگەیشتنی کوردستان بە سەر بە خۆیی و پێکهاتنی دەولەتی کوردی لە بابەت لامان نەداوە. روحیەی قەبیلەیی و فیز و دەمار گیری توندی بنە مالەیی کە بوونەتە هۆی پەیدا بوونی عەشیرەت و خان نشینی ملوک‌الطوایفی خەسلەتی ئاشکرای کۆمەلی کوردەواریە. نابێ بە سەیری بزانین کە لە کۆمەلگای عەشیرەتی و تایفە گەریدا کە هەموو خۆیان هاو شانی یەکتر دەزانن، هیچ بنە مالەیەک ناتوانێ دەسەلاتی خۆی بسەپێنێ. لە کۆمەلگای دەرەبەگایەتی لوت بەرزدا، تەنیا بێگانە دەتوانێ ئاغایەتیان بەسەردا بکات. چونکە هیچ یەک لە ئەندامانی ئەم کۆمەلگایە سەر بۆ ئەویتریان دانانوێنن. رەنج و دەرد و ناکۆکیش وەک هێزی ژیانی رەگەزی

کوردی بە لای منەوە لەم فیز و لوت بەرزی و یەک نەگرتن و پاوانخوازی‌یەوە سەر چاوە دەگری . یەک نەگرتنی بزووتنەوەی سیاسی کوردیش هەر دەگەرێتەوە بۆ نەبوونی چینی دەسەلاتدار و یا سەرکردەی بە هێزی دەسەلاتدار کە بتوانێ بزووتنەوەی سیاسی کورد رێک‌بخا.

دیارە لەم لێکدانەوەیەدا ناکرێ دەوری مەزهەبیش لە بەرچاو نەگرین و یا بەکەمی بزانین. مەزەبی شیعە کەلە هێندێ ناوچەکانی کوردستان بلاو بۆتەوە، بێگومان کەم یا زۆرتەئسیرێکی نا لەباری خستۆتە سەر یەکێتی خەبات‌و هاوکاری گەلی کورد و لێک دابرانێکی زەقی پێکهێناوە.

لە وانەیە ئەم بیرو رایە لە ئاست کۆمەڵگای کوردەواری نە بێتە جێگای قەناعەتی گەلێک لە زاناو نووسەرانی کورد ئەوەش مافێکی رەوایە و زۆریش راستە. زانای بە ناوبانگی کورد ماموستا مسعود محمد لەو باوەرەدایە « نزیفی (اقتصادی) هۆی پەیدا نەبوونی حکومەتی کوردی‌یە: « وەک من بۆی ڎەچم هۆی ئەم مکین نە بونەی پەیدا بوونی حکومەتی کوردی لە ماوەی (٢٥..) سالدا دەگەرێتەوە بۆ دیاردەی نزیفی اقتصادی) کە لە وەتەی ئیمپراتوریەتی فارس و هی رۆمەکان و یونانیەکان و دەسەلاتی جێ نشینەکانی ئاشور و بابل دەوری لە کوردستان داوە داهاتی خاکی کورد سالانە رژاوەتە ئەم سێ ناوچە بە هێزەی ئابوری و حوکم و ئیمکان نە بوو بە درێژایی مێژوو (سەرمایە) و دارایی بایی حوکمرانی لە تێو کورد دا پەیدا بێت.» (٦)

ئەو مەسەلەیە بە لای منەوە زۆر گرنگ و پێویستە کە زاناو نووسەرانی دلسۆزی نەتەوەکەمان بە نووسینی زانستی و لێکۆلینەوەی بابەتی تیشک بخەنە سەر ئەم باسە. ئەم بارو دۆخە جوغرافی و کۆمەڵگا عەشیرەتی و تایفەگەری و ململانی ناوچە گەریە بۆتە هۆی لێکدابران و پچر پچر بوونی مێژووی کوردیش و

له جیاتی نووسینی میژووی نەتەوە بە گشتی و بە تێکرایی، میژووی ناوچە و مەڵبەند و عەشیرەت و تایفە و میرێک نووسراوەتەوە ئەویش بە ناتەواوی و کەم و کوری. هەر وەک دوکتور **رەفیق سابیر** دەڵێ: «ئەگەر میژووی گرنگترین سەردەمەکانی هەر بەش و هەرێمێکی کوردستان، بە میژووی فیکری و کولتوریشەوە بگرین دە بینین تا رادەیەکی زۆر لە میژووی سەردەمەکەی پێش خۆی، یان لە میژووی هەمان سەردەمی ناوچەیەکی دیکەی کوردستان جیاوازە. هەر سەردەمێکی میژوویی کاتێ کۆتایی پێهێنراوە لە گەڵ خۆیدا دیاردە فیکری و سیاسی و کولتورییەکانی خۆی پێچاوەتەوە و ئیتر سەردەمێکی دی لە بەشێکی دیکەی کوردستاندا دەستی پێکردوە بێ ئەوەی پێوەندییەکی تەواو کارانەی بە ژیانی روحی و مادی سەردەمەکەی پێش خۆیەوە هەبێ.... بۆیە خەڵکی هەر بەش و هەرێمێکی کوردستان زیاتر بەرهەمی میژوویی تایبەتی بەش و هەرێمەکەی خۆیانن نەک بەرهەمی میژووی سەر تا سەری نەتەوەکەمان » ( ٧ )

**پەراوێزەکانی بەشی یەکەم:**

١ - دوکتور عبدالرحمانی قاسملو - کوردستان و کورد ١٩٧٣. ل ١٢

٢ - هەمان سەر چاوە. ل ١٣

٣ - محمود پناهیان - فرهنگ جغرافیائی ملی ترکان ایران زمین ١٣٥١.هە. ل ٩٢ - ٩٣

٤ - گیتا شناسی کشورها چاپ تاران ١٣٦٩ ل ١٦

٥ - دوکتور عبدالرحمانی قاسملو. کوردستان و کورد ١٩٧٣ . ل ٢٦

٦ - مسعود محمد ، بۆ ئەمیری حەسەن پور ... ١٩٨٤ ، ل ٥٥

٧ - دوکتور رەفیق سابیر رەوشی کوردان ١٩٩١. ل ب

بەشی دووەم :

## هاتنە سەر کاری حکومەتی پەهلەوی.

کودیتای رەشەمەی سالی ١٢٩٩ی هەتاوی (١٩٢١ی زایینی) بوو بە هۆی وەلانان وکوێر کردنەوەی بنەماڵەی پاشایەتی قاجار و هاتنە سەر حوکمی رەزاخانی قازاخ و پاشان بوو بە رەزا شا و بناخە دانەری بنە ماڵەی پاشایەتی پەهلەوی و سەر کوتکەری هەموو چەشنە ئازادی وبیرو باوەڕێکی ئازادیخواز و بزووتنەوەیەکی نیشتمانی.

لە وەدا کە ئینگلیزەکان رەزاخانیان هێنا سەر کار و تا پێویستیان بوو بەرژەوەندی خۆیان پێ پاراست، جێگای گومان و مشت و مڕ نیە و بە قەولی مەلایان بە تەواتور گەیشتوە و نووسەرانی ئێرانی و بێگانە لە سەری هاو دەنگن. بۆ ئەوەی بتوانین تا رادەیەک چۆنیەتی هاتنە سەر کاری رەزاخانی قازاخ روون کەینەوە ، پێویستە تۆزێ بگەڕێینەوە بۆ دوایە و سەیرێکی بارو دۆخی ئەو دەمی ئێران و جیهان بکەین.

وەک دەزانین سالی ١٩٠٧ بە گوێرەی پەیمانێکی پێنج مادەیی نێوان رووسیای قەیسەری و ئیستعماری ئینگلیز، ئێران بە سێ مەڵبەند و ناوچەی جیاواز دابەشکرا. بە گوێرەی نەخشەی کێشراو دوو ناوچە دەکەونە ژێر نفوز و دەسەلاتی ئینگلیز و روسیا و ناوچەیەکی بە رواڵەت بێ لایەنیش بۆ ئێران دەمێنێتەوە.

ئێران ئیتر هەر بە قسە دەوڵەتی سەر بە خۆ بوو، ئەگینا بە کردەوە ببوە وڵاتێکی کۆڵۆنی و لە نێوان رووس و ئینگلیزدا بەشکرا بوو. بە تایبەت ئینگلیزەکان لە نێو سیاسیە کۆنە کارەکانی ئێرانیدا دەستێکی باڵایان هەبوو، لە رێگای ئەوانەوە یا راستەو خۆ دەستیان دەخستە نێو کارو باری ئێران و تەنانەت سیاسەتی ناوەکی و دەرەکی وڵاتیشیان بە گوێرەی بەرژەوەندیی خۆیان دیاری دەکرد.

ساڵی ١٩١٤ بە کوشتنی وەلیعەهدی نوتریش لە سەربستان ئارامی گۆمی مەندی جیهان شڵەژا و شەری یەکەمی دنیا گر هەڵگیر ساو تەرو وشکی وڵاتانی پێکەوە سوتاند. ئەحمەد شای قاجار کە تەنیا ١٤ رۆژ پێش ساز بوونی شەر گەیشتبوە تەمەنی قانونی و چوبوە سەرتەخت، بێ لایەنی ئێرانی لە شەردا راگەیاند. پارلمانی ئێرانیش ئەم بێ لایەنیەی دوو پات کردەوە. بەڵام دەوڵەتەکانی رووس و ئینگلیز و عوسمانی، گوێیان نەدا بێ لایەنی ئێران و لە سێ لاوە شەریان خستە ئێران و بێ لایەنی و دەسەڵاتی میللی پێ شێل کرا.

لە ئێرانیش کوردستان پتر لە هەموو ناوچەکانی دیکە کەوتە بەر پێنخوستی لەشکری تورک و رووس و تووشی کوشتار و قات و قری و ماڵوێرانی و دەر بەدەری بوو. کوردەکانیش لە ژێر تەئسیری مەلا و شێخی کۆنە پەرست و دوا کەوتوو ، بە ناوی خەزا و پشتگیری لە خەلیفەی ئیسلام دەبوونە گۆشتی دەمی تۆپ و دەکەوتنە بەر پەلامارو کوشتاری لەشکری رووس و تالان و راو وروتی لەشکری تورک. « دەوڵەتی عوسمانی شەری یەکەمی دنیا گری بە شەری ئاینی راگەیاند بوو. داوای خەزای لە خەڵکی ئیمپراتوری دەکرد. کوردە ساویلکەکانیش لە وە هاتبوونە شادی و کەیف کە لە رێگای خەلیفەی ئیسلامدا گیانی خۆیان فیدا دەکەن. کاتێ شەر دەستپێکرا هێزەکانی روسیا کە لە ساڵی ١٩٠٩- وە لە ئێران بوون، کوردستانیان پەلامار دا و بە یارمەتی ئەرمەنی و ئاسوری دەستیان بە کوشتاری کوردان کرد. ئەم کوشتار و قەتلێ عامە هاوکات لە گەڵ قاتی و قری و

نەخۆشی و قڕانی مەر و ماڵات و دەر بەدەری و سەرمای سەخت، شیریاینێک بوو کە سەرۆکاتی کورد لە پێناو خەزا و لە ڕێگای سوڵتاندا دەیانبەخشی.» (١)

**ڤاسیلی نیکیتین** لە کتێبی کورد و کوردستاندا کە کاک **محەمەدی قازی** کردوویە بە فارسی دەڵێ:« کاتی شەری گەورەی جیهانی نیزیکەی تەواوی عەشیرەتەکانی دانیشتوی خواروی **گۆلی ورمێ** سەرەرای بریاری مەجلیسی شورای میللی لە مەر پاراستنی بێلایەنی و خۆ تێوەرنەدانی شەر، بە دەستوری شێخەکان و بە قسەی سەرۆکانی عەشایر، بۆ نموونە **قەرەنیاغای مامەش** بە ناوی خەزا وەخۆ کەوتبوون. لە نێو باڵەکان لە نیزیکی گەرو شینکێ **شێخ جەلالدینی** کوری **شێخ کەمال الدین** کاتی شەری ١٩١٤ بۆ وەرێنخستنی خەزا تێکۆشانێکی زۆری بە کار هێنا.» (٢)

با بزانین جەنابی **شێخ رەئوفی ضیائی** کە خۆی لە گەڵ **عومەر ناجی** فەرماندەی ئۆردووی تورک بوە و لیباسی ساحیب مەنسەبی و شمشیر و دەرەجەی عەشایر قوماندانی لەو وەر گرتوە، روو داوەکانی شەری یەکەمی دنیا گر و رەفتاری تورکەکانمان لە کوردستان چۆن بۆ دەگێرێتەوە:

« هێزی عوسمانی لە سێ ڕێگاوە هاتنە ئێران. لە ڕێگای موسڵ و رەواندوز و سابلاخەوە. ئەمانە ئەرکی سەرشانیان بوو کە هێزی موجاهید کۆ بکەنەوە. بیستبوویان کە شێخەکانی هەورامان لە نێو کورداندا نفوز و ڕێزیان هەیە. شێخ نەجمەددین و شێخ حسامەددین بە ناوی خەزا ئامادە دەکەن و رەگەڵ خۆیان خستیانتە رێ و گەیشتنە بانە. حەشیمەتێکی زۆری هەورامان و مەریوانیان رەگەڵ کەوتبوو. لە بانە خەڵکیان بۆ خەزا بانگ کرد. ئەو دەم لە بانە حەمە خانی بانە حاکمی شار بوو. حەمە خان بە بیانووی ئەوە کە ئێران بێلایەنی خۆی راگەیاندوە، زۆری گوێ نەدانێ. مەعموری عوسمانی لێی وەشک کەوتن کە دەبێ لایەنگری رووسان بێ. شێخەکانیان لەگەڵ هێزی هەورامان بۆ سەقز بەرێکرد. خۆشیان گەرانەوە بۆ سولەیمانی کە راپۆرت بدەن. لە سولەیمانی بریار درا بوو، بۆ

ترساندنی خەڵک چەند کەس لە پیاوە خاوەن دەسەلاتەکانی کورد بکوژن. دوای سێ ڕۆژ گەڕا بوونەوە **حەمە خانی** بانەیان گرت و ئیعدامیان کرد. **پاشان لە بانە** خەڵکیان کۆ کردەوەو بە ناوی خەزا ڕە پێچەکیان دان. شێخەکانیان دەنگدا بەرەو سابلاغ. مریدی دەروێش و سۆفی بە تەشوێ و مشار و بێور و داس و ئەمجۆرە ئامرازانە بە هەراو هوریا و سلاوەت لێدان کەوتنە ڕێ. ئەو مەعموورە خوا نەناسەی عوسمانیان کە باسی خەزایان دەکرد و لە سەر مینبەر و لە مزگەوتان وەعزیان دادەدا، هەر بۆ هاندانی خەڵک بوو، ئەگینا خۆیان بڕوایان پێ نەبوو. یەکێک لە وان کە زۆر باسی ئیسلام و موسوڵمانی دەکرد خۆم دیتم بە پێوە مێزی دەکرد. بەڵێ ئەو موجاهیدانە خەڵکیان بۆ خەزا کۆ دەکردەوە. خەڵک هێندێ لە ترسی عوسمانیان و هێندێ بۆ تالان و هێندێکیش بە ڕاستی لە ترسی خودا و لە ژێر تەئسیری تەبلیغات ڕەگەڵ کەوتبوون. هەر وەک لە پێشدا باسکرا، هەرەکەتی شێخەکانی هەورامان منیشی هێنا سەر ئەو باوەرە کە یەکەم: کافر خاکی ئیسلامیان پەلامار داوە، دووەم بێگانە خاکی نیشتمانیان پەلامارداوە و بەرگری پێویستە. ئەم دوو هەستە وای لێکردم کە خۆم بۆ خەزایە ساز بکەم و لە گەڵ شێخەکانی هەورامان بەرەو سابلاغ کەوتمە ڕێ. هێزی عوسمانی بە گوێرەی نەخشەی پێشوو دوو کەسیان لە سەرۆکی کورد بە ناوی سەردار **حەمە حوسێنخانی موکری و سەیفەدینخانی** سەقز، بە تاوانی ئەوەی کە بڕوایان بە بێلایەنی ئێران هەبوو لە شەردا و گۆیا لایەنگری ڕووسن، گوللە بارانیان کردن. پاشان مەیتەکانیان دانەوە بە کەس و کاریان. پاشان هێزی موجاهید( مەبەستی کوردەکانە. دانەر ) بوونە دوو دەستە، دەستەیەک لە گەڵ شێخەکان چوونە سابلاغ، دەستەیەکی دیکە بە سەرۆکایەتی ئەرکانی حەرب چوونە میاندواو. سەرۆکی موجاهیدان حاجی **شێخ عارفی** برام و **مەولانای** جێ نشینی شێخی بورهان بوون.دیارە مەلا و سەرۆک عەشیرەت و شێخی دیکەشیان لە گەڵ بوون.»(٣)

دیارە لە نێو ئەم شێخ و مەلایانەی کە بە قسەی تورک فریویان خواردوە و خەڵکی ساویلکە و موسوڵمانی فەقیریان بۆ خەزا هانداوە و بە کوشتیان داون، شێخ و روناکبیرو سەرکردەی نیشتمانپەروەری کوردی ئەوتۆش هەبوون کە فریوی خەزاو درۆی تورکیان نەخواردوە و تورکیان بە دوژمنی کورد زانیوە و گیانی خۆشیان لە سەر داناوە. هەر وەک شێخ رەئوف باس دەکات حەمەخانی بانەو سەیفەددینخانی سەقز و حەمە حوسێنخانی سەردار لەوانە بوون نەچوونە ژێر تەبلیغاتی بە درۆی تورک و شەهید کراون. بەڵام جێگای سەرنجە شێخ رەئوف بۆ چی باسی شێخ باباى غەوساباەدی نەکردوە کە بە فەرمانی عومەر ناجی فەرماندەی تورک شەهید کراوە. لە کاتێکا شێخ رەئوف وەک خۆی دەڵێ هەمیشە لە لای عومەر ناجی بوە. شێخ بابا کە زاناو شاعیر و شەخسیەتێکی بە ناو بانگی مەڵبەندی موکریان بوە و خاوەنی تەکیە و تەریقەتی قادری و دەروێشی زۆر بوە، بە ئاشکرا دژی تورک و قسەی پرو پوچی خەزا تەبلیغاتی کردوە. داوای لە خەڵک کردوە کە فریوی تورک نەخۆن. لە گەڵ سەردار حەمە حوسێنخانیش لە پێوەندی داربوە. بە داخەوە کوردیش وەک هەموو نەتەوەیەکی نەخوێندەوار و دوا کەوتوو نەیانتوانیوە روو داوە مێژوییەکان و سەر بردەی سەردارەکانیان بنووسنەوە و تۆماری بکەن و بیپارێزن. پشت بە پشت گێراویانەتەوە بەڵام ئەوەش زۆر زۆر کەمێنێ و لە بیر نەچێ لە سەت ساڵ پتر تێناپەرێ.. باسی ئیعدامی شێخ باباو سەرداری بۆکانێ لە لای پیرە پیاوانی مەڵبەندی موکریان نوقڵی مەجلیس و دانیشتنان بوە. شێخ باباو حەمە حوسێنخان زۆریان هەوڵداوە کە خەڵک لە چوونی خەزا سارد کەنەوەو بەڵکو لەم رێگایەوە کوردەکان لە کوشتاری وروسان بپارێزن. بەڵام هەر وەک شێخ رەئوف باس دەکا، تەبلیغاتی شێخ و مەلایان بۆ خەزا و ناردنیان بۆ بەهەشت پتر کاریگەر بوە و کوردەکە نە پارێزراوە. تورک هەر بە قسەی شەیتان و شوفاری کورد لە شێخ بابا و حەمە حوسێنخانی سەردار و سەیفەدینخانی

سەقزی وەشک دەکەون کە گۆیا لە گەڵ رووسان پێوەندی‌یان هەیە، لە گوندی کەرێزەی گڵی لە نیزیک بۆکان، **شێخ بابا سەعیدی بەرزنجی** دەگرن و ئیعدامی دەکەن. پاشان مەیتەکەی دەبەنەوە غەوساباد.

رۆژ نامەی کوردستان لە ژمارە ١٥ی ٢٢ی رێبەندانی ١٣٢٤ - ١٦ی فیوریەی ١٩٤٦ دەنووسی « **شێخ بابا سەعید** کوڕی **شێخ سمایلی کلاو قووچ کوڕی سەید محەممەد و کوڕی سەید بابا سەعید** کە بە صدرالسادات نێو بانگ رۆیشتوە. لە حدودی ساڵی ١٢٥٣ ه.ق ی لە دێی قولەر لە دایک بوە و لەکن **مەلا عەلی قزلجی** لە تورجان و **مەلا عبداللەی پیرە باب** لە وەتەمیش خوێندوویەتی و عرفانی لە خزمەت کاک ئەحمەدی سلیمانی خوێندوە و اجازەی ارشادی لە شیخ مارفی کانی کەوە وەر گرتوە. مریدیکی زۆریشی ماون. **شیخ بابا** بە هاو دەستی شیخی شەهید **شیخ عبدالقادری نەهری** و **سەیفەددینخانی** سەقز و **حەمەخانی** بانە و **حەمە حوسێنخانی سەردار** زۆری لە رێی سەر بەخۆیی کوردستاندا زەحمەتی کیشاوە و لەم بابەتەوە لە گەڵ ئیمپراتوری رووسیای تەزاری عەلاقیکی باشیان هەبوە. بەڵام وەلامی ئەم عەلاقەیە بە عمر تاجی بەگ فەرماندەی تورکان لە موکریان گەیشت و ئەویش **شیخ بابای** بە دیل گرت و بی محاکەمە لە دێی کەرێزەی گڵی وەرزی ١٣٣٣ ی هیجری وەکوو باقی هاورێکانی هەلیاوەسی و هەر لە وێ شاردراوەو پاش هەشت مانگ کە تورک تون بە تون چوون جەنازەکەیار هیناوە دێی قولەر و بە خاکیان سپارد.»

**حەمە حوسێنخان و میرزا مەحمودی ئەفخەمی** میرزای سەردار و **سەیفەدینخانی** سەقزیش دەگرن و سواری وشتری بێ جیازیان دەکەن و دەیانبەن بۆ مەراغە. لە ٢٣ی مانگی سەفەری ساڵی ١٣٣٣ی کۆچی لە مەراغە ئیعدامیان دەکەن. سەیر ئەوەیە مەلاکان هێندەش بروایان بەو خەزایە نەبوە کە وا بۆ تورک خەڵکیان هانداوە. دەڵێن لە چۆمی مەجید خانی مەلایەک بۆ چوونی

بەهەشتی بە خەزا هێندێ خەڵک کۆ دەکاتەوەو بەرەو میاندواو پێشیان دەکەوێ. لە سەرگردی سەولێتەپە رووس لێیان راست دەبتەوە. کوردەکان رادەکەن. دەڵێن مەلا بە سواری رایدەکرد و دەیگوت خودایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت ئەو جاریش شەهیدم نە فەرمووی.! رووس شاری سابلاخیان پەلامار داوە. **عومەر ناجی و شێخ رەئوف** هەلاتوون و رووسەکانیش نیزیکەی سێ هەزار کەسیان لە سابلاخ و ئیندرقاش قەلاچۆکردوە .**میرزا فەتاحی قازی** کە یەکێ لە شەخسیەتە بە ناو بانگەکانی زانستی و ئەدەبی زەمانی خۆی بوە، هەر لەو شەرانەدا دژی داگیر کەرانی رووس لە سابلاخ شەهید کراوە.

سەرنج راکێش ئەوەیە لەو کاتەدا کە تورک لەشکریان دێنا نێو خاکی کوردستانی ئێران و کوردەکانیان بە گوێرەی فتوای شێخ و مەلایان بە ناوی خەزا و بۆ پشتگری لە ئیسلام بەرەو مەیدانی شەر رەکێش دەکرد و بە رووس بە کوشتیان دەدان، خۆیان لە کوردستانی تورکیا کوردەکانیان بە کۆمەڵ قەلا چۆ دەکرد. بەلام کوردی ئێران ئاگاداری کارەساتی برای نەبوو، یا لە بەر خاتری ئیسلام گوێی نەدەدا کوشتاری هاو رەگەزەکەی خۆی. هەر وەک ئێستاش هیچ یەک لە بەشەکانی کوردستان گوێ نادەنە دەرد و ئازار و تەنگ و چەڵەمەی بەشەکانی تر و دوژمن بە راشکاوی چی بوێت دژی کورد ئەیکات. « لە بەهاری ١٩١٤ تورکەکان بۆ سەرکوتکردنی راپەرینی مەلا سەلیم لە بیتلیس هێزێکی گەورەی لەشکریان بە کار هێنا. راپەرین سەر کوت کرا. لە بیتلیس کوشتاریان لە کورد کرد. مەلا سەلیم و چەند کەس لە هاورێیانی پەنایان بۆ کونسولخانەی رووس برد لە بیتلیس. شێخ سەید عەلی و شێخ بەهاددین و مەلا رەسول و نۆ سەر کردەی کوردی راپەرینی بیتلیسیان لە دار دا. هەر لە مارتی ساڵی ١٩١٤ لە کوردستانی خواروو شێخ عبدالسلامی بارزانی دژی تورک راپەری و شۆرشەکەی بەشی زۆری ویلایەتی موسڵی تەنیەوە » (٤)

لە گەرمەی شەردا ، چواری مانگی مارسی ١٩١٥ حکومەتی رووسیای

قەیسەری لە یادداشتێکدا باڵیوزی فەرانسە و ئینگلیز ئاگادار دەکات کە رووسیا ئەستەمبوڵ بە خاکی خۆیەوە دەلکێنێ. ئینگلستان بەم شەرتە لە گەڵ ئەو پێشنیارە موافیق دەبێ کە پاش گرتنی ئەستەمبوڵ پەیمانی ۱۹۰۷ ی نێوان رووس و ئیگلیز دەستکاری بکرێتەوە و ناوچەی بێلایەنی ئیران بدرێ بە ئینگلیز. ۲٥ی مارسی ۱۹۱٥ رووسیای قەیسەری پێشنیاری ئیگلیز قەبوڵ دەکات. « قەراردادی ۱۹۱٥ی رووسیاو ئینگلیز هەر چەندە فرە گرنگ بوو، بەلأم بە حوکمی قەزاو قەدەردەبوایە تەمەنی لە سێ ساڵ کەمتر بێت. چونکە شکانی رووسیا لە رۆژئاوا و شۆرشی توندی هەموو لایەنەی ئوکتوبر تۆماری تەمەنی ئیمپراتوری بەد ناوی رووسیای قەیسەری پێچایەوە. رژێمی سوڤێتی هەموو پەیمان و قەراردادە نابەرانبەریەکانی رووسیاو ئیرانی هەڵوەشاندەوە. بەلأم هەر لەو کاتەشدا هێندێ تیپی ئوردوی سوری تاردە ئیران ورەشت وئەنزەلی خستە ژێردەستی خۆی.» ( ٥ )

هێزی نیزامی ئیران لەو کاتەدا بریتی بوو لە (بریگادی هومایونی قازاخ) لە ژێر سەر کردایەتی ئەفسەرانی رووس. هێندێ ژاندارمی بێکارە و بێ توانا هەبوون کە لە ژێر دەستی ئەفسەرانی سویدی دابوون. دوای شۆرشی سوسیالیستی ئوکتوبر پێوەندیی هاو پەیمانەکان و بارو دۆخی هاوکاری ئەوان گۆرانی بەسەرداهات. ئینگلیزەکان ستراتیژی خۆیان لە سەر ئەوە دامەزراند کە رێگا نەدەن شۆرشی ئوکتوبر پەرە بستێنێ و بگاتە ئیران. لە لایەکی تر ترسی ئەوەشیان هەبوو کە تورک و ئەلمان لە شپرزەیی و خۆ نەگرتنی شۆرشی ئوکتوبر گەلک وەر بگرن و خۆ بگەیێننە قەفقاز و دەست بە سەر ئەوتی باکۆ دا بگرن. پێشتر کاپیتان **نوئیل** یان بۆ شارەزا بوون نارد بوە باکو. لە گەرانەوەدا هێزەکانی جەنگەڵ بە سەرۆکایەتی میرزا **کوچکخان** گرتبوویان. ئینگلیزەکان بە پەلە بوون پێش پەلاماری تورکی عوسمانی خۆ بگەیێننە قەفقاز. بۆ ئەو مەبەستە ژەنراڵ **دینسترویل** یان لە گەڵ ۱۲ ئەفسەر و ٤١ ماشین و زرێ پۆشێک لە تەزوینەوە ناردە ئەنزەلی. بە لأم کومیتەی سوری جەنگەڵ کە دوای شۆرشی

ئۆکتۆبر لە گیلان پێکهاتبوو، پێشی گرت و ڕێگای نەدا تێپەڕێ. ناچار بەرەو قەزوێن گەڕایەوە.» (٦)

دوای گەڕانەوەی ژەنراڵ **دینستروێل** ئینگلیزەکان دەیانەوێ ڕێگای ڕەشت و ئەنزەلی بە زۆری و بە شەڕ بکەنەوە. بەڵام بۆ ئەوەی لە سەرەتاوە لە گەڵ شۆڕشی جەنگەڵ تووشی قڕە نەبن لەشکرێکی رووس کە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبر لە ئێران مابۆوە، بە فەرماندەری **بیچراخۆف** هانیاندا کە بە بیانووی گەڕانەوە بۆ رووسیا دەست بە کار بێت. دوای شەڕێکی چەند ڕۆژە **بیچراخۆف** ڕێگا دەکاتەوەو دەر باز دەبێ. بەڵام ئینگلیزەکان ناتوانن لە ڕەشت تێپەڕن و پێشڕەوی بکەن. لە قەزوێنەوە فڕۆکەی ئینگلیز هەموو ڕۆژێ وەحەوا دەکەون و شوێنی ئازادیخوازانی جەنگەڵ بۆمباران دەکەن.

ڕاپەڕینی جەنگەڵ و شەڕی ئینگلیز لە گەڵ شۆڕشگێڕانی جەنگەڵ و هاتنی ئوردووی سوور بۆ ڕەشت و گیلان و ناکۆکی ڕێبەرانی جەنگەڵ و پێکهاتنی کۆماری سۆسیالیستی گیلان و تێکچوونی بە هۆی سیاسەتی چەوتی کۆمیتەی رووسی شۆڕشی ئۆکتۆبر لە قەفقاز باسێکی جیاوازە و پێوەندی بە باسەکەی ئێمەوە نیە.

ساڵی ١٩١٨ شەڕ دەبڕێتەوە. ئینگلیزەکان کە خۆیان بە سەر کەوتوو دەبینن، دەیانەوێ سیاسەتی ملهوڕی و نیزامی بە سیاسەتی نەرم و بەڵام پیلانگێران و فریو دان بگۆڕنەوە. لە ئێران میرزا **حەسەنخانی وسوق**، ناسراو بە **وسوق‌الدوله** سیاسی کۆنە کار و دۆست و بڕوا پێکراوی خۆیان دەکەنە سەرەک وەزیر. **وسوق الدوله** لە مانگی ئاوگوستی ١٩١٩ پەیمانێکی تازە لە گەڵ ئینگلیز ئیمزا دەکات کە بە کردەوە ئێران دەبێتە کۆلۆنی ئینگلیز و دەستی ئینگلستان لە هەموو کارو بارێکی دەوڵەتی ئێراندا ئاواڵە دەبێ. ڕەخنە و نارەزانیی خەڵک دژی پەیمانی ناو براو دەستپێدەکا و دەگاتە ڕادەیەک کە **ئەحمەد شاش** دژی قەرارادادەکە دەوەستێ و دوای ئەوەی نارەزایی خۆی بە

سەرەک وەزیر رادەگەیەنی سەفەری ئورووپا دەکا. **وسوق‌الدوله** بۆ دمکوتکردنی موخالیفانی قەرار داو، حکومەتی نیزامی رادەگەیەنێ و گرتن و ئازار و راونان بۆ ترساندنی خەڵک دەست پێدەگرێ.

لەم بەینەدا ئینگلیزەکانیش بێکار دانانیشن. لە لایەک دەستەیەکی نیزامی بە سەرۆکایەتی **ژەنراڵ دیکسن** دەکەنە مەعموری پێکهێنانی تەشکیلاتی نوێی ئەرتەشی ئێران و لە لایەکی تریش یەکی دیکە لە پیاوەکانی خۆیان بە ناوی **نصرت الدوله** دەنێرنە ئورووپا تا لە پاریس **ئەحمەد شا** رازی بکات هاودەنگی خۆی لە گەڵ پەیمانی **وسوق‌الدوله** رابگەیەنێ. **ئەحمەد شا** دەڵێ :« ئەم پەیمانە بە قازانجی دەوڵەتی ئێران نیە. جگە لەوە پاشایەکی مەشروتە بە بێ پەسندی پارلمان مافی ئەوەی نیە سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە بیرو رای خۆی دەر ببڕێ »

ئینگلیزەکان لە هەڵوێستی شا تورە دەبن. بەلام پشویان لە سەر خۆیە و چاوەروان دەبن لە لەندەن لە میوانداری پاشای ئینگلستاندا **ئەحمەد شا** باسی پەیمانەکە بکات. **ئەحمەد شا** لەوێش خۆ دەبوێرێ و باسی ناکات. ئیتر لەوێوە ئینگلیزەکان بریاری لابردنی ئەحمەد شا دەدەن و بۆی دەست بە کار دەبن.» (٧)

یەکەم هەنگاویان ئەوە دەبێ کە بریگادی قازاخ لە دەست ئەفسەرانی رووس دەر بێنن. لەم بوارەدا یادداشتێک دەدەن بە دەوڵەتی ئێران و پێشنیار دەکەن کە بە سەر بریگادی قازاخ دا چاوە دێری بکەن. ئەگەر وانەبێ و دەوڵەتی ئێران پێویستی بە یارمەتی ئێمە نەبێ، هێزەکانمان لە ئێران دەبەینە دەر. ئەوە لە کاتێکدایە کە لە گیلان کۆماری سۆسیالیستی دامەزراوە. سۆڤیێت لە ئازربایجانەوە ئوردووی ناردۆتە گیلان و تەبلیغاتی کومونیستی بلاو دەکرێتەوە. لە نێو رێبەرانی راپەرینی جەنگەڵدا ناکۆکی و هەرا ساز بوە، لە ئێران بە تایبەت دەوڵەتی **وسوق الدوله** ملی بۆ پێشنیاری ئینگلیز رادەکێشێ. بەلام نارەزاییش دژی پەیمانی ١٩١٩ هەر بەر دەوامە.

**یەحیای دەولەتاباادی** لە کتێبی خۆیدا بە ناوی حەیاتی یەحیا دەنووسێ: « ئینگلیزەکان دەیانزانی قەراردادەکەیان لە سەرە مەرگدایە و لە گەڵ **وسوق الدوله** دەنێژرێت. **موشیرالدولەش** نایەوێ قەراردادەکە بەرێتە مەجلیس. بە هۆی سەید **ضیاءالدینی طبا طبائی** کومیتەیەکی نهێنی لە لایەنگرانی پەیمان و هێندێ کەسی دیموکرات و هێندێ کەسی نەرم کێش، بەو مەبەستە پێکدێنن کە داوا بکەن حکومەتێکی تازە بێتە سەر کار کە لە گەڵ بیرو رای ئینگلیز و مەبەستی ئەوانیش هاو دەنگ بێت. » ( ٨ )

**ئیبراهیمی فەخرائی** لە کتێبی ئیمیل لوستور بە ناوی ( ئینگلیزەکان لە ئێران ) کە بە زمانی فەرەنسی نووسراوە، دەگێڕێتەوە دەڵێ: « ئینگلیزەکان هاتنە سەر ئەوەی حکومەتێکی دڵخوازی خۆیان کە سەتا سەت لە بەر دەستی خۆیان دابێت دابمەزرێنن. راپەراندنی ئەم مەبەستەیان لە رێگای کودیتاوە بە باشتر زانی. چونکە **ئەحمەد شاش** بۆ رەتکردنەوەی پەیمانی ١٩١٩ لە گەڵ میللەت هاو دەنگ بوو. ئینگلیزەکان نەیاندەویست لە پەیمانە کە پەشیوان بینەوە. بە هاو دەنگی و پیلان لە گەڵ یەکێ لە لایەنگر و بروا پێکراوەکانی خۆیان کە لە پەسن و تاریفی سیاسەتی ئینگلیز دا چەند تۆن کاغەزی رەش کرد بۆوە و لە گەڵ ئەفسەرێکی لوت بەرزی قازاخ ویستیان ئەم نیەتە ئەنجام بدەن. **سەید ضیاءالدین** مودیرێ رۆژنامەی رەعد یان بۆ رێبەرایەتی کۆدیتا هەڵبژارد. لە فیوریەی ١٩٢١ ( سێیەمی رەشەمەی ١٢٩٩ی هەتاوی) قازاخی ئێران لە قەزوینەوە تارانی پەلامار دا. دەستی بە سەر وەزارەتخانە و ئیدارەکانی دەولەتی داگرت و خەڵک کەوتە ژێر زەخت و گوشار و لەم تاریخەوە دەورەی ملهوری و زۆرداری و پێ شێلکردنی ئازادی میللەت دەست پێدەکرێ. کودیتا مارکی ئینگلیزی پێوە بوو. » ( ٩ )

دوکتور **کەریمی سەنجابی** لە بیرەوەریەکانیدا دەڵێ: «دوای شۆرشی ئوکتوبر ئینگلیزەکان کەوتنە سەر ئەم بیرو رایە کە لە بەرانبەر بیرو بزاڤی شورشگێری

تازەدا کە لە رووسیا وە سەری هەڵدابوو، زنجیرە لەمپەرێکی پێشگری لە فنلاندەوە تا ژاپۆن دروست بکەن. پێویست بوو لە ئێرانیش هێزێک بێننە سەر کار کە هەم پێشی سەرهەڵدان و رێکخراو و بزووتنەوەی شۆڕشگێری و ئازادیخوازی و سەر بە خۆیی خوازی بگرێت و هەم لە بەرانبەر بیری شۆڕشگێریدا کە لە سۆڤێتەوە هاتبوو ئێران ببێتە لەمپەر و پشتێندەیەکی قایم و گەورە. ئەو دەم ئێران لە بەر دەستی ئینگلیز دابوو. دەیانویست حکومەتێکی خاوەن توانا و بە دەسەڵات بێننە سەر کار کە خۆی بە پێشکەوتوو خواز نیشان بدات. لە سەر ئەوە ساخ بوونەوە کە کودێتایەک بکەن. بڕوایان بە ژاندرمەری نەبوو. دەبوایە ئەم ئەرکە بە قازاخان بسپێرن. ئەو دەم لە نێو قازاخاندا ئەفسەری لە رەزاخان گەورە تر هەبوون. زۆر کەس لە رێبەرانی سیاسی و ئایینی ئێمە لە سەر ئەم باوەڕەن کە ئینگلیزەکان لە هەڵبژاردنی رەزاخاندا بۆ ئەم کارە هەموو قۆناخەکانی داهاتوویان پێش بینی کرد بوو. واتە دایان نابوو لە پێشدا بیکەن بە فەرماندەی دەستەی قازاخ، دوایە بیکەن بە وەزیری جەنگ، دوایە سەرەک وەزیر و لایەنگری و ویستیاری جەمهوری، ئاخرەکەشی پاشایەکی دیکتاتور. ژەنراڵی ئینگلیزی بە ناوی ئیرن‌ساید کە فەرماندەی هێزی ئینگلیز بوو لە ئێران رەزاخانی قازاخی بۆ ئەم کارە هەڵبژارد بوو.»( ١ . )

زنجیرە رووداوەکانی کە بوون بە هۆی پاشایەتی رەزاخان و سیاسەتی چەوت و نەزانانەی کومیتەی شۆڕشی ئازەربایجانی شوورەوی و دەست تێوەردانی بێ جێی شۆڕشگێرانی رووس و ئازەربایجانی لە کار و باری راپەڕینی جەنگەڵ، پێویستی بە باسێکی تایبەتی و دوور و درێژ هەیە و پێوەندیشی بە ئەسڵی نووسینەکەی ئێمەوە نیە. لێرەدا تەنیا مەبەست روونکردنەوەیەکی کورتی هۆیەکانی هاتنە سەر کاری رەزاخانی قازاخە. ئەوەندە هەیە هەر وەک دوکتور کەریمی سەنجابی دەڵێ:« لە گەڵکو دەسەڵاتی گرتە دەست ترس و وەحشەتی ساز کرد. هیچ کەس نەیدەوێرا سەری دڵی هەڵباوێ. سەید ضیاءالدینی وەلا ناو لە ئێرانی دوور

خستەوە.قوام السلطنەی کرد بە سەرۆک وەزیر. پاشان ئەویشی وەلا نا و خۆی بوو بە سەرۆک وەزیر. هەڵبژاردنی دەورەی پێنجەمی پارلمانی ساز کرد و زۆربەی لایەنگرانی خۆی هێنا پارلمان. لە پێشدا زەمزەمەی جەمهوری ساز کرد و گۆیا ئێران ببێتە جەمهوری و خۆشی ببێتە سەر کۆمار. کاتێ سەرۆک وەزیر بوو، خۆی کردە فەرماندەی گشتی هێزی چەکدار. سەید حەسەنی مودەرسیش بۆ ئەوەی رەزاخان رازی بکات لایحەیەکی قانونی لە مەجلیس بە پەسند کردن دا کە بە گوێرەی قانونی ئەساسی دەبێ شا فەرماندەی گشتی هێزی چەکدار بێت. کە وابوو رەزا خان بە ناوی شا بکرێ بە فەرماندەی گشتی. رەزاخانیش بە لایەنگرانی خۆی گوت: وادیارە میللەت لایەنگری جەمهوری نیە. کە وابوو واز لەم باسە بێنن و فیکرێکی دیکە بکەنەوە. بەم جورە لە مەجلیسی پێنجەم قانونی لێخستنی بنە ماڵەی قاجار پەسند کرا ورەزا خانیان بە شای ئێران هەڵبژارد.(١١)

**پەراوێزەکانی بەشی دووەم:**

١ - درک کینان، کردها و کردستان . وەرگێرانی برایمی یونسی. ١٣٧٢ ل ٧٣ ٧٥
٢ - واسیلی نیکیتین. کرد و کردستان. وەر گێرانی محمد قازی. ١٣٦٦ ل ٤٥٩ ٣٤٥
٣ یادداشتهایی ازکردستان. شیخ رئوف ضیائی باهتمام عمر فاروقی١٣٦٧ ل ٤٠ ٤١ ٤٣
٤ - کێشەی کورد.م.س.لازاریف. وەرگێرانی د.کاوس قەفتان. ١٩٨٩ ل ٣٣٩ ٣٤٠
٥- دوکتور فیروز کاظم زادە . روس و انگلیس در ایران ل ٣٤٤ ٣٤٥
٦ - ابراهیم فخرائی. سردار جنگل. ١٣٦٢ ل ١٣٠
٧ - هەمان سەر چاوە ل ١٩٣ ١٩٤
٨ - حیات یحیی. بەرگی چوار ل ١٥٠ ١٥١
٩ - ابراهیم فخرائی . سردار جنگل ١٣٦٢ ل ٥٠١
١٠ -خاطرات سیاسی دکترکریم سنجابی ١٣٦٦ ل ٣٢، ١١٣٣ - هەمان سەر چاوە ل ٣٠

بەشی سێیەم:

# کورد لە سەردەمی ڕەزاشادا

بە کورتی باسی ئەوەمانکرد کە ئینگلیزەکان بۆ بەر بەستکردنی بیری شۆڕشگێری و نفوزی شۆڕشی ئۆکتۆبر ڕەزاخانی قازاخیان بە قۆناغی جۆر بە جۆردا گەیاندە سەر تەختی پاشایەتی و ئەمجار ئیتر لە جیاتی ڕەزاخانی قازاخ، ڕەزا شای پەهلەویە. هێندێ لە نووسەرانی بێگانە و مێژوو نووسانی ئێرانی لە شیکردنەوەی هۆیەکانی هاتنە سەر کاری ڕەزاخان هێندێ لایەنی باش و لە باری ئەم کودیتایە لە بەر چاو دەگرن. بۆ نموونە دوکتور کەریمی سەنجابی کە خۆی کوردێکی فارساوی و یەک لە ڕێبەرانی جەبهەی میللی سەر بە دوکتور مصدق بوو، لە بیرەوەریەکانیدا دەڵێ: «ڕەزا شا شوێنەواری لەبار و نا لە باری گەورەی لە ئێراندا بە جێهێشت، کارە لە بارەکانی بریتی بوون لە: نەهێشتنی ملوکالطوایفی و خانخانی و دەسەڵاتی عەشیرەتی. ڕەزا شا دەرەبەگایەتی لە ئێران پاک کردەوە، ئەم هەنگاوەی ڕەزا شا بۆ ئاڵو گۆڕی کۆمەڵایەتی ئێران پێویست بوو. ئەو دەم کەڵهور و سەردارانی بەختیاری و والی لورستان و سەرۆک عەشیرەتانی کورد هەر یەکە لە ناوچەی خۆیان حکومەتێک بوون. لە کۆمەڵگای ئاوادا ئەزمی دیموکراسی بەرقەرار نابێ.» (١)

دوکتور کەریمی سەنجابی ڕوونی ناکاتەوە کە بە هاتنە سەر حوکمی ڕەزا

خان کام نەزمی دیموکراسی لە ئێران جێگیر بوو؟ لە نیزامی دیکتاتوری و سەرە رۆییدا نەزمی دیموکراسی چۆن سەقامگیر دەبێ.؟ **ڕەزاخان** دەرەبەگایەتی لە بەینبرد و خۆی بوو بە گەورەترین دەرەبەگ و مڵکداری ئێران. دوکتور **کەریمی سەنجابی** بە دوای بژاردنی کارە لە بارەکانی **ڕەزاخان** لە گەڵ وتەی خۆی تووشی چەواشەیی دەبێ و دەڵێ:« بە بێ ڕەحمی تەواوی عەشیرەتەکانی سەر کوت کرد. زوڵم و دەست درێژی لە رادە تێپەراند. سەرۆکەکانی لوری قەلاچۆ کرد. سەردار عەشیرەتەکانی کوردی لە دار دا. شێوەی کاری زاڵمانە بوو. هەموو حیزبەکانی قەدەغە کرد. مەشروتەی وەستاند. ئازادی چاپەمەنی نەهێشت. خەڵکێکی زۆری بێ تاوانی کوشت لە هەمووی خەراپتر کاتێ کودیتای کرد هیچی نەبوو. ساڵی ۱۳۲۰ (۱۹٤۱) کە لە ئێران دەرچوو وڵاتی مازندران و گورگان بە خڕی مڵکی ئەو بوو. لە کرماشان سەت فرسەخی چوار گۆشە مڵکی هەبوو. ۷۲ میلیون تمەنی بە پارەی ئەو دەمی لە بانگێدا هەبوو. پاشان دەرکەوت. ٥ میلیون لیرەی ئینگلیزی لە بانگەکانی ئینگلیز و ئەمریکا دا هەبوە.»(۲)

جنایەت و دزی و نیشتمانفرۆشی **ڕەزاخان** زۆری لە سەر نووسراوە و دوو پاتە کردنەوەیان لێرەدا چ بە پێویست نازانم. ئەوەی بۆ ئێمە جێگای باسە، ڕوونکردنەوەی سیاسەتی **ڕەزا شایە** سەبارەت بە کورد و بارو دۆخی کوردستان و هەر لەم کاتەشدا هەڵوێستی کوردەکانە لە بەرانبەر سیاسەتی ملهوری و سەرکوتکەرانەی ڕەزاخاندا.

لە کودیتای ۱۹۲۱ تا ۱۹۲٥ نیزیکەی پێنج ساڵی خایاند تا **ڕەزا خانی** قازاخ بە ملهوری و دیکتاتوری بێ وێنە رێگا بۆ پاشایەتی و چوونە سەر تەخت خۆش بکات. بەڵام هەر لە سەرە تای داگیر کردنی دەسەڵات دا بە پشت ئەستوری ئینگلیز لە رێگای بە قەولی دوکتور **کەریمی سەنجابی** ، نەهێشتنی ملوک الطوایفی ویستی زەبرو زەنگی خۆی بنوێنێ و خەڵک چاو ترسێن بکات. لە پێشدا دەستیکرد بە چەک کردنی عەشیرەتەکانی کورد و نە هێشتنی

دەسەلاتیان. سەرۆک و سەردار عەشیرەتی کورد، لە بەرانبەر ملهوری و زوڵم و زۆرداری قازاخاندا لە ناوچەو مەڵبەندی جیاوازی کوردستان سەر پێچی و هەڵگەرانەوەیان نیشاندا و نەیاندەویست بۆ زۆرداری و دیکتاتوری دەسەلاتی حکومەتی ناوەندی سەر نەوی بکەن. لە بواری شیکردنەوەو لێکدانەوەی هەڵگەرانەوەو راپەرین و سەربزێوی عەشیرەتە کوردەکاندا بۆچوون و بیرو رای جیاواز خۆ دەنوێنن. نووسەر و سیاسی کوردی ئەوتۆ هەن کە راپەرین و بەربەرە کانی و هەڵگەرانەوەی سەرۆک عەشیرەتەکانی کورد بە « یاغیگەری و سەرپێچی عەشیرەتی دەزانن و لایان وایە لە هەستی میللی و ئێوەرۆکی پێشکەوتوانە خاڵین.(٣)

بە بروای من هەر هەڵگەرانەو وبەربەرەکانیەکی دژی دەسەلاتی زۆرداری بێگانە و زوڵم و زۆری بێت، هەستێکی نەتەوەیی و خۆناسین و شەقڵێکی پێشکەوتوانەی پێوە دیارە. راستە سیستەمی عەشیرەتی و دەرەبەگی ناتوانێ کۆمەڵگا بگەیێنێتە قۆناخی ئازادی و دیموکراسی و زوڵم و زۆرداری خاشە بڕ بکات، بەلام ئەوەش راستە میللەتێکی لە بەرانبەر زوڵمو ستەمدا بەربەرەکانی بکات، خەباتێکی رەوایە و پێشکەوتوانەجێگای شانازیشە.. لینین دەڵێ :« ئەو کویلەیەی لە وەزعی خۆی ئاگادارە کە چۆن دەژی و بۆ باشتر کردنی خەبات دەکات، ئەوە شۆرشگێرە. ئەو کویلەیەی لە کویلەتی خۆی ئاگادار نیە و ژیانێکی بێدەنگانەو بێ شعوورانە و بێ بە گژداچوونی کویلەتی دەباتە سەر، ئەوە کویلەیەکی ئاسایی و ئیعتیادی‌یە. بەلام ئەو کویلەیەی کە بە چێژەی ژیان هەلا دەڵێ و بەو ژیانە زاری پڕ لە ئاو دەبێ و خاوەنە خۆشەویست و کار باشەکەی تاریف دەکات، ئەوە نۆکەرێکی بێ شەرمە.» (٤)

ئەگەر ئەم وتە بە نرخەیە لە گەڵ دەسەلاتی بێگانەی زۆر دار و کوردی بندەستی کویلە وار بەراورد بکەین، دەگەینە ئەم ئەنجامەیە کە ئەو سەرۆک عەشیرەتانەی لە وەزعی خۆیان ئاگادار بوون و هەستیان بە ژێردەستی و

بندەسەڵاتی کردوە و بۆ رزگاری راپەریون و خەباتیان کردوە، ئەوە هەستێکی نەتەوەییان هەبوە و شورشگێر بوون وبۆ نەهێشتنی زوڵم و زۆری و دەسەڵاتی بێگانە راپەریون. دیارە هەستی نەتەوەیی رادە و پێوانەی خۆی هەیە و نیسبیە. بەڵام ئەو سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگانەی کە ملیان بۆ زوڵم و زۆرداری راکێشاوە و بە چێژەی ژیانی سەر شۆری و خزمەت بە دوژمن ناویان لە زاری هاتوە، ئەوانە نوکەرێکی بێ شەرم بوون و خەیانەتیان بە نەتەوەی خۆیان کردوە. بە پێچەوانەی بۆ چوونی ئەم جۆرە نووسەرانە، راپەرینی ئەم عەشیرەتانە دژی دەسەڵاتی ملهوری رەزاخان، هەر چەندە خاوەنی پرۆگرام و سیاسەتێکی روونی میللیش نەبوون، هەڵگەرانەوەیەکی جوامێرانە و شۆرشگێرانە بوە نەک یاخیگەری. هێندی سەرۆک عەشیرەتی کورد لە کوردستانی ئێران لە دەیەکانی ۲۰ و ۳۰ دا، بە زنجیرە هەڵگەرانەوەو راپەرینێک، دژایەتی خۆیان لە گەڵ سیاسەتی شوم و چەپەڵی حکومەتی ناوەندی عەجەم راگەیاندوە. هۆی سەرەکی ئەو راپەرینە بەر بڵاوانەکە زۆر جار هەموو نەتەوەی کوردی گرتۆتەوە زۆرداری نەتەوەیی بوە. چونکە لە لایەک بەرە بەرە هەستی نەتەوایەتی لە کوردا پەرەی دەگرت و لە لایەکی تریشەوە رۆژ بە رۆژ زۆر داری نەتەوایەتی لە لایەن کار بە دەستانی ئەو وڵاتانەوە توند تر دەبوو.

مەزن و سەردار عەشیرەتی کورد لە لایەک بندەسەڵاتی خۆیان لە زاڵبوونی دەسەڵاتی دیکتاتۆری رەزا خاندا دەبینی و لە لایەکی تریش هەستیان بە تواندنەوەی کورد دەکرد، لە زۆر ناوچەی جیاوازی کوردستان نەیاندەویست سەر وە بن باری حکومەتی ناوەندی بێنن و رادەپەرین. بەڵام لە بەر نەبووتی یەکێتی و زاڵبوونی داب و رەسمی عەشیرەتی تێدەشکان و هیچ یەک لەو راپەرینانە سەر نەکەوتن. بەڵام بە بۆ چوونی من ئەو تێشکان و سەر نەکەوتنە هیچ لە نرخی نیشتمانپەروەری ئەو راپەرینانە کەم ناکاتەوە.

# راپەرینی عەشیرەتگەلی کورد لە ناوچەی کرماشان.

لە پێش هاتنە سەرکاری **رەزاخان** کە حکومەتی ناوەندی لەو پەری شپرزەیی دابوو، لە ناوچەی کرماشان **سەردار رەشید** لە دەوڵەت هەڵگەرابەوە و دەسەلاتی خۆی بە سەر ئەو مەڵبەندەدا بلاو کردەوە.

خوا لێخۆشبوو ماموستا **عەلائەددین سجادی** لە ( شۆرشەکانی کورد ) دا دەنووسی:« **عەبباسخانی سەر دار رەشید** کە لە بنە ماڵەی ئەردەلان بوو، بۆ سەندنەوەی حکومەتی زەوتکراوی ئەردەلان لە ژێرەوە لە گەڵ سەرۆک عەشیرەتەکان **قسەی** کردە یەک و هەموو **قسەیان** دایە. بەرە بەرە **وەکیلی جوانرۆ وحوسێنخانی رەزاو وجافر ساني لهۆن و مەحمود خانی کانی ساتان و مەحمود خانی دزلی و حەمەخانی بانە و سەنجەر خانی میاوەران و حوسێن قوڵیخانی کولیایی** بۆ یارمەتی **سەردار رەشید** رێککەوتن و بە ناوی ئەوە کە حکومەتێکی کوردی سەرلە نوێ دروست بکاتەوە دەستی دایەو ماوەیەکی باش دەوری گێرا. **عەبباسخان** لەو سەردەمانەدا کە هێشتا بە ناوی حوکمدارەوە نە هاتبوە سنە، هەر لە رەوانسەرەوە دەستدرێژی بۆ کرماشان ئەکرد. دەنگ و ئاوازی **سالار الدولەش** لەو وەختانە **دا** باوێکی باشی هەبوو. ئەویش بۆ سەندنەوەی تەختی ئێران کە گۆیا لێی زەوت **کرا** بوو - لە بەر ئەوە هەر دووکیان شەریکی یەک دەرد بوون، **سەردار رەشید** لەگەڵ ئەویشا قسەی کرد بوو. جا لەو دەورانەدا پەلامارێکی مەردانەی دایە سەر کرماشان، **محەمەد خانی** کرماشانی گرت و کوشتی. ولاتی کرماشانی بە تەواوی داگیر

کرد، دیاره لەو سەر دەمەدا کە حوکمرانی ولاتی سنەو ئەردەلاَن بوو، حوکمداری کرماشانیشی هەر دەنگی نەدایەوە.. **سەردار رەشید** ماوەیەک بەم جورە بە ناوی حوکمدارییەوە لە سنە رایبوارد و حوکمی لەو ناوەدا رەوا بوو. بەلاَم خۆی لە رەوانسەر دا ئەنیشت. .... ئاخرەکەی **سەردار رەشید** فریوی **شەریف الدولە** دەخوا و بەم ناوە کە بچێتە سنە و کارو باری ئەمارەتی ئەردەلاَن تەسلیمی ئەو بکرێ، دەچێتە سنە و میوانی **شەریف‌الدو لە** دەبێ. ئەویش دەیگرێ و دەینێرێتە تاران و تا هاتنە سەر کاری **سەید ضیائەددینی طباطبائی** لە زینداندا دەبێ.(٥)

ئەم **شەریف الدولە** ناموبارەکە سالی ١٣٣٨ی کۆچی کە دەبێتە حاکمی سنە لەشکر دەکاتە سەر عەشیرەتی گەلباغی و مەندمی و بە یارمەتی فرۆکەکانی ئینگلیسی دەیانشکێنێ و ١٩ کەس لە سەرۆک و سەر کردەکانی ئەم دوو عەشیرەتە گوللە باران دەکات. کاک **عومەری فاروقی** ناوی گوللە بارانکراوەکانی بەم چەشنە بلاَو کردۆتەوە:

**١ - ئاغا برا خان قبیلە عالەم لە عێلی گەلباغی**
**٢ - فارس خانی رەئیس //**
**٣ - میرزا عبداللە سەیف العشایر //**
**٤ - سەردار کوری قبتولی //**
**٥ - محەممەد خان رەئیسی گەلباغی**
**٦ - نور محەممەد خان لە عێلی مەندمی**
**٧ مستە فای کوری محەممەد بەگی //**
**٨ - محەممەد خانی سەرهەنگ //**
**٩ - مەلیک محەممەد خان //**
**١٠ - مەحمود بەگ //**
**١١ - عبداللە کوری شا محەممەد بەگ//**

١٢ - فەرەجخان //
١٣ - عبدالله خان //
١٤ - روستەم خانی سارم لەشکر لە تایفەی شێخ سمایلی
١٥ - مەجید خانی کوری سارم لەشکر //
١٦ - بارام خانی کوری سارم لەشکر //
١٧ - مەحمود خانی سەرداو ئیقبال //
١٨ - عەزیز خانی سەردار ئیقبال //
١٩ - مستەفا خانی شێخ سمایلی .» ( ٦ )

دوای کودیتای رەزا خان سەردار رەشید دەگەرێتەوە بۆ رەوانسەر و لە گەڵ جافر سان و مەحمود خانی دزڵی و عەشیرەتی وەلەد بێگی لە دەوڵەت هەڵدەگەرێتەوە و ماوەی دوو ساڵان رێگا نادات کار بەدەستانی حکومەتی تاران لەشکری یا ئەهلی بێتە مەڵبەندی دەسەلاتی ئەو. ساڵی ١٣٠٢ی هەتاوی رەزا خان کە هێشتا وەزیری جەنگ بوو، سەر لەشکر ئەمیر ئەحمەدی دەکاتە فەرماندەی لەشکری رۆژ ئاوا و دەینێرێتە سەر سەردار رەشیدی. ناو براو لە گەڵ هەنگی مەنسور و بە شێکی سوارەی ئەرمەنی بە سەرۆکایەتی سەرهەنگ گیگز لە گەڵ چەکداری کەڵهور و هێندی چەکداری وەلەدبێگی و جوانرۆ بۆ سەر کوتکردنی سەردار رەشید بەرەو رەوانسەر دەکەوێتە رێ. دوای چەند رۆژ شەر و پێکدادان سەردار رەشید خۆ راناگرێ و ئاوای دیوی کوردستانی عیراق دەبێت. پاش ماوەیەک ئەمان وەر دەگرێ و دەگەرێتەوە کرماشان، لەوێ دەیگرن و دەینێرنە تاران و لە ژێر چاو دێریدا دەبێت. دوای ساڵێک رادەکا دێتەوە رەوانسەر و دیسان لە دەوڵەت هەڵدەگەرێتەوە. ئەمجارەش لەشکر دەچێتە سەری و دیسان دەشکێ و رادەکات دەچێتە ماڵی شێخ حسام الدین، ئەویش تکای بۆ دەکات و رەزا شا عافوی دەکا. دەیبەنە تاران و تا روخانی حکومەتی رەزا شا(١٩٤١) لە تاران لە حەپسێدا دەبێ. ساڵی ١٣٠٦ی هەتاوی مەحمود

**خانی دزلّی** و **مەحمود خانی کانی سانان** لە دەوڵەت هەڵدەگەڕێنەوە.
ساڵی ١٣١٠ ی هەتاوی هەورامیەکان بە سەرۆکایەتی کورانی جافر سان کەڵەوە کێشی دەکەن و دوای شەڕێکی زۆر دەشکێن و دەچنە دیوی کوردستانی عیراق.
حکومەتی **ڕەزا شا** ٤٠ کەس لە خان و سەرۆک و کوێخاو کەڵە پیاوانی هەورامان و لهون و مەریوان و جوانرۆیی و قوبادی و بابا جانی و خانەکانی ڕەزاو دەگرێ و لە سەرمایەکی سەختی زستاندا، دەیانبەنە تاران و لە وێشەوە دووریان دەخەنە وە بۆ سمنان و دامغان و ئیسفەهان. (٧)
ساڵی ١٣١١ی هەتاوی جوانرۆییەکان بە سەرۆکایەتی **سۆفی بەگ** و **ئەفراسیاو بەگ** لە دەوڵەت **هەڵگەڕانەوە**. دوای چەند مانگ شەر و گەمارۆ دانیان لە چیای بەمۆ، ناچار دەشکێن و دەچنە دیوی کوردستانی عیراق.
**حوسێنی فردوست** لە بیرەوەریەکانی خۆیدا دەنووسێ:« لە ڕەوەندی سەرکوتکردنی کوردستاندا **ئەمیر ئەحمەدی** بە ناوی ئەمیر لەشکری هێزەکانی ڕۆژ ئاوا ناوبانگی دەر کرد. ئاو پراو دوای چەند ساڵ شەر توانی هێندێ لە سەرۆکە کوردەکان فریو بدات. سەرۆکە کوردەکان داوایان لە **ئەمیر ئەحمەدی** کرد کە **ڕەزاخان** لە پشتی قورعان بۆیان بنووسێ کە خۆیان تیناگەیەنێت. ڕاپەرینی کوردەکان پاش چوار ساڵ شەر کۆتایی هات و **ئەمیر ئەحمەدی** وەک سەر کەوتووی ڕۆژ ئاوا گەڕاوە بۆ تاران و **ڕەزا شا** کردی بە سوپەهبود. **ئەمیر ئەحمەدی** ئەوەندەی زێر و جەواهێر لە کوردستان کۆ کرد بۆوە کە توانی بەو پارەیە لە تاران ٥٠٠ خانووی پێ بکڕێ.» (٨)
دوای کودیتای ڕەشی **ڕەزاخان** ئێران بە کردەوە کرا بە زیندان و **قەسابخانەی** گەلانی غەیرە فارس. بە بیانووی چەک داماڵینی گشتی و نەهێشتنی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی و بە مەبەستی کۆ کردنەوەی دەسەڵاتی تەواو لە دەست حکومەتی ناوەندی عەجەمدا ڕاپەڕین و سەرهەڵدانی عێل و عەشیرەتەکانی سەرکوتکرد.
**ڕەزا خان** دەیویست تەواوی دەسەڵات و قودرەت لە ناوەند و لە ژێر دەستی ئەو

دا کۆ بێتەوە. بەرهەمی ڕەنج و کوێرەوەری خەڵکی ناوچەکانی تر، بۆ تاران بەرن و تارانی پێ بڕازێننەوە.

ساڵی ١٩٢٣ ڕەزا خان لەشکری ناردە سەر لورستان و پاش سەر کوتکردنی ڕاپەڕینی لورەکان بە شێکی زۆری بە خاو وخێزانەوە بۆ ناوچەی خوراسان گواستنەوە. « بەم وەزعە شەری نێوان ڕێژیمی تازەی تاران و لورەکان چاوە ڕوان دەکرا. چونکە ئەو قەومە ئەزمونی تاڵی زۆر درێژی قاجاری هێشتا لە بیر نە چوو بۆوە. لەوەی دەترسان جارێکی تر گرفتاری زوڵم و ستەم ببنەوە. لە بەر ئەوە لە بەرانبەر ڕێژیمی پەهلەویدا بەر بەرەکانیان نیشاندا. دەوڵەتی ناوەندی لەشکری ناردنە سەر. لە نێوان لور و لەشکری دەوڵەتیدا شەری گەورە قەومان و خەڵکێکی زۆر کوژران. حکومەتی ناوەندی دوای چەند ساڵ عەمەلیاتی نیزامی ئاخرەکەی بە سەر ناوچەکانی لور نشیندا زاڵ بوو ، شەر کۆتایی پێهات. سەقامگرتویی حکومەتی ناوەندی هەر چەندە لە درێژ خایەندا بوو بە هۆی هێندێ تێکۆشانی ئاوەداتی ئەم ناوچەیە، بەڵام بە چەشنی گشتی ئەم وڵاتە لە مێژووی درێژی خۆیدا، بۆ هەوەڵین جار دەسەڵاتی سیاسی خۆی لە کیس چوو. لەو دەمەوە بڕیاری گرنگی پێوەندی دار بە ژیانی ئەو قەومە لە تاران و بە بێ بەشداری ئەوان دەگیرا.» (٩)

گۆڤاری (خواندنیها)چاپی تاران لە یەکێ لە ژمارەکانی خۆیدا، لە باسی ڕاپەڕینی لورەکاندا نووسیبوی :» سەر لەشکر ئەمیر ئەحمەد ئاغا خان کرا بە مەعموری کوشت و بڕی لورەکان. پاش شکانی ڕاپەڕینەکە، ٤٠٠ کەسی لە سەرۆک و ڕیش سپی لورستانی گرت. بە ڕێزی ڕادەگرتن و ئەمری دەکرد بە شیر لە سەریان دەدان. پاشان پۆلوی سووری ئاگری لە سەر برینەکان دادەنا و لە گەڵ ئەفسەرەکان گرێوی دەکرد کە بزانن کامیان پتر هەڵدە بەزنەوە . (١٠)

ساڵی ١٩٢٧ لە لورستان جارێکی دیکەش سەر هەڵدان ڕابوو. داخوازیان ئەوە بوو کە حکومەتی نیزامی هەڵبگیرێ. سەر بە خۆیی عەشیرەتەکان بە ڕەسمی

بناسرێ. واز لە چەک داماڵینی گشتی بهێنرێ. باج و ماڵیات کەم بکرێتەوە. قانونی سەر باز گیری هەڵوەشێتەوە و تەنانەت لە پۆشینی جل و بەرگی خۆیاندا ئازاد بن. رەزا شا بۆ سەرکوتکردنی راپەرینی لورستان فرۆکە و لەشکرێکی زۆری نارد. ئاخرەکەی ناکۆکی نێوان عەشیرەتەکان بوو بە هۆی شکانی راپەرینەکە و سەر کوتکرا. (۱۱)

ساڵی ۱۳۲۹ حکومەتی تاران ویستی عەشیرەتی جوانرۆ چەک بکات. بەڵام ئەوان ملیان بۆ فەرمانی حکومەت رانەگێشا. لە ۱۰ی خەرمانانی ۱۳۲۹ پادگانی (ملە پڵنگان)یان پەلامار دا و زیانێکی زۆریان بە ئەرتەشی ئێران گەیاند. لە تارانەوە لەشکرێکیان بە ۵۰ تانگ و چوار فرۆکەوە بە هاواری لەشکری کرماشانەوە نارد و قەڵای جوانرۆیان بۆمباران کرد. گۆڤاری تەرەقی دەورەی هەشتەم، ژمارە۱۵ نووسیبووی:« دەوڵەتی عیراق و تورکیا بە تەواوی وریای راپەرینی کوردەکان و عەمەلیاتی نیزامی ئێران بوون و فەرمانی پێویستیان دابوو بە سنور دارەکانی خۆیان نەوەکوو ئەو سەر بزێویە بگاتە نێو سنورەکانی ئەوانیش کە کوردی تێدا دەژین.»

سەید معزالدینی مەهدەوی مودیری گشتی فەرهەنگی کرماشان لەم بارەوە دەنووسێ:« کاتێ لە گەڵ فەرمانداری پاوە دەچووم سەردانی فەرهەنگی شارستان، گەیشتینە ناوچەی عێلی جوانرۆ. باسی رەشیدی و ئازایەتی ئەوان کرا کە گۆیا لە تەواوی عێل و عەشیرەتی کورد ئازاترن کە ماوەیەک پێشتر یاخی ببوون. فەرماندار گوتی : ئەوان یاخی نە ببوون، بەڵکو بە یاخیان ناساندن» (۱۲)

کوردە جەلالیەکانیش لە ناوچەی ماکۆ و ئارارات کەوتنە بەر پەلاماری دڕندانەی حکومەتی تاران و تەلاچۆ کران.« ساڵی ۱۳۱۹ دوازدە هەزار و نۆ سەت کەس ژن و مێر و منداڵ، ۴۵۰۰۰ سەر مەر و بزن. ۴۰۰۰ رەشە وڵاغ، ۲۰۰۰ ئەسپ و ماین و ۱۵۰ وشتری عێلی جەلالی بۆ ناوچەی خورەماباد و سوڵتاناباد ئەراک دوور خرانەوە. دوای رووخانی حکومەتی رەزا شا، تەنیا ۷۰ کەسیان بە

مەرو ماڵاتێکی کەمەوە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.» (١٣)

ڕاپەڕینی عەشیرەتی سویسنی و ئالانی ناوچەی سەر دەشت هەر چەندە نە نووسراوە و هیچ یەک لە نووسەرانی کورد خۆیان پێوە ماندوو نەکردوە، بەڵام زۆر لە پیرە پیاوانی ئەو مەڵبەندە لەبیریانە و بە تاسەوە باسی دەکەن. بۆ ئاگاداری زیاتر لە ڕەوەندی ئەم ڕووداوە مێژوییە ١٩٩٤/٦/١٨ لە گەڵ کاک **سەعید کوێستانی** چوومە شاری کارلستادی سوید خزمەت بە ڕێز **قازی عەلی مەرەغانی** کە وا ئاوارەی دەستی حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانە و بە خاو خێزانەوە لە تەمەنی ٩٧ ساڵیدا ڕایکردوە و لە سوید گیرساوەتەوە. **قازی عەلی** لەو پیاوە شاز و ژیر و **قسە** خۆش و ئازاکانی ولاتی ئێمەیە. لەسەر ئەو تەمەنەوە هەر چەند نەخۆشیش بوو، بەڵام وریا و لەسەر خۆ و ئەگەر سیغار لێگەڕا بایە نیعمەت بوو لە خزمەتی دانیشی و لە فەرمایشتەکانی چێژ وەر بگری. بەڵام سیغار هیلاکی دەکرد و مرۆڤ دڵی نەدەهات ماندووی بکات. من پێشتر بە خزمەتی گەیشتبووم و کاتێ لە ئالان بووم، دوو جار هاتبوە سەر دانم و خۆشمان لێک دەهات. کە وەژوور کەوتم کتێبی **عایشەی** لە پێش بوو تەماشای دەکرد. بەر لە هەموو شت گوتم: «ئەوە لەو تەمەنەدا خەریکی **عایشەی**؟». بە گورجی و ژیری گوتی :«**عایشەی دوای پێغەمبەری**» وەڵامەکەی ئەوەندە بە جێ و وریایانە بوو، هیوام لێ پەیدا بوو کە بتوانم لە سەر ڕاپەڕینی **ئۆمەر پاشا** پرسیاری لێ بکەم.

کاتی لە سەر کۆماری کوردستان پرسیارم کرد، فەرمووی :«ئاخر ئێمەش لە نێو خۆماندا تۆزە ڕاپەڕینێکمان هەبوو. من بۆ خۆم لە گەڵ بووم. فەقێ بووم لە بێژوێ لە خزمەت ماموستا **مەلا ساڵحی** دەمخوێند. ڕاپەڕینەکە بە ناوی **ئۆمەر پاشا** بوو، وەئیلا بزووتنەوەکە و ڕاپەڕینەکە و جوڵانەوەکە ماموستا **مەلا ساڵحی** بێژوێ ڕێبەرایەتی دەکرد. عەینی ڕاپەڕین و نەخشەو تەشکیلات ماموستا **مەلا ساڵح** بوو. لە پێش ڕاپەڕینەکەدا ماموستا مەلا ساڵح چەند نەفەر

له ئاغاکانی کۆ کردەوە. ئەغاکانی ئالانی دوو دەستە بوون. دەستەیەکیان هەر ئالانین و بومین، دەستەیەکیان پژدەرین. پژدەریەکانیش تایفەی سەلیماغان. یانی تایفەی **بابەگری سەلیماغای**. چەند نەفەریشیان کەمن لە تایفەی رەشیدئاغانە. **قانی شاعیر** لە تایفەی رەشیداغایە. **قانی** پژدەریە و **مامەندی قایمقامی** پێ دەڵێن. دوای کۆماری مەهاباد **مامەندی قایمقام** پەیدا بوو، لە گا کرینێ دەگەرا. دوو شەو لە ماڵی ئێمە مایەوە. کورە ئامۆزایەکەم هەبوو بە ناوی فەقێ عەلی. شەوێکیان گوتی: فەقێ عەلی دا قەڵەمێکم بۆ بێنە. ئەو دەم هەر قەڵەمە دارەکان هەبوون. هێنای قەفەسێکی دروست کرد لە سەر پەرە کاغەزێک و لە نێو قەفەسەکەدا بلبلێکی دروست کرد لە سەرەوەی قەفەسەکە ئەم سەر دێرەی نووسی : (**بلبل لە ناو گۆشەی قەفەس**) دوایە ئەم شیعرەی نووسی:

**«لەناو گۆشەی لەفەس بلبل دوێنێ - ئەمەی فەرموو بە شێوەی دڵرفێنێ»**

**«لە پر گیرام و ئازادیم لە دەست چوو - ئەما بۆ رێی فراریشم کەلینێ»**

**«وەکو زەهری هەلاهیل وایە شیرێ - کە دەستی موددەعی تێیکا هەوێنێ »**

**«بە قەولی موددەعی هەر کەس بەقا کا - وەکوو من تۆوی بەد بەختی دەچێنێ»**

گوتم لام وایە ئەم شیعرە لە دیوانەکەیدا نیە. فەرمووی ئەگەر نەبێ دەستکاری کراوە.

پرسیم باشە ! **ماموستا مەلا ساڵح و ئۆمەر حەمە سور چی‌یان دەویست؟**

- «عەرزت دەکەم وڵاتی سەردەشتێ چوارتایفە تەشکیلی دەدا. تایفێکیان پێیان دەڵێن برياجی. تەقریبەن لە حدودی هەزار ماڵدان. هەمیشە رەئیسیان بوە

لە قەدیمەوە. دووەمیان تایفەی مەلکارین. ئەوانیش ..٧-..٨ ماڵ دەبن. قیسمەتێکیشیان پێیان دەڵێن کۆڵە سە، باسکی کۆڵە سە. ئەویش پێیان دەڵێن سمایلە کوێری. قیسمەتێکیشیان پێیان دەڵێن ئالان ، باپیرئاغایی. لەو کاتەدا بوو دوو نەفەر لە ورمێ مونتەقیل بوون بۆ سەردەشتێ. یەکیان فەرماندەی ژاندارمە بوو، یەکیشیان فەرماندەی هەنگی سەربازی. کوێخاو رەئیسەکانیان کۆ کردەوە و بە سەراحەت پێیان گوتن کە ئێمە لە مەهاباد بەم لاوە کە دەگەینە جەماڵە ددین، لە جەماڵەددین بەم دیوە دا تا پردی هەرزنە لە تارانێ کە هاتووین بۆ ئێرە بە ئیجارەمان گرتوەو دەبێ کۆمەگمان بکەن کە هەم بتوانین ئیجارەکە بدەین و هەم نەفعێکیش بکەین. دەستیان کرد بە راو ورووت. لە مازووش باجیان دەستاند. قسەکە بڵاو بۆوە . مەحمودی ساڵحاغا هەبوو لە بێژوێ. ماموستا مەلا ساڵح مەحمودی بانگ کرد و گوتی : سواری بارگینە شرەی خۆ بە و بچو بۆ قەڵە رەشێ بە ئۆمەر حەمە سوری بڵێ، بێتە ئێرە.

دیارە پیاوی لە ئۆمەر حەمە سور دمراستتر و ئاقڵتر هەبوون، وەلی ئۆمەر حەمە سور لە دایکەوە دایک برای هەباسی مەحمود ئاغای بوو. ئەو ئیمتیازەی هەبوو. بە وەسیلەی ئەو پیاو دەیتوانی لە پژدەریەکان خصوصا لە تایفەی هەباسی مەحمودئاغای ئیستفادە بکا. کورد چەکو تفەنگی نەبوو، هیچی نە بوو، نانیشی نەبوو. بەڵێ چوو ئۆمەر حەمە سوری هێنا. سێ چوار شەو لە بێژوێ مایەوە. پژدەریەکان نا، وەلێ باپیراغاییەکان لە جەلەسەدا شیرکەتیان هەبوو. کوێخاو ریش سپی کۆ ببوونەوە. نەقشەکەیان هێنا سەر ئەوە کە لە جەماڵەددینەوە تا دێتە هەرزنە نابێ ژاندارمی لێ بێت. ئەو جار کە نەخشەکە خاتیمەی هات ئەو پاسگایانەی لە سەر دەشتێ دوور بوون ، چەکیان کردن. عەجەم دەستیان نە دەکردەوە. زوو تفەنگە کانیان دەدانێ و هەڵدەهاتن بۆ سەر دەشتێ. ٧. - ٨. نەفەر چەک کران و تفەنگەکانیان وە چنگ کوردان کەوت. لە پاشان دەوری سەر دەشتیان دا. قەڵە رەشەیان کرد بە مەرکەز.

ئارتەش تەقریبەن ۷.. تەفەرێک لە سابلاخەوە دێن بۆ سەر دەشتیٚ، لە گاولانیٚ پێشیان پێگرتن، کوردەکان هێزێکیان نەبوو، وردە وردە هاتنە پێش تا گەیشتنە رەبەتیٚ. لە رەبەتیٚ ئیتر رێگایان نەدان بێنە پێشتر. کوردەکان هێزێکی باشیان پەیدا کرد. ئەو قیسمەتەی لە سەر دەشتیٚ بوو محاصرە کرا. ئەوەی لە رەبەتێش بوو دەوری درا. ئەو جار سەر لەشکر ئامانولاخان کە لە تایفەی ئەردەلان و خەڵکی رەوانسەر و لە تایفەی سەردار رەشیدە، رێگایاندا بە سواری هاتە سەردەشت. ١٦-١٥ رۆژ لە سەر دەشت مایەوە. پرسی چیتان دەویٚ و چ ئیدیعایەکتان هەیە بیڵێن. داوای کوردە کان ئەوانە بوون : هەوەڵیان ئەوەیە لە کەڵەکاویٚ تا هەرزنە، نابیٚ ژاندارمی بێتیٚ. لیباس گۆرین قەبوڵ نیە. سەر باز گرتن قەبوڵ نیە. ماڵیات دەبیٚ کەم بکرێتەوە. ئەو میللەتە هیچی نیە. ئەم ولاتە جەنگەڵە و فەقیرن. دوو مانگ هەر مذاکرە بوو. ئەو ئەرتەشەی لە مەهابادەوە هاتبوو لە رەبەتیٚ مایەوە و ئەوەی سەردەشتێش هەر لە محاصرە دابوو. کوردەکانیش لە دەور وبەری سەردەشتیٚ لە دێیەکان دامەزران. لە واوان و لە قەلە رەشە و لە مارەغان ولە بێژویٚ و لە وەردیٚ و لە بنو خەڵێف و مەلا شێخ و لەوانە دامەزران. جێگای وابوو ۱. کەسی لێبو، هی وابو ۲. کەسی لێبوو، هی وا بوو پێنج کەسی لیٚ بوو. حاسڵەکەی هاتنە سەر ئەوە کە حکومەتی سەر دەشتیٚ لە کەڵەکاویٚ بۆ هەرزنەی تەنیا نیزامی بن و ژاندارم تەیەن. یەک نەفەر بە نێوی سەرهەنگ پزشکیان کە پێشتر لە سەر دەشتیٚ ژنی هێنا بوو بیێتە فەرماندەی نیزامی. پەیمانەکە وا بەسترا کە تا حەوت ساڵ سەر باز گرتن نەبیٚ، ژاندارم نەبیٚ، لیباس گۆرین نەبیٚ، مازاد نەبیٚ. بەلام فێر بیوون بەعزە کوێخایەکیان بۆ خواردن کرد بوە هاو دەستی خۆ، بە وەسیلەی ئەوانەوە خەڵکەکەیان دە روتاندەوە. ئەو حەوت ساڵەیان بردە سەر و پاشان دەستیان کردەوە بە راو وروت. ئەو جار ئومەر پاشا راپەری. هەموو پایگاکانیان لە دێهات کۆ کردەوەو چەکیان کردن، تەقریبەن ساڵ و نیوێکی بردە سەر. لە گردە سووری بورجێکیان دروست کرد بوو،

موسەیتەر بوو بە سەر ناوچەکەدا تا گرتیان ١٢ کەس کوژران. شەر قایم بوو. مەنگور هاتنە یارمەتی عەجەمان. **عەولای فەتاحی مەنگوریان** لەو بەری چۆمی کوشت. ئەفسەرێکیان دەگەڵ بوو بە ناوی سەید **عەلیخان**. کوێخایەکی هەبوو بە ناو **عەولاً قات، سەید عەلیخانی** کوشت و دەمانچەی لێکردەوە.»

جەنابی **قازی** نەخۆش و هیلاک بوو، نەکرا پتر ماندووی بکەم. لێرەدا چ‌قەیدی نیەکە قسەیەکی خۆشی کوێخا ئۆمەریش بنووسینەوە.: دەڵێن عەجەمان ئەفسەرێکی لە گەڵ دیلمانجێک بۆ وتو وێژ دەنێرنە کن ئۆمەر پاشا. کە دەگەنە گوندی قەلە رەشە کوێخا ئۆمەر لەسەربانی دەبیٚ. بە کابرای ئەفسەردەڵیٚ: لەچی دەگەرێن؟ قسەی خۆتان بکەن. کابرا دەست بەقسان دەکاو دیلمانجیش بۆی دەگێرێتەوە. قسەکان بە کەیفی کوێخا ئۆمەر نابن. لەوەلایمی کابرادا دەڵیٚ:«نازانم لێرەڕا خۆت پێدادەم یا بۆت بێمە خواری؟!!

نووسەری بە ناوبانگ ماموستا **حەسەنی قزلجی** شەهید لە **پێکەنینی گەدا** دا باسی راپەرینی **ئۆمەر حەمە سور** دەکاو دەڵیٚ:

« **کوێخا ئۆمەر** لە گوندی قەلە رەشە عێل و عەشیرەتی خۆی کۆ کردەوەو ژاندارمی ئەونێوەی چەک کرد و دەیگوت: « عەجەم نابیٚ لە چۆمی کەڵوێ وەپەڕیٚ. **کوێخا ئۆمەر** ویستوویەتی ژاندارم نە چێتە بەری سوێسنیان. سوێسنی سەر بازیان لیٚ نەگیریٚ. ماڵیاتیان لیٚ زیاد نەکریٚ. چەکیان لیٚ نەستێندرێتەوە. لە پۆشینی جل و بەرگی کوردی ئازاد بن. حکومەتی عەجەم ئەم داخوازیە پچوکە و بە لام گرنگەی نەسەلماندوە. کوردەکان لەشکریان کردۆتە سەر عەجەم وشکاون. **حەیدەر عەلیخان** فەرماندەی بەشی شەستتیری لەشکر کوژراوە. خەڵک لە ژمارەی سەر بازە کوژراوەکان کەوتنە خۆ. یەک دەیگوت سەت سەر باز کوژراوە. یەکێک دەیگوت دوو سەتیان کوژراوە. هی وابوو دەیگوت ..٥ کوژراوە. هێندێکیش دەیانگوت : « قەلاچۆیان تێخراوە و چۆلەکە کوژیان نەماوە.» (١٤)

دەبێ هەر ئەو ڕاپەڕینە بێ کە حەسەن ئەرفەع سەرۆکی پێشووی ستادی ئەرتەشی ئێران باسی دەکا و بەڵام ناوی ناهێنێ و دەنووسێ:« لە ناوچەکانی خوارووی کوردستان کوردەکان دژی حکومەتی ناوەندی ڕاپەڕین. سەردار ڕەشید لە ناوچەی ڕەوانسەر هێزەکانی دەوڵەتی چەک کرد. پاشان عەشیرەتی هەورامان و مەریوان بە سەرۆکایەتی مەحمود خانی کانی سانان و مەحمود خانی دزڵی و جافر سانی هەورامی ڕاپەڕین. بە دوای ئەودا لە بانەو سەقز و سەر دەشت و گەورک و سوێسنی و پژدەری و مەلکاوی. کوردەکان ڕاپەڕین و هێزەکانی دەوڵەتیان چەک کرد. ڕاپەڕیوەکان شاری سەردەشتیان گرت و ئیدارەکانی دەوڵەتیان سوتاند.» (١٥)

ئاخرین سەرهەڵدانی کوردەکان لە ڕۆژ هەڵاتی کوردستان، ڕاپەڕینی مەلا خەلیلی گۆر ئۆمەری بوو لە ناوچەی مەنگوڕان. لێرەدا دەمەوێ تۆزێ لە مەتڵب لادەم. لە سەفەری بولغاریا دا پێش نوسینی ئەم باسە دەرفەتم بۆ هەڵکەوت کە کتێبەکانی زانای بە ڕێز ماموستا مەسعود محەمەدی لە سەر حاجی قادر بخوێنمەوە . جگەلە شیرینی و ڕەوانی و پاراوی زمان و تەحلیل و لێکدانەوەی وردی زانستی و شیکردنەوەی هەموو کەلێن و قوژبنی پێوەندیدار بە حاجی قادرەوە و جگە لە وەر گرتنی چێژی مەعنەوی و ڕوحی لە نووسینەدا غیرەتیان وەبەر نام. خۆ نامەوێ بڵێم قەڵەمەکەم دەتوانێ یەک لە سەتی نوکی قەڵەمی ئەو بێنێتە سەر کاغەز، بەڵام دەتوانم بە ڕاشکاوی بێژم لە نووسینی زۆر شت دا وە غیرەتی خستم. لە باسی ڕاپەڕینی ماموستا مەلا خەلیلی گۆر ئومەریدا دە توانم زۆر بە ڕاشکاوی بڵێم لە نێو سیاسیەکانی کوردستانی لای ئێمەدا پێش من کەس لە سەر ڕاپەڕینی مەلا خەلیلی نەنوسیوە. نەک هەر ئەوە بەڵکو کاتێ لە نامیلکەیەکدا بە کورتی لەسەر ڕاپەڕینی مەلا خەلیل نوسیبووم سیاسیەکانی هاوکاری ئەو دەمی لێم وەدەنگ هاتبوون و دەیانگوت: ڕاپەڕینی مەلا خەلیل باری نەتەوەیی و نیشتمانی نەبوە و تەنانەت پەلاماریشیان دەدا. ئێستا دەبینم

هەر ئەوانە لە نوسراوەی خۆیاندا باسی راپەرینی **مەلا خەلیل** دەکەن بێ ئەوەی ئاماژە بۆ نوسراوەکەی من بکەن. حکومەتی رەزاشا بە لاسا کردنەوە لە مستەفا کەمالی تورک، ساڵی ١٩٢٨ پۆشینی جل و بەرگی نەتەوایەتی کوردی قەدەغە کرد و خەڵکیان مەجبور دەکرد کە دوولنگ دەپێ کەن و کلاوی فەرەنگی لە سەر بنێن. ژاندارم و ئاژان نێفەکی‌سەدان کورد و شاقەلی مەلایانیان بری. لە سابلاخ دژی ئەم فەرمان و یاسایە خۆ پێشاندان ساز بوو. خەڵکێکی زۆر لە سەر ئەو مەسەلەیە گیران. مەسەلەی لە سەر نانی شەبکەو قەدەغە کردنی لیباسی کوردی بوو بە جێگای باس و دمە تەقەی مەلاکانی ناوچەی موکریان. **مەلا خەلیل** کە زانایەکی بە ناو بانگ و خاوەن رێز و پرستیژ بوو، دژی پۆشینی جل و بەرگ و کلاوی فەرەنگی فتوای دا و داوای لە مەلاکان و لە خەڵک کرد کە دژی بوەستن.

**مەلا خەلیل** دەیزانی کە نە هێشتنی جل و بەرگی کوردی کوێر کردنەوەی شوێنەواری نەتەوەییە و بۆتە بیانوو بۆ رووتاندنەوەی خەڵک و سوکایەتی پێکردن. بە لە بەر چاو گرتنی هەل و مەرجی ئەو دەمی کوردستان و نەخوێندەواری و دوا کەوتوویی و نزمی هەستی نەتەوایەتی، نەیدە توانی بە ناوی راپەرینی میللی و کوردایەتی خەڵک دەنگ بدات. باری ئایینی هێنا گۆرێ و لە سەر نانی شەبکەی فەرەنگی بە کوفر دانا و یەکەم مەلای کورد بوو کە بۆ پێشکەوتنی مەبەستی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی کەلکی لە ئاین وەر گرت. خۆ ئەگەر ئەو هەموو زاناوباش مەلایانەی کورد کە وا بە زانای مەزنی ئیسلام ناویان هاتوە و لە ژێر رکێفی ئایینی ئیسلامدا نەتەوەی خۆیان فەرامۆش کردوە و گەورەترین خزمەتیان بە کولتوری بێگانە کردوە و بێگانەش قەت حیسابی هیچی بۆ نەکردوون، جارێک بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی و رزگاری میللەتەکەیان لە ژێر دەستی لە ئایینی ئیسلام کەلکیان وەر گرتبایە، ئێستا کاروانی پێشکەوتنی نەتەوەی ئێمە لە قۆناخێکی دیکەدا دەبوو. **مامۆستا مەلا خەلیل** داوای لە مەلاکانی ناوچەی موکریان و عەشیرەتەکان کرد کە پشتی بگرن و دژی فەرمانی

حکومەتی **رەزاشا** سەر پێچی بکەن و راپەرن. هەر چەند زۆر لە مەلاکان لە گەڵ فتوای **مەلا خەلیلی** هاو دەنگ بوون، بەڵام بە گوێرەی عادەت و خەسڵەتی خۆ پارێزی مەلایانە و فێر بوونی مل راکێشان بۆ زوڵم و زۆری و شوکرانە بژێری بە قەزاو قەدەر، جگە لە **حاجی بایزاغای** ئێلخانیزادە کەس بە دەنگی ماموستا **مەلا خەلیلەوە** نەچوو. نەک هەر ئەوە بەڵکو سەرۆک عەشیرەتەکانی دێبۆکری و مامەش بە فەرمانی حکومەت لەشکریان گردە سەر و راپەرینی مەلا خەلیل سەرکوت کرا.

با بزانین کاک **برایم ئەحمەدی** لە تامیلکەیەکدا بە ناوی ( **قیام ملا خلیل** و رد فرمان **رضاخان**) لە زمانی **میرزا کەریم** ناوێک کە دیارە عەجەم و خەڵکی لای شوشەوانێ بوە و خوێندەواری نێو مەنگوران بوە و لە نێو رووداوەکەدا ژیاوە باسی راپەرینی **مەلا خەلیل** مان چۆن بۆ دەگێڕێتەوە.

«... **مەلا خەلیل** زاناو مودەریسی زانستی قەدیم بوە. بە پشتیوانی عەشیرەتی مەنگور و خەڵکی دەور وبەر لە بەرانبەر قانونی گۆڕینی لیباس کە رەزا شا دایهێنا بوو، راوەستا، لە سەرەتاوە سەرۆک عەشیرەتەکانی مەنگور و چەند کەس لە گەورە پیاوانی مەهاباد بە ئاشکراو نهێنی پشتیوانیان لە مەلا خەلیل دەکرد و دژی گۆڕینی لیباس و کڵاوی پەهلەوی (شەبکە) بوون. **مەلا خەلیل** ئەو قانونەی بە دژی ئیسلام دەزانی و هەر لەو کاتەشدا پێی وابوو بەرنامەیەکی چەپەڵ و خائینانەیە بۆ نەهێشتن و فەوتاندنی داب و نەریت و شوێنەواری نەتەوەیی کورد دانراوە.

عەشیرەتی مەنگور لە دەوری **مەلا خەلیلی** کۆ بوونەوە و بە گشتی راپەرینی چەکدارانەیان دەست پێکرد. هەر کەس لە ماڵە خۆی هەر چی هەیبوو لە تفەنگ و فیشەک و خەنجەر و تاپڕ و... دەستی دایەو نان و خواردەمەنیان لە تورەکە و هەنبانان ئاخنی و لە ماڵی **مەلا خەلیل** کۆ بوونەوە. سەرۆکی مەنگوران سوێندیان دەخوارد و پشتیوانی و گوێ رایەڵی خۆیان بۆ رێبەری

نایینی رادەگەیاند. گەورکی سەردەشت و نەڵێنی فەقێ یسیان و عەلیاغای سوناسینشیان لە گەڵ خۆ کردە یەک و پاش سوێند و بەڵێنی بەرەو گوندی ئافان کەوتنە رێ. عەلیخانی نەوزەری کە دەگەڵ عەجەمان بوو، ویستیان دەپێشدا خەڵقانی گوندی ئەو تالاَن بکەن. نامەیەکیان لە بارەی خەیانەتی عەلیخانی نووسی و مەلا رەحمانی موتاتی بە گونداندا دەگەرا و بە فارسی نامەکەی بۆ خەڵکی دەخوێندەوە و پاشان بۆ دەکردن بە کوردی. لە گوێچکەدەرێ سیمی تەلیفونیان هەڵبری و تەلیفونچیان گرت. ئەفسەرێک و هێندێ قازاخ لە سابلاُخەوە دێن تا بچن یارمەتی عەلیخانی بدەن. لە دۆڵی ئامێدێ توشی لەشکری مەنگوران دێن و خۆ ناگرن. ١٥ کەسیان لێ بە دیل دەگرن و ئەوانی دیکەش رادەکەن. مەنگور دەگەنە لاچین و قازیاوا و دەورو بەری سابلاُخێ. شەر بە توندی دەست پێدەکات. عەشیرەتی دێبۆکری و مامەش لە گەڵ لەشکری عەجەم دژی مەنگوران دەکەونە شەر سەرماو رێبەندانی سەخت و تۆپ بارانی دەوڵەتی مەنگوران شپرزە دەکاو دەکشێنەوە. لەو کاتەدا سەر لەشکر خزاعی بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەی شەر دێتە سابلاُخ راپۆرتێک بۆ رەزاشا دەنێری ودەڵێ : زانایانی سوننی سەبارەت بە گۆرینی لیباس حوکمی خەزایان داوەو گۆرینی لیباس بە کوفر دەزانن. عێلاتی سنور راپەریون و شەریان دەست پێکردوە. ئەگەر دەتەوێ ولاَت ئارام و میللەت ئاسودە بێت، لە گۆرینی لیباس و یەک شکڵی واز بێنە.» رەزا شا عەلی بەگی حەیدەری نوێنەری سابلاُخ لە مەجلیس بانگ دەکا و بە توورەیی پێی دەڵێ: تۆ کە نوێنەری کوردانی، ئەگەر کورد نایانەوێ لیباس بگۆرن و زانایانی کورد بە کوفری دەزانن بۆ چی ئەت گوتوە ؟

عەلی بەگ لە ترسان دەڵێ : قوربان ئەم راپۆرتە درۆیە . کوردەکان گوێ رایەڵی یاسای حکومەتن و نیشتمان پەروەر و سنووردار و موسلمانی بە راستین. ئەم هەرایە لە بەر زوڵم و زۆری مەعموری بەرتیل خۆر ساز بوە. ئەگەر ئیجازە بدەی دەچمە نێو عەشایر و زانایانی کورد تا پێچەوانەی راپۆرتی سەر لەشکر

خزلعی روون بیتەوە.. عەلی بەگ دێتە سابلاغ هێندێ زانا و سەرۆک عەشیرەتان فریو دەدا و تیلگرافێک بۆ تاران دەنێرن کە هەلگیرسانی شەر خەتای زوڵم و دەست درێژی مەئموران بوە. لەو لاشەوە قەرەنیاغای مامەش و عەلیاغای ئەمیر ئەسعەد لە گەلْ خۆی دەباتە گوندی سەلیم ساغلوێ مالّی خدری کا عەیزی و لەوێ مام بایزی دلْخۆشی دەدەنەوە و فریوی دەدەن و دەلّێن بەو سەرما و سۆلە شەر ناکرێ و بەهارێ ئێمەش رەگەلْتان دەکەوین. مام بایزی دەخاپێنن و دەیبەنە سابلاغ. سەر لەشکر رێزی لێ دەگرێ و دەینێرێتەوە ئەوانی دیکەش ئیقناع بکات. چەکداری مەنگور وردە وردە دەچنەوە گوندەکانی خۆیان و چەکداری عەشیرەتی مامەش و دێبۆکری و بە زاراوەی ئێستا جاشەکان جێگای مەنگوران دەگرنەوە و جێگیر دەبن. مانگی رەشەمەی سالی ۱۳۰۷ - ۱۹۲۹ سەر لەشکر خزاعی لە رێگای سەرۆک عەشیرەتی مامەش و دێبۆکری بە مام بایز رادەگەیەنێ کە مەنگور هەموو عافو کراون و ئەگەر لە مەو بە دواوە یەک لە مەنگوران هەرا ساز بکا، تەمبێ دەکرێ.

ئەم قسانە لە نێو مەنگوران بە هیچ دەچن. لە نێوان مەنگور و قاسدی دێبۆکریانیشدا وتو وێژ بەر دەوام دەبێ. لەو کاتەدا سەرتیپ موقەددەم دێتە سابلاغ. هەمزاغا و حەسەناغای مەنگورلە تەوریز حەپس دەبن دەیانهێنێتەوە ئازادیان دەکا تا لەم رێگایەوە مەنگوران دلْخۆشی بداتەوە. لە بەهاری سالی ۱۳۰۸ فرۆگەی ئێران ئاگاداری بە سەر ناوچەی مەنگوراندا بلاْو دەکەنەوە و لە ئاگاداریەکەدا دەگوتری:« لەمە زیاتر بار و دۆخی شپرزەی نێو مەنگوران قەبولْ ناکرێ . مام بایزی سەرۆکی مەنگوران نەیتوانی ولاْت ئارام کاتەوە. لەم کاتەوە لە سەرۆکایەتی دەخرێ و پێویستە تا پێنج رۆژی دیکە ئاغایاتی مەنگور لێرە ئامادە بن سەروکی تازەیان بۆ دیاری دەکرێ و دەبێ بۆ هەموو فەرمانێکی حکومەت مل راکێشن. ئەگینا بە گوێرەی فەرمانی ئەعلا حەزرەت هێزی لەشکر تاوانباران سزا دەدات. »

سەرتیپ موقەدەم هەمزەئاغا و حەسەناغا ئازاد دەکا بچنەوە کوندەکانی خۆیان. هەمزەئاغای سالار عەشایری دەگێڕێتەوە: سەرتیپ موقەدەم ئێمەی بانگ کرد. هەر یەکە ئەسپێکی بە زینەوە خەڵات کردین. کە هاتینە دەر، حەسەناغا گوتی: زوو بڕۆین. ڕکێفمان لێدان تا گەیشتینە چوار بەردەی. لەوێ ڕاوەستاین. حەسەناغا شادەو ئیمانی هێنا و گوتی : بە قەبری شێخی بورهانی هەتا ماوم چاوم بە عەجەمان ناکەوێتەوە. بۆ هەموو کوڕەکانیشم وەسیەت دەکەم کە هەتا هەن دوژمنی مەئمورەکانی ڕەزا شا بن. ئەوە بیرو باوەڕی منە، تۆش خۆت دەزانی. سوپاس بۆ خودا لە چەنگ شکنجەی عەجەمان ڕزگار بووم. دڵخۆشیم داوە و گوتم : سەرتیپ چاکەی لە گەڵ ئێمە کردوە. بەڵێنمان پێداوە. حەسەناغا گوتی : هەر ئەوەیە گوتومە. نە شیری وشتر نە دیداری عەرەب. هەمزەئاغا وحەسەناغا دەچنەوە باستام بەگ و ترکەش«. ئاگاداری دەوڵەت هیچ کارناکات و شەر دەست پێدەکرێتەوە. فرۆکە مەنگوڕان بۆمباران دەکەن. ژن و منداڵ بە مەرو ماڵاتەوە ڕوو دەکەنە چیاو لە پەنا و پەسیوان دەگەڕێن. ئۆردووی دەوڵەتی دەگاتە ئامێدێ و سوارەی شوقاق و شاسەیوان لە گەڵ لەشکری دەوڵەت دێهاتی مەنگوڕان دەسوتێنن و تاڵان دەکەن. تاڵان و سوتمان وگریان و هاوارتێکەڵ دەبێ. مەنگور هێشتا بەر بەرەکانی دەکەن. بەڵام بۆمباران و گرمەی تۆپان ترسی خستوونە دڵ و کەوتوونە فیکری ڕەزگار کردنی ژن و منداڵ و ماڵاتی خۆیان. دەگەنە سەر پردی قەڵاتاسیان ، حەشیمەت و مەر و ماڵات لە وێ کۆ دەبێتەوە و دەتگوت ڕۆژی حەشرە. مەلا خەلیلیش دەگاتە سەر پردێ و دەپەڕێتەوە. خەڵک لەم چیاو کەژە برسی و سەر گەردان دەسوڕێنەوە. ژیانێکی داخدارە و دەگەنە سنووری عێراق.» حکایەتی میرزا کەریمی درێژە و ڕاپەڕینی مەلا خەلیل لێکۆڵینەوەی پتری گەرەکە. بێجگە لە نووسراوەی برایمی ئەفخەمی توێژینەوەی مامۆستا عبدالرقیب یوسفیش کورتە ئاگاداریەکمان سەبارەت بە ڕاپەڕینی مەلا خەلیل دەداتە دەست.

و . **عبدالرقیب یوسف** لە سەر راپەڕینی **مەلا خەلیل** پرسیاری لە **ئەحمەدی حەماغای** پژدەری کردوە و وەلامەکەی لە ژێر ناوی ( لە بیرەوەریەکانی **ئەحمەدی حەماغای** پژدەری) دا بەم جۆرە بلاو کردۆتەوە: «**مەلا خەلیل کوێخا عەولای میراوەیی** بە نوێنەری خۆی ناردە لای ئاغاکانی پژدەر و داوای یارمەتی چەکداری لێکردن. ئەوانیش منیان ناردە لای **مەلا خەلیل** و چوار رۆژان لای ئەو مامەوە. پێم وت عەشایر جێگەی ئیعتیماد نین چونکە هەر رۆژە شێوەیەکن. ئاغایانی پژدەر پرسیان بە ئینگلیزەکان کرد. ئەوانیش وتیان ئێمە رازی نین یارمەتی **مەلا خەلیل** بدەن و ئاژاوە لە خاکی ئێران دروست بکەن. چونکە عەلاقەمان لە گەڵ ئێران باشە. **مەلا خەلیل** نامەی بۆ **شێخ مەحمودیش** نووسی و داوای یارمەتی لێکرد. بەلام زروفی باش نەبوو، نەیتوانی یارمەتی بدات»(١٦)

کاتێ چوبوومە کارلستاد خزمەت **قازی مەرەغانی لە سەر راپەڕینی مەلا خەلیلیش** پرسیارم لێکرد. لە وەلامدا فەرمووی:

«**مەلا خەلیل** جل و بەرگی کردە بەهانە، دەنا مەنزووری جل و بەرگ نەبوو. کردی بە بەهانە، بۆ خەڵک ئەوە چاکتر بوو. دە نا هەر لە هەوەڵەوە مەنگور و قیسمەتێک لە گەورکان و هێندێ لە مەلاکان موخالیفەتیان دەکرد. فەقەت کردی بە جل و بەرگ و شکڵێکی مەزهەبی بە خۆی گرت. قسەی مەلاکانی خوتسا کردەوە. **مەلا خەلیل** لە گەڵ **حەمە رەشید** خانیش پێوەندی گرت. مەلایەکی مەنگور بە ناوی **مەلا شەریف** نامەی دێنا بۆ **حەمە رەشید خانی**. کاغەزی ماموستا **مەلا خەلیلی** هێنا بانە. منیان رەگەڵ خست بۆ وێنە ماڵی **حەمە رەشید خان**. وەلامی دابۆوە گوتبووی من لە گەڵ **مەلا خەلیلم**. فەقەت مانگێکم لێ راوەستێ. دیارە هیچ دەستێک نەبوو یاریدەی مەلا خەلیل بدات و لە بەرانبەر سەرۆکی عەشیرەتی خۆ فرۆشی مامەش و دێبۆکری و لەشکری حکومەت دا خۆی پێ راتەگیراو بە ناچاری رۆژی کردە کوردستانی عیراق و ماوەیەک لەوێ

مایەوە. ماموستا **مەلا محەمەدی شەلماشی** کە لە فنلاند چوو بوومە خزمەتی و باسی دەردو داخی ژێر دەستیی کوردمان دەکرد، باسی **مەلا خەلیلیش** هاتە گۆرێ. **ماموستا** باسی زانایی و زانستی **مەلا خەلیلی** کرد کە زاتێکی هەڵکەوتوو بوە. فەرمووی لە بواری زانستی فەلەکیات وێنەی نەبوە . رۆژ ژمێرێکی بە پیتی ئەبجەد ساز کردوە و ناسراوە بە تەقویمی **مەلا خەلیل** و لای زۆربەی زانایانی کوردستان **راگیراوە**. ئەم رۆژ ئەژمێرە نەک هەر بۆ ساڵێک بەڵکوو بۆ هەمیشە و ئەبەدی حیسابی ساڵ و مانگ و رۆژی کردوە. نوسخەیەکی لە کتێبخانەی ماموستا شەلماشی هەیە و شتێکی عەنتیکەو نموونەی زانایی زانا باشەکانی کوردە. هەر لە سەر باسی ماموستا **مەلا خەلیل**، ماموستا شەلماشی فەرمووی: **کوێخا حەسەنی هەڵۆی** کە لە **مەلا خەلیل** نیزیک بوە گێراویەتەوە گوتوویە، دوای رۆیشتنی **مەلا خەلیل حەسەنا** غای مەنگور دەگرنەوە و دەڵێن یان دەبێ **مەلا خەلیل** بێنیەوە یا ئیعدامت دەکەین. **حەسەناغا** دەڵێ : دەچم دەیهێنمەوە. کاتێ ئازادی دەکەن، بار دەکاو دێتە ئەو دیو ولە گوندی شەروەتی دادەنیشێ. **مەلا خەلیل** ئەو دەم لە رانیە دەبێ. **حەسەناغا** دەڵێ: هەستە بچۆوە . تا تۆ لە دەرەوە بای منیان نە دەکوشت. ئێستاش تا من لە دەرەوە بم تۆ ناکوژن. بەڵام ئەگەر هەر تکمان بچینەوە، لە وانەیە عەجەم هەر تکمان بکوژن.

کاتێ لە خزمەت قازی عەلی مارەغانی بووم لێم پرسی نەزەرت **چیە** کە **مەلا خەلیل** کاغەزی ئیعدامی **پێشەوای** ئیمزا کردوە.؟ فەرمووی: ناتوانم باوەر بەو شتە بکەم. هەرچەندە زۆر گوتراوە. عەجەم قێڵە زانن و درۆ دەکەن. ئیتمینانی قەلبیم بەو شتە نیە. لەم چوار چێوەیەدا **ئەحمەدی حەماغای** پژدەری لە وەڵامی **عبدالرقیب یوسف** دا دەڵێ:« مەلا خەلیل پشتگیری قازی محەمەدی نەکرد. دەیگوت رێژیمی رووسی شیوعی‌یە و بە زەرەری ئیسلامە و نابێ تەئییدی بکەین. گەر چی مەلا خەلیل دژی قازی چەکی هەڵنەگرت، بەڵام

بە خەڵکی دەگوت لە گەڵ ئەو ڕێژیمە مەبن.» (١٧)

لێرەشدا **ماموستا مەلا خەلیل** لە ژێر تەئسیری مەزهەبدا زوڵم و زۆری و جنایەتی حکومەتی تاران دژی کورد لە بیر دەباتەوە و هەستی نەتەوایەتی پێشێل دەکات و نەک هەر پشتیوانی لە تاقە دەسەلاتی ڕەوای نەتەوەکەی ناکات، بەڵکوو بە قاڕانجی ڕێژیمی داگیر کەری تاران خەڵکیشی لێ دوور دەخاتەوە. نەک هەر ئەوە بەڵکوو وەک قاوەو ویلاو بۆتەوە فتوای ئیعدامی پێشەوای کوردیش ئیمزا دەکا. تاوانێک کە نە خودا لێی خۆش دەبێ و نە کورد قەت لە بیری دەکا.

## ڕاپەرینی سمایلاغای شکاک

یەکێ لە بزووتنەوەو ڕاپەرینە هەرە بەر بلاو و پڕ مەغزاو دەنگدەرەوەی کورد لە ڕۆژ هەڵاتی کوردستانی دوای تەواو بوونی شەڕی یەکەمی دنیاگر، ڕاپەرینی **سمایلاغای شکاک** ناسراو بە ( **سمکۆ** ) بوو کە بەشی زۆری کوردستانی ئیرانی گرتەوەو پریشکی گەیشتە کوردستانی خوارو و کوردستانی سەرووش. ١٩٩١ کە شەستەمین ساڵی شەهید بوونی **سمکۆی** قارەمان بوو. سەر نووسەری گۆڤاری بەرهەم کاک **مستەفا دوزگوین** داوای لێکردم کە بەم بۆنەوە لە سەر ڕاپەرینی **سمکۆ** وتارێکی بۆ بنووسم کە بە زمانی تورکی بلاوی کاتەوە. بەم ئیعتیبارە کە کوردەکانی کوردستانی تورکیا لە بارەی بزووتنەوەی **سمکۆ** هیچ ئاگاداریان نیە. ئەم باسەی لێرەدا لە بەر دەستی خوێنەرانی بەرێز دایە ساڵی ١٩٩١ نووسراوە و لە ژمارە ١٠ی گۆڤاری ( بەرهەم ) ١٩٩١دا بە زمانی تورکی بلاو کراوەتەوە. پاشان لە ژمارە ٧٠ و ٧٣ی گۆڤاری (بەر بانگ) ئورگانی کۆمەڵە فیدراسیۆنەکانی کورد لە سوید بە زاراوی کرمانجی بلاو کراوەتەوە . لام وایە نوسخەیەکیشم بۆ **ماموستا هاوار** ناردوە و نوسخەیەکیشم داوە بە کاک ئاسۆ

**گەرمیانی** و نوسخەیەکم بۆ دوکتور **محەممەد کەریم شکاکی** ناردوە. ئێستا بە دەستکاریەکەوە جارێکی دیکەش لێرەدا بلاو دەکرێتەوە. پێم وایە ئەم کورتە نووسینە لە چاو نێوەرۆکی راپەرینی **سمکۆ** شتێکی زۆر کەمە و نەیتوانیوە بە تەواوی بچێتە ناخی ئامانج و کردەوەو چۆنیەتی راپەرینی **سمکۆ** و نرخی تەواوی خۆی بداتێ. هیوادارم مێژوو نووسان و زانایانی کورد **شیکردنەوەی راپەرینی سمکۆ** نەخەنە پشت گوێ و نەهێڵن ئەم لاپەرە پرشنگدارەی مێژووی نەتەوەکەمان لە ژێر تۆزی فەرامۆشکاریدا بە نادیاری بمێنێتەوە.

# بارودۆخی وڵات لەسەردەمی
# دوای شەری یەکەمی دنیا گردا.

دوای راپەرینی **شێخ عوبیدوڵای نەهری**(١٨٨٠) بزووتنەوەی سەرۆک عەشیرەت و ئەمیرانی کورد، بە مەبەستی سیاسی و ئامانجی نەتەوەیی لە کوردستانی ئێران دادەمرکێ. هەر چەندە جاروبار لێرولەوێ چەند عەشیرەتێک بۆ نەدانی باج و مالیات و سوورسات سەر بزێویان کردوە و لە حکومەتی عەجەم هەڵگەراونەوە، بەڵام لە راستیدا لە بەر بێ بەرنامەیی و یەک نە گرتن و ناکۆکی نێو خۆ نەیانتوانیوە کۆمەڵانی خەڵک بێننە مەیدانی خەبات و شەقڵی رزگاری نەتەوەیی بە راپەرینە کانەوە بنێن . هەر بۆیەش پاش ماوەیەک شەر و سەر بزێوی شکاون و یا تەسلیمی دوژمن بوون و سەریان تێدا چوە. داخێکی دیکە ئەوەیە ئەم راپەرین و خەباتە نەهاتۆتە سەر کاغەزو تۆمار نەکراوە و بۆ میللەت بە جێ نەماوە.

لە سەردەمی پاشایەتی **موزەفەرەددین شای** قاجاردا، بارو دۆخی ئێران فرە پەرێشان و شپرزە دەبێ و تەقەڵۆ هەودای وڵات لەبەر یەک هەڵدەوەشێ. هەر سەرۆک عەشیرەتێکی زۆردار لە ناوچەکەی خۆی دەبێتە حاکم وزۆرجوابی تاران ناداتەوە. عەشیرەتی شکاک کە یەکێ لە گەورەترین عەشیرەتەکانی کوردستانی ئێران بوو، لە ناوچەی ورمێ و سەڵماس، سەر بۆ حکومەتی تاران نەوی ناگا وشکاک بە کردەوە حاکمی ناوچەی خۆیان دەبن. **محەمەدئاغای** باوکی **سمکۆ**،

سەرۆکی تایفەی عەبدوویی، لەم ناوچەیەدەسەلات دەگرێتە دەست و گوێ ناداتە حکومەتی تاران. وەک کەسرەوی مێژوو نووسی ئێرانی باس دەکا: دەوڵەتی ئێران کابرایەک بە ناوی (نظام‌السلطنە)دەکاتە والی ئازربایجان،( کە بە گوێرەی دابەشکردنی ناوچە بەندی وڵات کوردستانیش دەگرێتەوە.) نظام‌السلطنە دەیەوێ عەشیرەتی شکاکیش بەر بار بکاو دەسەلاتی خۆی بە سەر ئەوانیشدا بسەپێنێ. بەڵام دەزانێ بە شەر دەرۆستی **محەمەدئاغای** شکاک نایە. وەک هەموو دوژمنێکی خوێنی دەکەوێتە بیری فێڵ و پلان دانانەوە. **جەعفەرئاغای** کوڕی **محەمەدئاغا**، بۆ تەورێز بانگ دەکا، پشتی قورئانیشی بۆ ئیمزا دەکا کە خەیانەتی پێ ناکات. **جەعفەرئاغای** دڵپاک وخاوەن بڕوا بە قورئان. لە گەڵ (میرزا)ی خاڵی و شەش کەسی دیکە دەچێتە تەورێز و لە لایەن والی پێشوازیەکی گەرمی لێ دەکرێ. لەو سەرو بەندەدا ئەرمەنی و ئازربایجانی قەفقاز تووشی ناکۆکی شەروکێشە دەبن. نظام‌السلطنە گەرەکی ئەرمەنیان لە تەورێز بە **جەعفەرئاغا** دەسپێرێ کە بەسەری رابگاو بیپارێزێ. لە بنەوەش تەخشەی کوشتنی دەکێشێ. رۆژێکیان بە دوایدا دەنێرێ کە بچێتە کن والی. لە حەسارو دەوروبەری بارەگاش بۆسەی بۆ دانەنێنەوەو چەند تفەنگچی ئامادە دەکەن کە تەقەی لێبکەن و بیکوژن. **جەعفەرئاغا** بێخەبەر لە هەموو شت، دێتە بارەگای والی و پیاوەکانی خۆی لە حەساری رادەگرێ و لە پلیکانان بۆ کن والی سەر دەکەوێ. لەو کاتەدا کە نۆکەرانی والی دەیانەوی بۆ لای والی بەرن، **حەمەحوسێنخانی** زەرغامی قەرەجەداغی، لە پەنجەرەوە دەسرێژی لێ دەکا و وەسەرێکی دەگێرێ. پیاوەکانی **جەعفەرئاغا** کە گوێیان لە تەقەی دەبێ، رادەکەنە سەر مەیتەکەی و دەیانەوێ تەرمەکەی دەرباز بکەن. بەڵام کە دەزانن مەیتەکەیان بۆ دەرباز نابێ، دەکەونە فیکری خۆ رزگار کردن و خۆ دەگەیێننە کۆڵان و سەربانان و بە قونە شەڕ دوای ئەوەی دووکەسیان لێ دەکوژرێ، لە شاری وەدەر دەکەون. والی سوارانیان وەدوا دەخات و ئەمر دەکا نەجاتیان نەدەن. لە

گوندی( ئەرزق ) دەگەنە سەریان و لێیان دەبێ بەشەڕ. ئەو پێنج کەسە قارەمانە، دوای شەڕێکی توند چەند کەسیان لێ دەکوژن، ئەسپەکانیان دەگرن و لێ سوار دەبن، خۆ دەگەیێننەوە کوردستان.*

کوشتنی جەعفەرئاغا وا بە ناپیاوی و بە فێڵ و تەڵەکە، کار دەکاتە سەر محەمەدئاغا و سمایلاغای کوری. بڕیاری بەر بەرەکانی حکومەتی عەجەم دەدەن و بۆ سەپاندنی دەسەڵات بەسەر ناوچەدا دەکەونە کار. لەو سەردەمەش دا حکومەتی ئێران و عوسمانی لە سەر سنوری نیشتمانی کورد کێشەیان دەبێ. بە گوێرەی بڕیاری کونگرەی بیرلین ناوچەی ستراتیژی(قتور) لە مەڵبەندی شکاکان دەدرێ بە ئێران. بەڵام حکومەتی تورک بەم بڕیارە رازی نابێ و دەیەوێ کێشە ساز بکا. **سمایلاغا (سمکۆ)** لە ناکۆکی نێوان حکومەتی ئێران و عوسمانی گەلک وەردەگرێ و ئەم ناوچەیە دەخاتە بەر دەستی خۆی، عەجەمانی لێ پاک دەکاتەوەو دەسەڵاتی خۆی رادەگەیێنێ. دیارە چالاکی و تێکۆشان و ناو و ناو بانگی سمکۆ هەر وا بە هەڵکەوت و کوتو پڕ نەبوە. پێش هەڵگیرسانی شەری یەکەمی دنیا گر **سمایلاغا** لە گەڵ **عبدالرزاق بدر خان** هاو بیر بوە و لە داڕشتنی بەرنامەی شۆرش بۆ دامەزراندنی کوردستانی سەر بە خۆ هاو کاری کردوە. لە گەڵ **شێخ عبدالسلامی بارزانی** چۆتە رووسیا و داوای یارمەتی و پشتیوانیکردنی بزوتنەوەی کوردی کردوە. خزمایەتی لە گەڵ **سەید تەها** و بنە ماڵەی شێخانی شەمزینان هەڵکەوتی سیاسی و کۆمەڵایەتی **سمکۆی** پتەو تر کردوە. بەر لە شۆرشی ئوکتوبر لە گەڵ سەید تەها و چەند کەسێتر (کۆمەڵەی نەجاتی کوردستان)یان دامەزراندوە. لە گەڵ کار بەدەستانی رووس لە بارەی هاوکاری دژی تورک و پشتیوانی لە ئامانجی نەتەوەیی کورد وتو وێژیان کردوە.(١٨)

*باسی کوشتنی جەعفەرآغای شکاک لە( مێژووی مەشروتەی ئێران و مێژووی ١٨ ساڵەی ئازەربایجان) نووسینی ئەحمەدی کەسرەوی و هەر وەها لە

(سر زمین زردشت) نووسینی عەلی دهقان وەرگیراوە.

دیارە ئەوانە و سەرۆکایەتی بنەماڵەیی عێلی گەورەی شکاک و هەل و مەرجی ناوچە و لاوازی و بێ دەسەلاتی حکومەتی عەجەم بوونەتە هۆی درەوشانەوەو دەرکەوتنی سمایلاغا لە عاسمانی سیاسەتی کوردەواریدا، ئەویش بە لێهاتوویی بە گوێرەی بارو دۆخی ئەو سای جیهان و کوردستان توانیویەتی لە گەڵ رووداوەکان مامڵە بکا.

## پیلان بۆ کوشتنی سمایلاغای شکاک.

پاش ئەوەی **سمکۆ** هەڵگەرانەوەی خۆی لە حکومەتی تاران ئاشکرا دەکات، دەست دەکا بە کۆکردنەوەی لەشکر و پەرە پێدانی دەسەلات لە ناوچەدا. ئەمجارە والی ئازربایجان بە ناوی (**مکرم‌الملک**) دەزانێ بەشەر هیچی لە گەڵ **سمکۆ** پێ‌ناکرێ. دەکەوێتە نانەوەی پیلان و فێڵ، بۆ کوشتنی **سمکۆ**. بۆمبایەک دروست دەکاو بەناوی شوگەلات و شیرنی کە گۆیا خەسووی لە خۆیەرا بۆی ناردوە، دەیپێچێتەوەو بۆی دەنێرێ. **سمایلاغا** باسی ئەم پیلانە ئاوا دەگێرێتەوە: « لە دەشتێ لە سەر چیمەن دانیشتبووین، قوتوەکەیان هێنا. کورەکەم بۆ کردنەوەی قوتو بەپەلەبوو بەم خەیاڵە کە شیرنیاتەو ئەنگی بۆی ناردوە. لەو کاتەدا، وەبیرم هاتەوە کە (**حەیدەر عەموغلی**) قوتویەکی بە ناوی شیرنی بۆ (**شوجاع نیزام**) ناردوە، لە گەڵکوو کردوویانەتەوە، تەقیوەو **شوجاع نیزام** کوژراوە. وەشک کەوتم. گوتم بەرن لەولا بیکەنەوە. کە دەزوەکەیان پچڕاند، روناکیەکم بینی، گورج کورەکەم دەئامێزێ گرت و خۆم بە عەرزی دادا. بۆمبایەکە تەقی، من بە سلامەت دەرچووم، بەلام عەلی برام و چەند کەسیتر کوژران . »

ئەم کردەوە نا پیاوانەی (**مکرم‌الملک**) **سمکۆی** لە سەرخەبات و تێکۆشان

وسەپاندنی دەسەلاْت شێلگیر تر کردو دەستی کرد بە پاک کردنەوەی مەڵبەندی شکاکان لە دەسەلاْتی حکومەتی عەجەم ورێگای ورمێ - تەوریزی بەست. هاتوو چۆی نێوان تەوریز و ورمێ تەنیا لە رێگای دەریاو لەنگەرگای گوڵمانخانەوە دەرەتانی هەبوو.

## سمایلاغاو کوشتنی مارشیمون

دوای شەڕی یەکەمی دنیاگر و قەلاْچۆکردنی ئەرمەنیان لە تورکیا، نیزیکەی ۲۵هەزار کەسی ئاسوری و ئەرمەني رووەدەکەنە کوردستاني ئێران و لە ناوچەی سەلْماس و ورمێ خۆ دەگرنەوە. دیارە ئاسوری وئەرمەنی لە کاتی شەڕدا لە لایەن لە شکری رووسیای قەیسەری‌یەوە چەکدار کرابوون و دژی تورک شەریان دەکرد. لە ورمێ ئەنجومەنێکی ئاسوری و کلدانی دادەمەزرێنن و هەر لەو کاتەشدا دەست دەکەن بە پێکهێنانی تەشکیلاتی نیزامی بە خەیاڵی دامەزرانی دەوڵەتێکی ئاسوری - ئەرمەنی لە ناوچەی سەلْماس - ورمێ کە مەڵبەندی هەکاری -یش بگرێتەوە. **نیکیتین** قونسولی ئەودەمی رووس لە ورمی دەنووسێ:« بێ نەزمی و هەڵگەرانەوە لە نێو لەشکری رووس دا، مەسیحیەکانی وەترس خستبوو. لە مانگی ئوکتوبری ۱۹۱۷ دەستەیەکی نوێنەرایەتیان چوە تفلیس و داوای پشتیوانیان لە کاربەدەستانی دەوڵتی رووس کرد. ژەنراڵ (**لبدینسکی**)فەرماندەی لەشکری قەفقاز بە تیلگراف بە منی راگەیاند کە بریار دراوە لە ورمێ لەشکرێکی مەسیحی پێک بێنن. دیارە ئەتاشەی نیزامی هاوپەیمانەکانیش (**کولنل شاردینی و کاپیتان مارج و ماژۆر ستینکس** و کولنل پک لە گەڵ ئەم بریارە موافیقن .ئەم تەشکیلاتە تازەیە جگە لە دابینکردنی مەسیحیەکان دەبێ چالاکی جەبهەی تورکەکانیش بخاتە ژێر چاوە دێری. لە لایەن هاو پەیماناتەوە رادەی یارمەتی ماڵی

و فەتنیمان پێدرا. سێ ئەفسەری فەرەنسەیی گورج خەریکی رێکخستن بوون. بەلاّم **کلنلْ شاردینی** لە ورمێ بە منی گوت کە بەشداری دەولّەتی فەرانسە لەم تەشکیلاتەدا کاتی‌یە. چونکە ئێران و قەفقاز بوونە ناوچەی کاری ئینگلیز. پێویستە ژەنرالْ دینسترویل بە سەر کارو باری ئەم دوو ولاّتە رابگات. من لەو مەسەلەیە ئاگادار نەبووم، بەلام دەمزانی کە ئینگلیزەکان بۆ پێکهێنانی لەشکری مەسیحی هەنگاوی جیددی داوێن. میستر **(ماک‌موری)** سەرۆکی کومیسیونی بەرزی بەریتانی لە هەمەدان بە تیلگراف بە ژەنرالْ **(گارسی)** کە لەورمێ بوو راگەیاند کە لە گەلْ پێکهاتنی تەشکیلاتی نیزامی‌ودیاری دانی توانای عەسکەری ئەوتەشکیلاتە، پارەی پێویستتان بۆ دەنێردرێ. مانگی ژانویەی ١٩١٨ کاپیتان (گراسی) بۆ پاراستنی ئەرمەنیان و ئاگاداری لە کاروباری کوردستان **هاتە** ورمێ و کۆمەڵێکی پێک هێنا. ئیدارەی گۆڤاری ویگرام vigram کتێبێکی بە ناوی (پچوکترین هاوگری سالی ۱۹۲۰)بلاّو کردەوە و لە لاپەرەکانی ٣٥ و٣٦ دا نوسیبووی **«کاپیتان گراسی** چوە ورمێ بۆ ئەوەی لە گەلْ ئاسوّریەکان پێوەندی بگرێ. لە وێ مێتینگێکی گەورەی پێک هێنا. رێبەرانی میللەتی ئاسوری ئەو نەخشەو ئاخاقتنی ناوبراویان پەسند کرد. بریار وابوو ٢٥ ئەفسەری رووسی بچنە ورمێ تا هێزی ئاسوری دابمەزرێنن. ئەم هێزە دەبوایە هێڵی دەریای رەش تا بەغدا بپارێزێ. پارەو تفاقی شەریش ئەوەندەی پێویست بێ بۆیان دەنێردرێت. بە پشت بەستن بەم وادەو بەڵێنە میللەتی ئاسوری ئامادە بوو چەک هەڵگرێ و شەر بکا. لەو مێتینگە دا جگە لە کەسانی بە زیپک و زاکونی میللەت، جەنابی‌سنتاک‌و دوکتور **ئا.شید** کە ئەو دەم کونسولی ئیفتیخاری ئەمریکا بوو، من و دوکتور **کوژل**- یش ئامادە بووین. بروامان کرد کە قسەکانی **کاپیتان گراسی** بە نیەتێکی خالیس و پاک گوتراون.» (١٩)

بەم پێیە روونە کە دەولّەتی روس و ئینگلیز ویستوویانە لە بەرامبەر تورکیادا، حکومەتێکی دەستنێژی خۆیان لە ئاسوری و ئەرمەنی لەم ناوچەیە

دابمەزرینن.. سەرۆکی ئەرکانی ئینگلیز هەولی داوە کە لە نیوان ئاسوری و ئەرمەنی و کورد دا، هاوکاری‌یەک پیک بینێ. بەلاّم رووسەکان لە ناوچەی ورمێ دەست دەکەن بە پیکهینانی رێکخراوی نیزامی مەسیحیەکانی ناوچە وئەم جیلۆیانە کە لە تورکیاوە هاتبونە کوردستان. بەم چەشنە لە سەرەتای سالّی ۱۹۱۷ لەشکریکی تازە دامەزراو لە ئاسوریەکان خۆ نیشان دەدا. (۲۰)

ئاسۆری‌یەکان پاش ئەوەی رووەدەکەنە ناوچەی ورمێ، لە شارو گوند دەست دەکەن بە کوشتارو تالاّنی خەلّک. دەسەلاّتیکی تەواو بەسەر خەلّکی ناوچەدا دەسەپینن. **سیتوان گاسفیلدی** فەرەنسی لەم بارەوە دەنووسێ: « ئیمە مەجبور بووین دەستەی غەیرە نیزامی لە ئاسوری و باندی چەکدار پیک بینین. عەیبی ئەم ریکخستنە زۆر زوو دەرکەوت. ئاسوریەکانی چیا نشینی تورکیا کاتێ کە چەکدار بوون دەستیان کرد بە تالاّنی گوندەکان و بە هیچ جور پیشیان نە دەگیرا. ئەوان سەدان سالّ لە چیاکانی تورکیا بەم کارە راهاتبوون. لە سەرە تای سالّی ۱۹۱۸ لەشکری مەسیحیەکان دەگەیشتە تیزیکەی ۱۲ هەزار چەکدار. زۆربەیان جیلۆ بوون لە ژیر فەرماندەری **ئاغا پتروس** دا. کادری ئەم هیزە لە رووسان پیک هاتبوو. سەرۆکی ستادی فەرماندەییش فەرەنسی بوو. »(۲۱)

پاش ئەوەی کە ئەم لەشکر و حەشیمەتە دەگەنە ناوچەی ورمێ و سەلّماس، ریبەری مەزهەبی و نیزامی ئاسوریەکان **مارشیمون** هەوای پیکهینانی دەولّەتیکی ئاسوری لە سەری دەدا. ئەو دەیویست لە هەلّو مەرجی ئالۆزی جیهان و لە سیاسەت و پشتیوانی هاو پەیمانان کە لەشکری ئاسوریشیان بۆ پیک هینا بوو کەلک وەرگرێ و لەم مەلّبەندەی کوردستان سنگی خۆی لیدابکوتێ.

**نیکیتین** کونسولی ئەو دەمی رووس لە ورمێ لەم بارەوە دەنووسێ: « لافاوی تایفەی نەستوری **مارشیمون** پاش بەربەرەکانی ئازایانە لە گەلّ کوردەکان و تورکەکان بە ناچاری چیاکانی خۆیان بە جێ هیشتبوو هاتبوونە ئەم ناوچەیە و ببوونە سەر باری ئەم بارو دۆخە ئالۆزە. پاشە کشەی نەستوریەکان بۆ نیو لەشکری

ئێمە وەزعی سیاسی ئاڵۆز کرد. چونکە ئەم چەکدارانە کە لە گەڵ کورد و تورک شەڕیان کرد بوو، هەر چەندە بە ڕەسمی لە لایەن ئێمەوە بۆ شەڕی دژی تورک داوەت نەکرا بوون، لانی کەم فەرماندەکانی لەشکری ئێمە ئەوانیان بۆ شەڕ هاندا بوو. کە وابوو هەر چۆنێک بێ هاو گری شکاوی ئێمە بوون. مافی خۆیان بوو کە ڕەگەڵ ئێمە کەون. لە لایەکی تر ڕوسیا لە شەڕی دژی تورک مەبەستی ڕزگاری ئەرمەنستان بوو، دەبوایە دەست بخاتە نێو کارو باری ئەو ئاسوریانەش کە لە ویلایەتی وان دادەنیشن. جگە لەوە **مارشیمون** چوبوە تفلیس و سەبارەت بە سەر بەخۆیی و ئازادی ئاسوریەکان لە گەڵ **گران دوک نیکولا** وتو وێژی کرد بوو. بە دڵنیایی گەرا بۆوە و ئاسوریەکانی تورکیا چاوە ڕوان بوون کە لە دوای شەڕ سەربەخۆ بن.» (٢٢)

**مارشیمون** ڕێبەری مەزهەبی و نیزامی ئاسوری لە (خوسرەوای) نیزیک **سەڵماس** بنکەو بارەگای لێ بەعەرزی دادەداو دەست دەکا بە فەرمانڕەوایی لە ناوچەدا. هەر لەو کاتەشدا خەبەر دەدا بە **سمکۆ** چاویان پێک بکەوێ. **کە سرەوی** نووسەری (مێژووی مەشروتەی ئێران) لەم بارەدا دەنووسێ:

« ئاسوری‌یەکان بە هاسانی ورمی‌یان خستە ژێر دەستی خۆیان. **مارشیمون** لە گەڵ دەستەیەک ئاسوری و جیلۆ بەرەو شاری **سەڵماس** کەوتە ڕێ. **مارشیمون** دەیویست **سمکۆ** فریو بدا. پەیامی بۆ نارد کە لە شوێنێ چاویان پێک بکەوێ. بڕیاریاندا کە ڕۆژی ٢٥ی فیوریەی ١٩١٨ لە کۆنەشار پێکەوە دانیشن. مارشیمون لە ڕۆژی دیاریکراودا، لە گەڵ ١٤٠ سواری بژاردەی چەکدار سواری کالسکە دەبێ و دەچێتە کۆنە شار.»

**مامۆستا عەلائەددین سەجادی** لە کتێبی (شۆڕشەکانی کورد) دا، دەنووسێ: « ڕووسەکانی قەیسەری ئەیانویست لەو وڵاتەدا بەرانبەر بە بالشویک کۆنسپێک پەیدا بکەن. لە گەڵ ئەمەدا لە دڵا لەو فیکرەش دابوون کە دەنگێکی کوردایەتی لەو ناوەدا هەبوو ئەو دەنگەش لە ناو بەرن... ڕووسەکان هاتن

(**مارشمعون**)یان راست کردەوەو قسەیان لە گەڵ کرد و هەموو جۆرە پەیمانێکیان دایە. لەو ولاتە **سمایلاغا** هەیە. بوونی **سمایلاغا** کۆسپێکی هەرە زلە چ لە رێگای قەیسەریەکانا و چ لە رێگای **مارشمعون** دا. چاری ئەمە ناکرێ مەگەر بەوە نەبێ کە **مارشمعون** لەگەڵ **سمایلاغادا** بکەونە قسەو بەڵکوو بە پارێکا نیشی لە گەڵ یەک لابکاتەوە. هێنای سەرەتا بە ناوی ئەوەوە کە حکومەتێکی کوردی - ئەرمەنی دروست بکەن لە گەڵ **سمکۆ** کەوتنە قسە کردن. بەلام لە راستیدا ئەیویست لەم رێگەیەوە لە ئاخردا **سمکۆ** و کوردەکان لە ناو بەرێ و راستەو راست حکومەتەکە ببێ بە حکومەتێکی « ئەرمەنی - ئاسۆری». ئەمەش راست بۆ وابوو. چونکە هێزی مارشمعون وەکو وترا، ٢٥هەزار تفەنگچی رێکو پێکی خاوەن مەشق بوون. لە پشتیشیەوە رووسی قەیسەری پشتیوانیان بوو. هێزی **سمایلاغا** نە ئەو ئەندازەیە بوو، نە ئەوەندە رێکو پێک بوو. هێزی ئەم عیبارەت بوو لە هێزی عەشایر، کەسێکیش نەبوو لە پشتیەوە بە چەک و جبەخانە یاریدەی بدا. کەوابوو لە ناو بردنی سمکۆ بۆ **مارشمعون** وەک ئاو خواردنەوە وابوو.»

**ماموستا عەلائەددین** لە مەڕ چوونی **مارشیمون** بۆ لای **سمکۆ**، درێژە بە باسەکەی دەداو دەنووسێ: « هاتنی **مارشمعون** بۆ لای **سمایلاغا**، دەستووری رەسمیاتی پادشاهی نیشان دەدا. خۆی لە جل‌وبەرگی ئاڵ و واڵی سەرۆکی روحانی ئیمرۆی تیرەیەکی خاوەن دەسەلات و پادشایەکی بە هێزی سەی رۆژیانا لە سەر دروشکەیەکی چوار ئەسپی دانیشتوە کە هەموو چێوبەندی دروشکەکە بە ئاڵتون زێر کفت کراوە. شەش ئەفسەری گەورە کە چوار لە مانە لە ئەفسەرەکانی رووسی ئەم دەورە بوون، دوویان لە پێشەوە لە سەر دروشکەو چواریان لە پشتەوە راوەستان و شیرەکانیان بە رووتی راگرتوە و کالانی شیرەکانیان لە گەڵ مشتۆکانیانا هەموو زمروت و مرسع بوو. تیشکی هەتاوەکە کە ئەیدا لەم ئاڵ‌و والای پادشاییە، سامێکی دەخستە ئەو ناوە. **مارشمعون** بەم جۆرە هاتنە هات و

له مالی تەیمورئاغا دابەزی.» (٢٣)

بە دوای چوونی **مارشیمون** دا، **سمکۆش** دەگاتە کۆنە شار و دەسپێری دەستەیەکیش بە دوای ئەودا بگەنە ئەم شوێنە. دەبێ سمکۆ پێشتر هێندێ چەکداری ناردبنە کۆنەشار کە لەوێ خۆیان دە بۆسە نابێ.. **مارشیمون** دەگاتێ، خۆی دەچێتە ژوور وسوارەکانیشی لە حەساری جلەو بەدەست رادەوەستن. کەسرەوی لەم بارەوە دەنووسێ: « ئێمە ئاگامان لە وتو وێژی مارشیمۆن و سمکۆ نیە. بەلام **سمایلاغا** خۆی گێراویەتەوە کە **مارشیمون** بە **سمکۆی** گوتوە: ئەم ولاتە کە ئێستا بە کوردستان ناو دەبرێ، ئەوە نیشتمانی ئێمە بوە. بەلام جیاوازی ئایینی لەبەر یەکی بلاو کردووین. ئێستا پێویستە یەک بگرینەوە. ئەم ولاتەی خۆمان بگرینە دەست و پێکەوە بژین. ئێمە لەشکرمان کۆ کردۆتەوە، ئەگەر ئێوەش لە گەڵمان بن، تەوریزیش دەگرین.» (٢٤)

**سمکۆ** کە هەست بە پیلانی **مارشیمون** دەکات، بە پێکەنینەوە بەڵێنی پێ دەدا. لەگەڵ مارشیمون دێتە دەر و راست لەو کاتەدا کە **مارشیمون** دەیەوێ سواری کالسکە بێ، تەقە لە تفەنگێکی دێت و **مارشیمون** دەکەوێتە عەرزی. شکاک لە هەموو لایەکەوە دەسرێژ لە سوارەکانی **مارشیمون** دەکەن و نیزیکەی سەت کەسیان لێ دەکوژن. **سمکۆ** هەر ئەو رۆژە دەگەرێتەوە بۆ چاریە. بۆ بەیانی لەشکری ئاسۆری وەسەر **سمایلاغا** دەگەرێ. لە کوندەکانی دەوروو بەر دەست دەکەن بە کوشتار وکەس وەپاش خۆ نادەن. **سمکۆ** دوای بەربەرەکانی زۆر، ناچار پاشە کشە دەکاو چاریە بەجێ دێلێ. ئەنجامی کوژرانی **مارشیمون** و کوشتاری لە رادەبەدەری خەڵک لە لایەن ئاسۆرییەکان و هاتنی لەشکری تورک و شکانی ئاسۆری و رۆیشتنیان بۆ سایتقەلا بۆ پاڵ لەشکری ئینگلیز و کوشتار و تالانی جیلۆ، باسێکی دوور و درێژەو لەم کورتە وتارەدا ناگونجێ. ئەوەندەیە دوای کوشتنی **مارشیمون** بە قەولی ( **عەلی دهقان**) نووسەری «تاریخی رضائیە» فەلەو ئاسۆری ١٥٩ رۆژ لە شارو لە ناوچەی ورمێ کوشتاریان لە خەڵک کردوە.

سەتو چل هەزار کەسی ژن و پیاویان کوشتوە و شارو گوندیان تالاّن کردوە.

لەم بوارەدا دەکریّ بیر لەوە بکرێتەوە کە داخوا **سمکۆ** هەروا لە خۆوە بە بیّ بەلگەو تاوان **مارشیمونی** کوشتوە؟ یان لە پیلان و کەلّەک و فێلێک ئاگادار بوە؟ لەم بارەوە بیروڕای جیاواز هەن. هێندیّ لە نووسەران ئەم کارەی **سمکۆ** بە هەلّەیەکی گەورە دادەنێن و خەریکن پرسەش بۆ**مارشیمون** دابنێن. هێندێکیش لایان وایە کە **سمکۆ** دەستی بەوە کردوە مارشیمون بە پشتیوانی هاوپەیمانەکان دەیەویّ دەسەلاّتی خۆی لە کوردستان بسەپێنیّ و دوور نیە بۆ بەربەرەکانی تورکیا، لەم مەلّبەندە بە پیت و بەرەکەتەی کوردستان حکومەتێکیشی بۆ ساز بکەن‌و ئەمجارە سەردەمێکی تریش کورد بخەنە ژێر دەستی دەولّەتی ئاسوری و نەرمەنی. ئەم بۆچوونە کاتیّ بە هێز تر دەبیّ، کە دەبینین هێندیّ درنگتر، لە کونفرانسی لۆزان، ئینگلیزەکان (پیتروسی) جێگری مارشیمون قوت دەکەنەوەو ناو براو داوا دەکات کە پێویستە لە کوردستان جێگایێکیان بۆ دیاری بکریّ، هەر وەک لە فەلەستین بۆ جولەکان جێگا دیاری کراوە.

نووسەرو شاعیری بە ناوبانگی ئێرانی **(ملک‌الشعرای بهار)** لە کتێبی خۆیدا بە ناوی ( مێژووی حیزبە سیاسیەکان) دەنووسیّ: « لە کونفرانسی لۆزان( **پطرسی ئاسوری**) بە پشتیوانی لەندەن راست دەبێتەوەو داوا دەکات کە: « ئاسوری و کلدانی میللەتێکی کەوناراو » قەدیمەوە مەسکەن و نیشتمانی ئەوان بریتی بوە لە: سنوری موسلّ و کوردستانی عوسمانی و کوردستانی ئێران تا ورمیّ. دەبیّ بدرێتەوە بە ئەوان و ناوەند و بنگەی تایبەتیان بۆ دابین بکریّ. ناو براو باسی ئەوەی کردوە کە ئاسوری چەندەیان خزمەت بە رووس و **ئینگلیز** کردوە. » (٢٥)

نەک هەر ئەوە **مەهدی قولی هیدایەتیش** لە کتێبی (خاترات و خطرات )دا دەنووسیّ: « پطرس ناوێک لە کونفرانسی لۆزان بە نوێنەرایەتی کلدانیان باسی سەر بە خۆیی کرد و سنوری گەیاندە گۆلی ورمیّ » لاپەری ٤٤٩.

دوکتور **عبدالرحمانی قاسملو** لە بارەی ڕاپەڕینی **سمایلاغاوە** دەڵێ:
«... **سمکۆ** بەشێکی زۆری لە کوردستانی ئێران ڕزگار کرد و پاش دامەزراندنی پێوەندی لە گەڵ **شێخ مەحمود**ساڵی ١٩٢٣ بۆ خۆی لە سولەیمانی چاوی بە **شێخ مەحمود** کەوت. بە لاّم ئینگلیزەکان **سمکۆیان** بۆ شەڕی ئاسوریەکان هاندا و سەرۆکی ئاسوریەکان **مار شەمعونی** کوشت و دیارە ئەو کارە بوو بە هۆی کز بوونی هەڵوێستی سمکۆ.» (٢٦)

دوکتور **قاسملو** لەم بۆ چوونەدا پشت بە هیچ بەڵگەو فاکتێک نا بەستێ کە ئینگلیزەکان **سمکۆیان** بۆ کوشتنی **مارشیمون** هاندا بێ. ڕووداوەکان پێچەوانەی بیرو ڕای دوکتور **قاسملو** نیشان دەدەن. لە گشت بەڵگەو نووسراوەکان دەردەکەوێ کە ئینگلیزەکان نەک هەر دژی **مارشیمون** و ئاسوریەکان نەبوون، بەڵکوو بە پێچەوانە ئەوان کۆیان کردووتەوەو یارمەتیان داون و لەشکر و دام و دەزگایان بۆ ساز کردوون. لە ئاخری مانگی دیسامبری١٩١٧ **سەروان گریسی** یەکێ لە ئەفسەرانی ئینگلیزی میسیۆنی نیزامی بەریتانیا لە قەفقاز کە مەعموری پێوەندی لە گەڵ ئەرمەنیەکانی شاری وان بوو هاتە ورمێ. ناو براو لە کن سەر پزیشک **کوژول و سیتوان گاسفیلد** کونسولی ڕووس و م.شد لە میسیونی ئەمریکایی، ئاسوری و کلدانیەکانی بۆ چەک هەڵگرتن هانداو بەڵێنی پێدان کە لە کۆنفرانسی دوارۆژی ئاشتی لە پاریس چارە نووسی میللەتەکەیان لەو پەڕی باشیدا موتالاّ دەکا» (٢٧)

بە لای منەوە لە کوشتنی **مارشیمون دا** ئەگەر هاندان و دەستی بێگانە بیری لێ بکرێتەوە ناکرێ هاندان و پاڵ پێوەنانی تورکیا نەخرێتە بەرچاو. **ئەحمەدی حەماغای پژدەری** دەڵێ :« **سمکۆ** کە هاتە پژدەر لە دێی نورالدین لە ماڵی **هەباسی مەحمودئاغا** بە شەو درەنگ قسەی خۆشی بۆ من دەکرد. دوو سێ جار باسی ئەم مەسەلەیەی بۆ من کرد و دەیگوت خەڵەتم کرد خۆزگە **مار شمعونم** نە کوشتبایە. بەلاّم تورکەکان بە منیان کرد. وتی **خەلیل پاشای**

تورک برادەرم بوو. نامەیەکم بۆ نووسی وتم تیازی خەراپەم نیە بەرانبەر بە تورکیە. بەلاّم من خەراپەی ئیران دەکەم و وازی لێ ناهینم. **خەلیل پاشا** وەلاّمی منی داوە وتی تورک ئەتزیان خۆش دەویٚ و ئەگەر تۆ **مار شیمون** بکوژی ئیٚمە پشتگیری شۆرشەکەت دەکەین بە دژی ئیٚران. منیش ئەو کارەم کرد، تورک فیٚلیان لە من کرد.» (٢٨)

هەرچی بیٚ ئەگەر ئەوەشی لیٚ زیاد کەین کە ئاسوریەکان کاتیٚ لە نیٚو لەشکری رووس دابوون کوشتارێکی زۆریان لە کوردان کردوە و دەستیان لە هیچ خەراپەیەک نەگیٚراوەتەوە و وەک دانیال متی دەلیٚ :« هەر وەها نیشانی دەدا کە بوونی ژمارەیەکی زۆر لە ئەرمەنی و ئاسوری لە نیٚو لەشکری رووس دا، ببوە هۆی ئەوە کە رەفتاری لەشکری داگیر کەری قەیسەری توندوتیژ تر بیٚ لە لەشکرێکی داگیر کەر لە کاتی شەر دا. وای لیٚهاتبوو لە کوردستانی ئیٚران منداڵیان بە هاتنی رووسان دەترساند.» (٢٩.)

**سمکۆ** بەم کارە ئەگەر نەخشەی ولاّتەکانی هاو پەیمانیشی بۆ دروستکردنی حکومەتیٚکی ئەرمەن و ئاسۆری لە کوردستان پوچەڵ کرد بیتەوە دیسان ناکریٚ ئەم کارەی ئەو بە کردەوەیەکی دزیٚو و پیٚچەوانەی داب و شویٚنی جوامیٚرانەی کوردانە حیساب نەکریٚ. بەلاّم تۆ بلیٚی لە سیاسەت دا ئەخلاق زۆری گویٚی بدریٚتیٚ؟

## سمکۆ دەسەلاّتی پەرە پیٚدەدات.

پاش دامرکانەوەی ئاژاوەی جیلۆ، هاوینی ساڵی ١٩١٩ **سمکو** بۆ پەرە پیٚدانی دەسەلاّت چالاکی خۆی توندتر دەکات. ریٚگای هاتوچۆی ورمیٚ - تەوریٚز دەخاتە ژیٚر کۆنترۆڵی خۆی. سەرەتای ساڵی ١٩١٩ ( سوپەدار ئەعزەم -سوپا سالار) دەبیٚتە والی ئازربایجان. ئەویش کابرایەکی بە ناوی (ضیا الدولە) دەکاتە حاکمی

ورمێ، ئاو براو دەست دەکات بە چەکدار کردنی خەڵک بۆ بەربەرەکانی **سمایلاغا**. دەروازەکانی شار قایم دەکا و دەبەوی لە شار بەرگری بکا.

سمکۆ دەیەوێ حاکم بدزێ. ٦٠ کەسی چەکدار دەنێرێ کە حاکم لە شار بێننە دەرێ. پیاوەکانی **سمکۆ** بە نەزانی کاتێ دەگەنە دەوروبەری خانوی حاکم، تەقەی دەکەن. چەکداری حاکم و خەڵکی شار لێیان رادەپەڕن. پیاوەکانی **سمکۆ** بە ناچار بە دەستی خاڵی دەگەڕێنەوە. **سمکۆ** لەم سەر نەکەوتنە تورە دەبێ، دەنێرێ ڕێگای گوڵمانخانەش دەگرێ کە تاقە ڕێگای دەریایی نیوان ورمێ - تەوریز بوە. **تاهیر بەگی** پیاوی **سمایلاغا** دەچێتە سەر ئەو ڕێگایەو ورمێ ئابلوقە دەدرێ.

سوپەهداری والی ئازربایجان کە دەبینێ بە شەر دەرۆستی **سمکۆ** نایەو ڕێگای بۆ ناکرێتەوە، **سەردار فاتیح** ناوێک لە گەڵ کونسولی ئینگلیس دەنێرێتە کن **سمکۆ**. هێندێ پارەو شیرنکی جەوهەرداری بە نرخیشی بۆ دەنێرێ و لەقەبی «**سەردار نصرەت**» یشی لە لایەن دەوڵەتەوە پێ دەبەخشێ. **سمایلاغا** بەو مەرجە ئەم لەقەب و دیاریانە قەبوڵ دەکا کە ضیاالدولەی حاکمی ورمێ لابەرن. پاش گەرانەوەی کونسولی ئینگلیس والی پێشنیاری **سمکۆ** قەبوڵ دەکا و حاکمی ورمێ بانگ دەکاتەوەو **سەردار فاتیح** دەکا بە حاکمی ورمێ. حاکمی تازە لە گەڵ کونسولی ئینگلیس بە پاپۆڕ دێن بۆ **گوڵمانخانە**. **سمایلاغا** تا گوندی (میاوە) بە پێشوازیانەوە دەچێ و لە گەڵ خۆی دەیانهێنێتە نێو شار. ئیتر پاش ئەوەی **سمکۆ** دەچێتە نێو شار، هێمنایەتی شار بە چەکدارەکانی خۆی دەسپێرێ و دەست دەکا بە دامەزراندنی تەشکیلات و داموو دەزگای خۆی. لە لایەکی دیکەشەوە دەوڵەت کابرایەک بە ناوی **ئەسەدئاغاخانی فیشەکچی** لە گەڵ پۆلێک **قازاخ** بۆ هێمنایەتی شار دەنێرێتە ورمێ. ناوبراو **لە** شاردا لەگەڵ دەسەلاتی **سمکۆ** بەربەرەکانی دەکا. ڕێگای گوڵمانخانە دەخاتە بەر دەستی خۆی و قازاخی لێ دادەنێ. **سمایلاغا** خەبەر بۆ **سەردار فاتیح** دەنێرێ کە شار بە جێ بێڵێ و نەبێتە هۆی شەر و خوێنرێژی. حاکم گورج بارگەو بنەی تێک دەنێ و بەرەو

تەوریز دەکەوێتە ڕێ. بەڵام کابرایەک بە ناوی ( **عەلی ئەکبەر** خان ) دەکاتە جێگری خۆی. پاش ڕۆیشتنی **سەردار فاتیح**، **سمکۆ** دەنێرێ ( **عەلی ئەکبەر خان** ) دەگرێ و **عومەر خانی** شکاک دەکا بە حاکمی شار و ناوچە بە جارێک دەکەوێتە بەر دەسەڵاتی **سمکۆ**.

کاتێک خەبەری گرتنی شار بە دەوڵەت دەگا، لە شکرێکی زۆر بە سەرۆکایەتی ئەفسەرێکی رووس بە ناوی (**فیلیپۆف**) دەنێرێتە سەر **سمکۆ**. لە مانگی رەشەمەی ساڵی ۱۹۱۹ لە سەڵماس شەڕێکی توند لە گەڵ هێزی **سمکۆ** دەست پێدەکرێ. رۆژی پێنجی رەشەمە لەشکری دەوڵەتی شاری سەڵماس دەگرێ هێزی کورد ناچار بەرەو چیا پاشە کشە دەکا. **فیلیپۆف** وەدوایان دەکەوێ و چاریە گەمارۆ دەدا. هەر چەند هێزی کورد بەربەرەکانی توند دەکا، بەڵام لەشکری عەجەم تەنگیان پێ هەڵدەچنێ و دە یاتخاتە تەنگانەوە. **سمکۆ** کە وادەبینێ تیلگرافێک دەنێری بۆ ( **عین‌الدوله** )ی والی ئازربایجان و ئامادەیی خۆی بۆ وتو وێژ و سە دانواندن رادەگەیێنێ. والی فەرمانی گفتگۆ لە گەڵ **سمایلاغا** دەدا بە **فیلیپۆف**. لە وتو وێژدا دەگەنە ئەو بریارە کە شەڕ رابگیرێ و **سمکۆش** ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەنجام بدا.

۱ - ئەو ئەفسەر و سەربازە تورکانەی لە کن **سمایلاغان** دەریان بکا.

۲ - واز لە دەست تێوەردانی کاروباری ورمێ بهێنێ.

۳ - چەک دابنێ.

٤ - تۆڵەی تاڵان و کوژراوەکانی لکستان بداتەوە.

۵ - **ئەحمەد ئاغای** برای بنێرێتە تەوریز و لەوێ بارمتە بێ.

پاش ئەم بریارو گفتگۆیە شەر دەوەستێ. **فیلیپوف** بۆ تەوریز دەگەڕێتەوە. **سمکۆ** لە جیاتی بردنەسەری پەیمان و بەڵێنی، دەست دەکا بە کۆکردنەوەی لەشکر و سەر لە نوێ **عومەرخانی** دەکاتەوە بە حاکمی ورمێ. بەدوای ئەوەدا **سمکۆ** مەسەلەی « بەگلگی» و سەربەخۆیی کوردستان دێنێتە گۆڕێ و دامو دەزگای

حکومەتی دادەمەزرێنێ. دەسەلاتی خۆی بە سەر ورمێ و سەلماس دا پتەو دەکا. لێرەدا بێ جێ نابێ مەسەلەیەکی خۆشیش لە بارەی مەنتیقی شکاکان و حاکمەتی **عومەرخان** بگێرینەوە. دەڵێن کاتێ عومەر خان دەبێتە حاکمی ورمێ، رۆژێک لە شاری جار دەکێشن کە خەڵک لە باخی قەیسەر خانم کۆ وەبن، حاکم وتار دەداو لە گەڵ خەڵک دەدوێ. لەهەموو لاوە خەڵک کۆ دەبنەوەو چاوەروانن کە حاکم بێ و وتار بدا. رەنگە خەڵک هیوا داریش بوو بێ کە وا حاکم دێت و مزگێنی ئاسایش و هێمنەتیان بۆ دێنێت.!!

**عومەرخان** دێتە نێو خەڵک و دەڵێ: « پێویستە لەم شارە چوار هەزار تفەنگ و چل‌هەزار لیرە کۆ بکەنەوەو بیدەن. شکاکاکانیش دەکاتە مەئموری کۆ کردنەوەی ئەم پارەو تفەنگانە. دەڵێن شکاک کابرای عەجەمیان دەگرت و داوای پارەو تفەنگیان لێ دەکرد. کابرا دەپاراوە دەیگوت نیمە . شکاک دەیگوت : « سەن وێر، قۆی ئۆڵماسن » واتە تۆ بیدە با نەتبێ.!!

کاتێک دەوڵەتی ئێران رێگای هاتوچۆی ورمێ - تەورێزی لێ دەگیرێ، دەیەوێ لە رێگای سابلاخەوە لە شکر بنێرێ. ماژۆر( **مەلیک زادە**) لە گەڵ ٨٠٠ ژاندارم لە رێگای مەراغە و میاندواو سابلاخەوە بۆ سەرکوتکردنی **سمکۆ** دەخاتە رێ.

دیارە لەم کارەدا هیوایەکی زۆریشی بە **قەرەپەپاخی** سندوسی هەبوە. چونکە لە کۆنەوە **شاعەبباس** ئەو **قەرە پەپاخانەی** لە قەفقازەوە بۆ بەرپەرەکانی کوردان هێناوەتە ئەم ناوچەیە، بڵباسی دەرکردوون و ئەوانەی لە جێگای ئەوان نیشتە جێ کردوە و هەمیشە داردەستی حکومەتی تاران بوون دژی کوردەکان. ئەم جارەش بۆ یارمەتی دانی **مەلیک زادە**و لێدانی سمکۆ هەر ئەم حیسابەی کردوە.

کاتێک خەبەری هاتنی **مەلیک زادە** بە **سمکۆ** دەگا، لە پێشدا سەید تەها ئەفەندی دەنێرێ کە قەرەپەپاخی سندوسی چەک بکا. سەید تەها هێشتا ناگاتە

سندوسی لە دزەی دۆڵێ فەرمان دەدا کە **قەرەپەپاخ** نابێ چەکدار بن و پێویستە چەکیان کۆ بکرێتەوە. لێرەدا ناخۆش نیە مەسەلەیەکی تریش لە مەنتیقی شکاکان باس بکەین. **حوسێنخانی** سەرتیپ ئاغای تازە قەڵای **سندوسی**، کە دایکی کورد بوە، لە نێو **قەرە پەپاخان** دا، خۆی بە کورد زانیوەو **هەمیشە** لانی کوردانی گرتوە. کە خەبەر دەزانی ئەوا لەشکری **سمکۆ** بەرەو **مەهاباد** دێت، خۆی و داروودەستەی سوار دەبێ و بۆ پێشوازی لە سەید تەها ئەفەندی دەچێتە دزەی دۆڵێ. سەید تەها ڕێزی لێ دەکرێ و دەینێرێتەوە کە چەکی قەرە پەپاخان کۆ بکاتەوە. کاغەزێکیشی دەداتێ کە خۆی دەتوانی چەکدار بێ و چەک دانەنێ. سەرتیپ دەگەڕێتەو فەرمانی **سەید تەها** بە **قەرەپەپاخان** ڕادەگەیەنێ. لەشکری شکاکان دەگاتە سندوسی و سوارەی پێش قەرەوڵ دێن بۆ ڕادانە و **سەید تەهاش** لە دواوە دێت. حوسێنخان سوار دەبێ و بە پێشوازیانەوە دەچێت بەو نیازە کە سەید تەها داوەت کا، بێتە تازە قەڵاو میوانی ئەو بێ. لە نێزیک گوندی عەجەملیان دەگاتە پێش قەرەوڵی شکاکان. کەدەبینن **حوسێنخان** تفەنگی پێیە، دەورەی دەدەن و یالاّ بێنە ئەو **تفەنگە** و **قەرە پەپاخ** نابێ تفەنگیان پێ‌بێ. حوسێنخان نامەی سەید تەها دێنێتە دەرو دەڵێ: « ئیجازەم لە سەید تەهاوە پێیە» شکاک دەڵێن : « با ئەو کاغەزەت هەر پێ‌بێت. ئێمە کاغەزەکەت لێ ناستێنین، **تفەنگەکەت لێ دەستێنین.**» تفەنگی سێتیر لە شانی **حوسێنخانی** دەکەنەوەو دەگەڕێتەوە .!!

بەدوای ئەوەدا **سمکۆ** لەگەڵ لەشکرێکی پەرداخ دێتە سابلاخ . مەلیک زادە دەگرێ و کوشتارێکی باشیش لە ژاندارمەکان دەکات. دوای ئەم شەڕ و سەرکەوتنە ئیتر عەشیرەتگەلی زەرزاو **مامەش** و پیران و مەنگور ودێبۆکری و بەگزادەو گەورک، مل بۆ دەسەلاتی **سمایلاغا** ڕادەگێشن و لە خۆو سەڵماسەوە بگرە، تا **دەگاتە** بانەو دیواندەرەو سایینقەلاّ، دەکەوێتە بەر دەستی دەسەلاتی **سمایلاغا**.

لە باسی دەسەلاّت و لەشکر کێشی **سمکۆ**، ئاگری لە ئاکار وکردەوەی دزێوی

تالانچیانەو شرەخۆری لە شکری شکاکان چاو بپۆشین. ئەوەی لەشکری شکاک کردوویە، بە هیچ جور لە گەلْ کردەوەو بیرو باوەڕی نیشتمانپەروەری وسەروەری نەتەوەیی یەک ناگرنتەوە. لە سابلاخ و بانەو بۆکان و شوێنەکانی تر کە ڕێیان تێکەوتبێ، بێجگە لە تالانی مالانْ زەلامیشیان رووت کردوونەوە و جل و بەرگیان لێ ئەستاندوون. پتر ئەو کردەوە ناحەزانە بوونەتە هۆی ئەوە کە لە لایەن کۆمەلانی خەلْکەوە پشتیوانی لێ نەکراوە. ئیستاش لە ناوچەی موکریان شکاک بە تالانچی و بە شرە خۆر ناو دەبەن.

دوای گرتنی مەلیکزادەو کوشتاری ژاندەرمەکان لە سابلاخ و پاک کردنەوەی دەسەلاتی حکومەتی تاران ، ئیتر لە شیمالْ و ناوەندی کوردستانی ئیران دەزگای دەسەلاتی **سمکۆ** بە شیوەی عەشایری و بە ناوی دەسەلاتی کورد دادەمەزرێ.

رۆژنامەی کورد

**سمایلاغا** بۆ ئەوەی دەنگی کورد و ئامانجی راپەرینەکەی بە دنیا رابگەیێنێ، سالی ۱۹۱۹(۱۳٤٠) کۆچی رۆژنامەیەکی حەفتەیی بەناوی کورد لە شاری ورمێ چاپ و بلاو دەکاتەوە. وەک لە کلیشەی رۆژنامەکەدا دیارە کە لیرەدا چاپ کراوە، رۆژنامەی کورد هەوەلین رۆژنامە بە زمانی کوردی بوە کە لە کاتی دەسەلاتی **سمکۆ**دا، بە سەر نووسەری زانای بە ناو بانگ **ماموستا مەلا محەمەدی تورجانی** لە ژێر دروشمی( واعتصموا بحبل‌الله جمیعا ولا تفرقوا )لە کوردستانی ئیران بلاو کراوەتەوە. وەک لە کلیشەی رۆژنامەکەدا دیارە، ناونیشانی رۆژنامەی کورد بەم جورە بوە:: « رۆژنامەیەکی سیاسی ئەدەبی ئەخباری‌یە. سەر مەقالەی تەرجومە دەکرێ بە فارسی. دەینووسێ کوردێک بۆ هەموو کوردان»

لە ژمارە یەکی رۆژنامەی کوردا کە لە راستیدا ئورگانی دەسەلاتی **سمکۆ** بوە، وتارێکی درێژ بە کوردی و بە فارسی سەبارەت بە بارو دۆخی ئیران و زولْم و زۆری حکومەتی تاران لە کوردان و بێدەسەلاتی لە بەرانبەر دەولەتی بێگانەدا، بلاو کراوەتەوە. هەر لەم وتارە دا لە بارەی کوردستانەوە دەنووسێ: « هەر

کەسیش دەتوانێ راستی و دروستی ئەم مەسەلەیە بە چاوی خۆی ببینێ کە ولاتی غەدر لێکراوی کوردستان پێ شێل بوە و دیهاتی بە جورێکی وا ویران بوە کە دڵی هەر دڵرەقێک بۆی دەسوتێ. دەولەتی ئیران بەو بێ دەسەلاتی‌یەوە دوای شەڕ لە جیاتی کۆمەگ و یارمەتی ئیدارەی دیکتاتوریانەی خۆی لێ دامەزراندوە. ئەوەی لە دەستی هات بۆ فەوتاندنی ئەو میللەتە لێقەوماوە کردی. داخوا میللەتی کورد ئینسان و مەخلوقی خودا نین؟... لە کوشتن و وێرانکردن بەو لاوە چی لە گەڵ کوردستان کردوە؟... سەرەرای ئەو هەموو زوڵم و زۆری و وێرانیەی کوردستان بێگانەکانیشی هانداوە بۆ وێرانکردنی کوردستان. میللەتی کورد کە لە گیانی خۆی وەرەز بوە، لە تاوی زوڵم و زۆر راپەریوە، پێی دەڵێن هار و یاغی.»( سەروتاری رۆژنامەکە کورت کراوەتەوە)

ئاغای (محمدتمدن) لە کتێبێک دا بە ناوی ( اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه) کە ساڵی ۱۹۷۱ بلاوی کردۆتەوە، سەرەرای ئەوەی‌کە جنێوێکی زۆری بە کورد داوە و گاڵتەی پێکردوە، بەلام ناچار بوە دان بەدەزگاو دەسەلاتی سمکۆ دابنێ و کلیشەی رۆژنامەی کوردیش بلاو بکاتەوە. ناو براو دەنووسێ:« رۆژنامەیەکیان بە زمانی فارسی و کوردی بلاو دەکردەوە. حەوتووی جارێک دەردەچوو. ناوی « رۆژی کورد شەوی عەجەم» بوو. دوایە بوو بە« رۆژی کورد » و ئاخرەکەشی بوو بە « کورد ». پاشان ئاغای «تمدن» دەنووسێ : «سمیتقو» (سمکۆ) بێجگە لە بلاو کردنەوەی رۆژنامەی کوردی (کورد) لە ورمێ رێکخراوێکی بۆ وەرگرتنی گومرگیش دروست کرد بوو. لە هەر شتێکی کە خەڵک لە ورمێ‌را دەینارد یا دەیبرد بۆ شارەکانی تر ( مەراغە، خۆی، تەورێز)گومرگی دەستاند و پەتەی چاپی بە کوردی دەداێ.»

پاشکۆی ژمارە دووی رۆژنامەی کورد لە لاپەری ۳۸.ی کتێبی ناوبراودا بە فارسی بەم جۆرە چاپکراوە:

« هەواڵنوسی ئێمە دەنووسێ : کوژرانی خالۆ قوربان و شکانی لە شکرەکەی

بۆ ئاگاداری خوێنەرانی خۆشەویست روون دەکەمەوە. رۆژی ۲۸ی رەمەزانی ۱۳٤۰ی مانگی لە کاتێکدا کە لەشکری کورد لە ژێر فەرماندەیی **سەید تەها** ئەفەندی لە دەورو پشتی گوندی قوزلوی هەوشار خۆی بۆ پەلاماردانی (سایندقەلاً) ئامادە دەکرد، دوو سواری سەرداری موکری خەبەری دەست درێژی **خالۆ قوربانیان** بۆ سەر سابلاغ و شارویران هێنا. هەر دەستبەجێ بەرەو سابلاغ گەراینەوە.. شەوی ۲۹ی رەمەزان لە بۆکان مانەوە. بەیانی کەوتنە رێ و لە دەوروبەری گوندی (دەرمان) سەرۆک عەشیرەتەکان لە گەڵ **سەید** تەها ئەفەندی کۆری وتو وێژ و راوێژیان گرت. نەخشەی پەلاماردانی لەشکری (**خالۆ قوربان**) یان بەو جۆرە کێشا:« جانگیر بەگ لە عێلی هەرکی، **ئەسکەندەرخان** خەڵکی برادۆست، **هەمزاغا** لە عێلی مامەش، ئەمیر ئەسعەدی دێبۆکری و **سالار سەعید** لە خەتی(لاچینەوە) بچن. بریاریاندا لە بانگی شێواندا لە سێ لاوە پەلاماریان بدەن. ئەمیر عەشایر و **ئەمیر ئەسعەد** و **سالار سەعید** بە پێی بڕیاری گشتی لە تاریک و روونی بەیانی ۲۹ی رەمەزاندا، لەشکری **خالۆ قوربان** یان لە تەپکی داشا مەجید پەلامار دا. لە دوولاوە شەڕ دەستپێکرا. سوارانی کورد رکێف کوت هەڵیان کردە سەر لەشکری عەجەمی بە لولەی تفەنگ لە مەتەرێز وەدەریان نان. هێندێک بە دیل گیرانو هێندێکیش کوژران، ئەوەی دەرچوو بەرەو ئێندرقاش هەڵات بۆ لای **خالۆ قوربان**. سوارەکانی ئەمیر عەشایر( حاجی سطوە السلطنە)ی حاکمی سابلاخیان بە دیل گرت. سوارەکانی **ئەمیر ئەسعەد** مترالوزێکیان وەگیر کەوت. ئەسپ و ئێستر و تفەنگێکی زۆر گیرا. ئەمیر عەشایر و **ئەمیر ئەسعەد** و **سالار سەعید** لە پاش ئەوەی‌لە بە دیل گرتن و کوشتن و راونانی عەجەمەکانی داشامەجید بوونەوە، قۆڵێکی دیکەی لەشکری **خالۆ قوربان** یان لە سەر کێوی خەزایی پەلامار دا. ئەوانیش مەتەرێزیان بە تاڵ کرد و هەڵاتن. هێندێک کوژران و هێندێک بە دیل گیران. لە وێش ئەسپ و تفەنگێکی زۆر کەوتە دەست. کاتێک شکستەی لەشکری گەیشتە

ئیندرقاشی، لەشکری خالْو قوربانی ترسی رنیشت و پاک هەلاتن. ئاغایانی مەنگور وهەرکی و زەرزا، لێیان وەخۆ کەوتن و دایان گڕانێ. **خالْو قوربان و** چەند ئەفسەر کوژران، زۆریش بە دیل گیران. پیاوێکی **سەید تەها** ئەفەندی ٣تۆپ، سوارەی مەنگوڕ تۆپێک، سوارەکانی هەرکی ٢ تۆپی گەورە و مترالیوزیک و ئەسپاب و تفەنگێکی زۆریان بە تالان گرت. هێندێک دەڵێن (سوارەی **ئەحمەدی گولاْویاغای** مەنگور و هێندێکیش دەڵێن **ئەحمەد خانی** هەرکی **خالْو قوربانی** کوشتوە. **شکستەی** لەشکری عەجەم زۆریان گەرانەوە بۆ ولاْتی خۆیان و دوو سەد کەسێکیش چوونە تەوریز. کولونیل **(نصرالله خان)** فەرماندەی ژاندارمە لە ساینقەلاْوە بەرەو موکری وەرێکەوت. بە تەواوی لەم کارەساتە بێ خەبەر بوو. ئەمیر ئەسعەد کە ئەو خەبەرەی بیست، بە پەلە خۆی گەیاندە ئەمیرئاوای تەنیشت بۆکان. کولونیل کە دەگاتە بۆکان و خەبەری کوشتنی **خالْو قوربان** دەزانێ، فیزماڵکی دەداتێ بو ساینقەلاْ دەگەرێتەوە. سوارەکانی بەگزادەو سەرداری موکری وەدوایان دەکەون. **ئەمیر ئەسعەد** و ئاغاکانی دێبۆکری خۆ دەگەیێننە یارمەتی سوارەکانی‌بەگزادە. لە کێوی پشت گوندی ئالْبلاْغ ئۆردوی ژاندارمەری گەمارۆ دەدەن. زۆران دەکوژن و بە دیل دەگرن. دەسکەوتیش گەلێکە. لەو پەلامارەدا «**سولْتان عبدالحمیدخان**» ئەفسەری ژاندارمەری کوژراوە. کولونیل شەوانە لە کێو دێتە خوار و بە لارێدا هەلْدێ. ئاغایانی بەگزادەی فەیزولاْبەگی تۆپێکی گەورەیان گرت و ناردیان بۆ چاریە. بە راستی ئازایەتی و لە خۆ بوردوویی ئاغایانی موکری بۆ جێ بە جێ کردنی ئەرکی نیشتمانی و نەتەوایەتی جێگای سوپاسە. هیوادارم لە رێگای هەقناسیەوە ئەوەی لە رۆژنامە تاقانەکەدا چاپ بفەرموون» . ع. ش.

دیارە ئاغای (تمدن) ئەم باسەی سەبارەت بە تاریف و ئازایەتی کوردان و یا ناساندنی رۆژنامەیەک بە زمانی کوردی لە کتێبەکەیدا باس نەکردوە. ئەو مەبەستێکی دیکەی هەبوە. ئێمە ئەو کورتە باسەمان بۆیە بە پێویست زانی کە

هێندێ لە نووسەرە نائاگایەکانی کوردیش بۆ پەلاماردانی سمکۆ و بێ نەهمیەت کردنی راپەرین و هاوکاری عەشیرەتەکان و جێگای لە مێژووی رزگاریخوازی کورد دا ، تەڵەمی شکاویان دەخەنە کار و لەو پەلامارە نارەوایەدا، رەگەڵ رەوەی دوژمن دەکەون. بە تەولی شاعیری ناوداری کورد هێمن :« هەر دوژمن گەمارۆی ئێمەی داوە، هەر بێگانە بە گژ ئێمەدا هاتوە، هەر زۆردار ویستوویەتی بمان گرێ، بمان کوژێ، بمان کوتێ، تالاّنمان بکا، خاو وخێزانمان وە دەشتێ بخات، و ماڵ و حاڵمان لێ تێک بداو ژیانمان بشێوێنێ. هەمیشە هەر داگیرکەران هێرشیان هێناوەتە سەر نیشتمان و زێدەکانمان و ویستوویانە ولاّتی باو وباپیرانمان لێ داگیر بکەن...کەچی مێژووی زۆرداران بخوێنینەوە، تەماشا بکەین، هەر ئێمە تاوانبارو گوناهکارین. هەر ئێمە پیاو خەراب وبەد ناوین. بۆ؟ چونکە بێهێزین و بێ دەسەلاّتین و قەڵەم بە دەست دوژمنانە .» ( ۳۰ )

جا بەم حاڵە زۆر جێگای داخە کە نووسەری کوردیش بێ لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی کات و زەمان یا بۆ ئافەرینێکی دوژمن ، راپەرینی **سمکۆی** سەردار بە « رێگری و نارەسەن و قسەی بێ تام» دابنێ و تاوانباریشی بکا.!!

نیشتمانپەروەری بە ناوبانگ و ماموستای شاعیرانی موکریان، جەنابی ( **سەیف القضات** ) ئەو دەم لە بەستە شیعری بە ناوبانگی خۆیدا «کوردینە» کە بۆ رۆژنامەی کوردی ناردوە دەڵێ :

« سمکۆی خودا کە داویە بە مە ساحیب و رەئیس
شوکری بکەین بە زار و زمان و دەدان و لێو»
« مەقسودی وی ئەمە، کە هەقی مە بداتە مە
تەکلیفی مەش وەهایە، فیدای بین بە نێرو مێو » ( ۳۱ )

## دیسان لەشکر بۆ سەر سمکۆ

سالی ۱۹۲۱ حکومەتی ئێران لەشکرێکی گەورەی بە سەرزکایەتی ( **ئەمیر ئەرشەدی قەرەداغی**) ناسراو بە (**سامخان**) ئامادە دەکاو دەبنێرێتە سەر **سمکۆ**. وەک (هیدایەت) لە بیرەوەریەکانیدا باس دەکات: « **سامخان** بە سێ هەزار سوارو پیادەوە کەوتۆتە رێ. لە شاری خۆیەش . . ۱۵ ژاندارمەی هەڵگرتوە و (**ئیقبالالدولە**)ی ماکۆیەش بە هەزار سوارەو ڕەگەڵی کەوتوەو هەمووی لەشکرەکە بۆتە . . ۵۵کەس. لە ۲۸ی مانگی سەرماوەزی ۱۹۲۱ دا، لە (**شەکریازی**) لە نێوان سەڵماس و دۆڵی خویناوی لە گەڵ لەشکری سمکۆ **بەرەنگاری** یەک دەبن و شەرێکی توند دەست پێدەکرێ. لە سەرەتاوە کوردەکان لە بەر **لافاوی** لەشکری عەجەم پاشە کشە دەکەن. بەڵام پاش کوشتنی سامخان سەرکردەی لەشکری ئێران، عەجەم تەقەیان تێدەکەوێ و دەشکێن و رادەکەن. **شکاک** دەکەونە دوویان تا نیزیک خۆیە. شاری خۆیەش دەکەوێتە مەترسیەوە.

پاش ئەو سەرکەوتنە ئیتر دەسەلاتی **سمایلاغا** لە کوردستان مسۆگەر دەبێ.

**عومەرخان** لە حاکمەتی ورمی دەخات و **تەیمورئاغای** خەڵکی کۆنەشاری سەلماس دەکا بە حاکمی ورمێ و بناخەی حکومەتەکەی قایم دەکا.

مانگی فیوریەی ۱۹۲۱ رەزاخانی قازاخ بە پشتیوانی ئینگلیز لە ئێران کودیتا دەکا و خۆی دەکا بە فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی ئێران. **هەوەڵین هەنگاوی رەزاخان**، بە هێز کردنی لەشکری ئێران دەبێ. هەر لەو کاتەش دا دەیەوێ مەزن و سەرۆک عەشیرەتانیش لە دەسەلات بخا. بۆ ئەوەی پشتی جەبهەی **سمایلاغا** کز بێت و رێگای تورکیای لێ ببەسترێ، لەگەڵ **مستەفا کەمالی ئەتاتورک** دەکەوێتە وتو وێژ و ۲۵ی ئوکتوبری سالی ۱۹۲۲ لەنێوان ئێران و تورکیادا، بۆ بەر بەرەکانی بزووتنەوەی کورد پەیمانێک واژۆ دەکرێ. » دەوڵەتی ئێران بە سەرزکایەتی **موشیرالدولە** بۆ ئەوەی رێگای یارمەتی دەرەوە لە **سمکو** بگرێت **موعازالممالیک** دەنێرێتە ئانکارا و داوا لە حکومەتی

ئەتاتورک دەکاکە پێکەوە دژی راپەرینی **سمکۆ** دەست بە کار بن و ئانکارا پشتیوانی خۆی لە **سمکۆ** کۆتایی پێ بێنێ. » (٣٢)

**رەزاخان** بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی **میرزا کوچک خان** لە ناوچەی گێلان، دە چێتە ئەو ناوچەیە. پاش شکانی بزووتنەوەی جەنگەڵ کوردێکی کرماشانی کە لەگەڵ **میرزا کوچک‌خان** دەبێ، خۆی تەسلیمی رەزاخانی دەکا. ئەویش دەیبەخشێ، بەو مەرجەی بچێتە کوردستان و بە گژ **سمکۆ**دا بچێ. **خاڵۆ قوربان** کە بە زاراوەی ئێستا دەبێتە جاش، لە گەڵ داروودەستەی خۆی دێتە تەورێز و لە وێوە بەرەو سابلاغ دەکەوێتە رێ. لە گوندی ئیندرقاشی نیزیک سابلاغ خێوەت و بارەگای بە عەرزی دادەدا، بەو نیازە کە پاش حەسانەوە بچێتە نێو شار. **هێزی کوردان** بە سەرۆکایەتی سەید تەها ئەفەندی کە خەبەر دەزانن لەشکری عەجەم گەیوەتە ئیندرقاشی، ئیتر ناهێڵن بحەسێتەوە، هەر بەو شەوە بەسەری دادەدەن. لەشکری عەجەم بە **هیچ** راناگا و دەستی پێ ناکرێتەوە، ئەوەی دەکوژرێ، دەنا رادەکا و لەبەر یەک بڵاو دەبێ. لە موکریان واقاوە کە ( **کاکە سواری مەنگور**) هەڵیکوتاوەتە سەر **خاڵۆ قوربانی** و کوشتوویەتی. بەم بۆنەوە لە موکریان بەیتیان بۆ هەڵبەستوە دەڵێن :

**« خاڵە قوربانی ردێن کلکە کەر - هەسعە لە خەوێ سمکۆت گەیە سەر»**

**« ئافەرین سوارە، سوارەی مەنگوری - لینگیدا خاڵۆ، خاڵۆی سەر بڕی»**

لێرەدا زۆر باسی **خاڵۆ قوربان** کرا و لە جێگاو شوێنی دیکەش نووسەران باسیان کردوە. لام وایە زیانی نابێ کە بزانین ئەم **خاڵۆ قوربانە** کێ بوە و چ کوردێک بوە وا بە گژ کوردا گراوە و سەریشی تێدا چوە. ؟

هەر چەند ئەم کابرا کوردە لە راپەرینی جەنگەڵدا بە سەرۆکایەتی **میرزا کوچک‌خان** بە ئازایەتی ناو بانگی دەر کرد. بەڵام خەیانەت و خۆ فرۆشیەکەی

ئەوەندە نا پیاوانە بوو کە هەموو ئازایەتی و ناو بانگی شوشتەوە و گەیشتە رادەیەک کە بۆ نیشاندانی خزمەت و نۆکەرسیفەتی سەری براوی **میرزا کوچکخانی** شۆرشگێرهەڵدەگرێ و دەیباتە تاران و بە دیاری پێشکێشی **رەزاخانی** قازاخي دەکا. دەڵێن **رەزاخان** لە سەر ئەو هەموو دڵرەشیەی خۆی لەم کارەی **خالۆ قوربان** گرژی و لالوتی نیشانداوە. **عەلی ئەکبەرخانی** سەنجابی( سەردار ناسر) لە تاران لە شەقامی ناسر خسرو توشی **خالۆ قوربان** دەبێ. **چەند کەسیشی** لە دەورو بەری خۆی لە تەکا دەبن. بە زمانی کوردی جنێوی پێدەداو دەڵێ:« تۆ بۆ کورد شەرم و شورەیی. تۆ سەری وەلینیعمەتی خۆت بۆ دوژمن هێناوە.» (٣٣)

دەستەیەک لە کوردەکانی ناوچەی کرماشان بۆ کەتیرە کردن دەچنە کێوەکانی خەلخال و گیلان، سەر دەستەکەیان **خالۆ قوربان** دەبێت. ئەو دەمە راپەرینی **میرزا کوچکخان لە جەنگەڵ** دەست پێدەکا. ئەوان واز لە کەتیرە کردن دێنن و دەچنە نێو راپەرین ومیرزاش چەکیان دەداتێ. سەبارەت بە ئازایی و لێهاتوویی جێگای خۆیان لە نێو راپەرین دەکەنەوە. جیرە و مواجبی باش وەر دەگرن و زوریان ژن دێنن و رادەسپێرن لە ناوچەی کرماشانەوە خزم وکەس وکاریشیان دێن وژمارەی کوردەکان دەگاتە ٧٠٠ کەس. پۆل پۆلیان دەکەن و سەر پەل و سەر دەستەیان بۆ دیاری دەکەن. **خالۆ قوربان** هەر چەند نەخوێندەواریش بوە، لە گەڵ **میرزا کوچکخان و حەیدەر عەموغلی** دەبێتە ئەندامي کومیتەی شۆرشی گیلان. پاش ئەوەی ناکۆکی و کێشە لە نێوان شۆرشگێران پەیدا دەبێ و لە لایەن لەشکری ئێرانیشەوە بە فەرماندەری **رەزاخانی قازاخ، خالۆ قوربان** جیا دەبێتەوەو دە چێتە کن **رەزاخانی قازاخ**.

سەر لەشکر گزپاڵ کە ئەو دەم ئاجودانی **رەزاخان** بوە لە ژمارەی ٦٥ و ٧٤ی ساڵی دەیەمی گۆڤاری خواندەنیهای چاپی تاراندا لەم بارەوە دەنووسێ: « چوار شەمۆ» ١٩ی میزان کۆمەڵێک لە خەڵکی رەشت هاتنە لای حەزرەتی

ئەشرەف(سەردار سوپا) کە ئیجازە وەر بگرن **خاڵۆ قوربان** سەر دەستەی کوردان بێتە خزمەتی. **حاجی محەممەد جەعفەری کنگاوەری** کە یەکێ لە وەزیرانی **خاڵۆ قوربان** بوو دەستی بە قسان کرد و ئیجازەی بۆ **خاڵۆ قوربان** وەرگرت. پاش ماوەیەک **خاڵۆ قوربان** لە گەڵ نیزیکانی خۆی بە پێنج عارەبانەوە گەیشتێ. هاتە ژوور و تفەنگی ماوزەری لە پێش حەزرەتی ئەشرەف دانا. ئەویش تفەنگەکەی دایەوە بە خۆی فەرمووی : من ئەو ماوزەرەی دەدەم بە تۆ کە بێگانە لێت نەستێنێ.

دوای تەسلیم بوونی سەردار سوپا کردی بە سەرهەنگ و کوردەکانی دیکەش هەر یەکە بە گوێرەی پایەی خۆی دەرەجەی نیزامی دایە و هەمووی بەرێکردن بۆ شەری دژی **سمکۆ** لە ئازربایجان.» (٣٤)

## ناردنی خاڵۆ قوربان بۆ شەری دژی سمکۆ

ئاغای **حوسێنی جودەت** کە یەکێ لە روناکبیرە ناسراوەکانی ئێران و خۆی لە تەسلیم بوونی کوردە چەکدارەکانی **گیلان** و ناردنیان بۆ ئازربایجان بۆ شەری **سمکۆ** ئاگادارە، باسەکەمان بە درێژی بۆ دەگێرێتەوە.« کاتێکی **سەردار سوپا رەزاخان** لە رەشت خەریکی راپەراندنی ئیش و کاری کۆتایی پێهێنانی هەرای جەنگەڵ بوو، بریار درا بوو بەشدار بوەکانی راپەرینی جەنگەڵ رێگا بدرێن کێ دەیەوێ لە ئێران بمێنێتەوەو کێش دەخوازێ دەتوانێ بپەرێتەوەو بچێتە باکۆ. پاییز لە ئەنزەلی راگیرا بوو هەر کەس ویستبای دەیتوانی سوار بێ‌و بروا.

خاڵۆ قوربان کە قەولی هاوکاری دابوو بە **سەردار سوپا** دەیویست لەم دەرفەتە کەلک وەر بگرێ و مەرجی هاو کاری لە گەڵ سەردار سوپا پتەو تر بکا. من و یەک لە سەروکە کوردەکانی بە ناوی **خاڵۆ** قەمبەر نارده کن **سەردار**

سوپا که قسەی لە گەڵ بکەین. سەردار سوپاگوتی : بیڤن بزانم خاڵۆ قوربان‌و هاوکارەکانی چی‌یان گەرەکە و پێشنیاریان چیە؟

خاڵۆ قەمبەر کە نەخوێندەوار بوو هیچی نەگوت. من لە وەڵامدا گوتم : خاڵۆ قوربان بە قەول و بەڵێنی خۆی وەفادارە. ئێستاش سێ پێشنیاری هەیە. یەکەم ئەو قورعانەی تۆ وێت داوە ناردوویەتەوە کە بە خەتی خۆت بنووسی و سوێندی بۆ بخۆی کە خەیانەت بە خاڵۆ قوربان و هاورێکانی ناکەی. دووەم کوردەکان چوار مانگە مووچە و بەراتیان وەر نەگرتوە. پارەی پێنج مانگیان بۆ بنێری. سێ‌یەم هاتنی کوردەکان تێکرا و لە دەستەیەکدا دژوارە. رێگا بدەی کوردەکان بە چەکەوە و لە دەستەی جیاوازدا بێنە رەشت.

سەردار سوپا هەر سێک پێشنیاری قەبول کرد. بە سەرهەنگ قەریبی گوت:« برۆ بۆ بانکی شاهی و ۳۰ هەزار تمەن پارەی زیو بێنە. کوردەکانیش با بە دەستەی جیاواز بچن بۆ رەشت. بەلاْم دەستەی شامراد کە ۷۰ کەسە با زووتر بکەونە رێ تا لە گەڵ قازاخان بەرەو جەنگەڵ پێشرەوی بکەن. بە خاڵۆ قوربان بێژە مەحتەلیان نەکا. جل و بەرگیش ئامادەیە و لێرە دەیاندرێتێ. لە بارەی نووسین لە پشتی قورعان بە سەرهەنگ قەریبی گوت : برۆ لە شار ئاخوندێک بێنە. گوتم ئاخوندی ناوێ ئەگەر ئیجازە بدەی من لە پشتی قورعانەکە شتێک دەنووسم و بۆت دەخوێنمەوە ئەگەر پەسندت کرد ، ئیمزای بکە.

سەردار سوپا گوتی: باشە تۆ پێم بڵێ من دەینوسم. قورعانەکەی لێ وەر گرتم، دوو دێرم بە پەواشی بۆ دیکتە کرد، بێ هەڵە نوسی و ئیمزای کرد. خەتەکەی دەخوێنرایەوە. پارەکەمان لە کیسەیەکی خام کرد و گەراینەوە بۆ ئەنزەلی. کوردەکان پارەکەیان دابەشکرد. شامراد ۷۰ کەسی هەڵگرت و بەرەو رەشت کەوتە رێ و لەوێش لە گەڵ هێزی قازاخ رووی کردە جەنگەڵ و دوای کۆتایی هەرای جەنگەڵ دەرەجەی یاوەری‌یان پێ بەخشی. خاڵۆ قەمبەریش لە تەورێز لە شەری دژی لاهوتی دا کوژرێ

**سەردار سوپا** کە دەگەرایەوە بۆ تاران فەرمانیدا کوردەکان هەموو بکەونە ڕێ بۆ زەنگان و **خالۆ قوربانیش** لە گەڵ سەر دەستەکان بێنە تاران.

لە سەر فەرمانی سەردار **سوپا خالۆ قوربان و خالۆ کەریم و خالۆ مراد و خالۆ قەمبەر** دوای بە ڕێکردنی هێزەکەیان بۆ زەنگان چوونە تاران. **سەردار سوپا** بە ترومبیلی سواری ناردنیە قوم بۆ زیارەت. پاشان ئامادەی کردن بۆ شەری دژی **سمکۆ** بۆ سابلاغ و لە زەنگانەوە هێزەکەشیان لەگەڵ خۆ بەرن. لەقەبی ( **سالار زەفەر**)ی دا بە **خالۆ قوربان و خالۆ کەریم** و **خالۆ مرادیشی** کرد بە سەر هەنگ.

سەردار سوپا **ئەمیر مووەسەقی** کرد بە فەرماندەی **گشتی** و سەرۆکی ئەرکانی حەربی هێزی **سالار زەفەر. شازادە روحولا** میرزاشی کرد بە **فەرماندەی تۆپخانە** و بەشی موهەندیسی. لە گەڵ **خالۆ قوربان** و سەرۆکانی کورد بە ترومبیلی سواری بەرەو زەنگان کەوتینە ڕێ. ئەوانەی بە سەرۆکایەتی **شامراد** لە ئەنزەلیەوە هاتبوون ٧٠٠ کەس بوون. **لە گەڵ ئەوانیتر کە** گەیشتبوونەوە زەنگان ببوونە دوو هەزار و سێسەت کەس. بە سواری و بە پێیان و بارگەو بنەوە بەرەو ساینقەلا کەوتینە ڕێ. ڕۆژێ دەمانتوانی شەش فرسەخ **رێگا** ببرین. لە نیزیک ساینقەلا کردیە بەفرو کرێوە و سەرماو سۆڵ. ئەوانەی سوار بوون دەست و لاقیان تەزیبوو هیچی نە دەگرت. ئۆردوی **سالار زەفەر** بە زوڵم و زۆری و کردەوەی نارەوا لە گەڵ **دێهاتیەکان گەیشتە سابلاخی موکری**. نەچوە نێو شار. چونکە هەر هێزێکی چو با نێو شار لە دەست پەلامار دەران رزگار نە دەبوو. ٦٠٠ ژاندارمی مەلیک زادە لە شار کەوتبوونە گیری **هێزی سمکۆ** و یەکیشیان دەر نە چو بوو. ئۆردوی **سالار زەفەر** لە ئەمیراوای سەرووی سابلاخ و لە کێوەکانی ئیندرقاش ئۆردو بەزیکرد. ڕۆژێکی پەیکێک لە لایەن **سەردار ئەسعەدی** کوردستانیەوە هاتە کن **ئەمیر مووەسەق** و رایگەیاند کە **سەردار ئەسعەد** و سەرۆکەکانی کورد دەیانەوێ بێنە لات. ئەمیر مووەسەق

ڕێگای دا. سەردارانی کورد بە سواری و بە چەکەوە بە ڕمبازی و بە تفەنگ هاویشتن هاتن. سەردار ئەسعەد بە نوێنەرایەتی ئامادەیی سوارەی کوردانی بۆ خزمەتی دەوڵەت ڕاگەیاند. ئەمیر مووەسەق سەرنجی ئەوەی دا کە مودارا و خۆشرەفتاری لە گەڵ کوردەکان پێویستە و دەکرێ لە ڕێگای دۆستایەتیەوە دژی سمکۆ کەلکیان لێ وەر بگیرێ.

کوردەکان بە گشتی خەڵکێکی هوشیارن، بەڵام بە قەستی خۆیان ساویلکە نیشان دەدەن. سیاسی و کات ناسن. بۆ ئەوەی هەم دەوڵەت لە خۆ ڕازی بکەن و هەم لایەنی سمکۆش بگرن، سەرۆکە کوردەکان دەهاتنە لای ئەمیر مووەسەق، ئیجازەیان وەردەگرت کە بچنە لای سمکۆ لە بارەی هێز و شوێن و چۆنیەتی وەزعی ئەو ئاگاداری وەدەست بێنن و بێنەوە ڕاپۆرتی خۆیان بدەن. ئەم کوردانەی خزمەتگوزاری دەوڵەت بە پسولەی ڕێگا دەچوونە چاریە مەرکەزی سمکۆ. هەر چی دەیانزانی سەبارەت بە هێزی دەوڵەتی لە سابلاغ بە سمکۆیان دەگوت. لە گەڕانەوەشدا هەرچی لە بارەی سمکۆوە دەیانزانی بە ئەمیر مووەسەقیان دەگوت. ئەم کارەیان ئەوەندە بە ژیری و ساویلکەیی ڕادەپەڕاند کە هیچ کەس نەیدەتوانی لێیان وەشک بکەوێ. لە باری مالیەوە کوردەکان زۆر پارە پەرست و دەست کوشراو بوون. سەبارەت بە ئامادە کردنی پێداویستیەکانی ئۆردوو خۆیان دەگرت. بە پارەی نەغد نەبایە هیچیان نەدەدایێ. چاوە ڕوانی یارمەتی لە کوردان کارێکی بێ جێ و بێ فایدە بوو.

ئۆردوی خالۆ قوربان خەریکی مەتەرێز و سیپە و پەناگا بوو، لە پڕ تیلگرافێک هات کە سالار زەفەر بە خۆیە لەشکرەوە بە پەلە بگاتە تەورێز. کەوتینە ڕێ شەو ورۆژ دەمانکوتا و لە ئیندرقاشەوە بە سێ شەو ورۆژ گەیشتینە تەورێز.

بەڵام ئەم بانگکردنە بە پەلەیە بۆ چیبوو؟ دەرکەوت کە لاهوتی فەرماندەی ژاندارم کراوەتە مەعمور کە لە ڕێگای سەلماسەوە بچێتە سەر سمکۆ. ئەویش لە

جیاتی چوونی بۆ شەڕی **سمکۆ**، بە یارمەتی هێندێ خەڵکی تەورێز ڕاپەڕیوە و لە دەوڵەت هەڵگەڕاوەتەوە. لەشکری **خاڵۆ قوربان** و هێزی سەر تیپ **زەڵەر وددولە** گوشاری **لاهوتیان** کەم کردەوە. سەرتیپ حەبیبوڵاخانی شەیبانیش گەیشتێ و لە سێ لاوە شاریان گەمارۆ دا. هێزی **لاهوتی** خۆی پێ ڕانەگیرا و **لاهوتی** ڕایکرد بۆ لای جوڵفا و لە وێشەوە چوە ڕووسیا.

ڕاپەڕینی **لاهوتی** دەرفەتی دا بە **سمکۆ** خۆی بۆ جەبهەی ساباڵخ پەرداخ و ئامادە بکا. لەو لاشەوە سەردار سوپا فەرمانیدا بە **خاڵۆ قوربان** کە بچێتەوە بۆ ساباڵخ، گەیشتبنەوە ئیندرقاش. شەو خەبەری هاتنی **سمکۆ** بۆ لای ساباڵخ بڵاو بۆوە. بۆ ئامادە کردنی ئازوخە و خواردەمەنی کۆبوونەوەیەک کرا. بڕیاردرا کە من لە گەڵ شەش سواران بچمە میاندوا خواردەمەنی و ئازوخە ئامادە بکەم و بە پەلە بۆ ئۆردووی بنێرم. شەو گەیشتمە میاندوا. بە یارمەتی سەرداری مەراغەیی هێندێ نان و ئاردم ئامادە کرد کە بۆ ئیندرقاشی بنێرم. لە پڕ چەند سوار بە هەناسە بڕکە گەیشتن و ڕاپۆرتیان دا کە **سمکۆ** هێزی **سالار زەڵەری** پەلامار داوە. **خاڵۆ قوربان** کوژراوە و ئۆردوش بڵاوەی کردوە. زۆری پێ نە چوو سەر و کەللەی بریندار و ڕاکردوان پەیدا بوو. وا قاو بوو کە گۆیا **خاڵۆ کەریم خاڵۆ قوربانی** کوشتوە. دوای شکان و بڵاوەی ئۆردوو گەیشتەوە تەورێز. بە دەستووری مەرکەز چەکی قورسیان وەر گرتەوە و بە گوێرەی مەسڵەحەتی ڕۆژ هەموویان چەک نە کردن. چەند ئەفسەری لەشکری ئازربایجانیان ڕەگەڵ خستن کە سەردەستە و لەشکرەکەی بگەیێننەوە تاران و ئاگایان لێ بێت نەکا بچنەوە جەنگەڵ. چونکە کاری جەنگەڵ هێشتا تەواو نە ببوو. بە کورتی گەیشتینەوە تاران، ڕاست بردیانین بۆ **قازاخخانە** و چەکیان کردن ئەفسەرو سەر دەستەکان هەموو گیران. دادگایەک بە سەرۆکایەتی **عبدلاخانی ئەمیر تەهماسبی** بۆ ئەفسەر و سەر دەستەکان پێکهات. **خاڵۆ کەریم و خاڵۆ مراد** بە تاوانی ئەوی کە دەستیان لە کوشتنی **خاڵۆ قوربانا** هەبوە لە مەیدانی مەشق گوللە باران کران. سەر

دەستەکانی دیکەی کورد بە حەپس مەحکوم کران» (٣٥.

لە پەراوێزی ئەم باسەدا پێجێ تابێ بۆ حەسانەوەی مێشک نوکتەیەکی کردەوەی قازاخی رەزاخان لە زمانی ئاغای حوسێنی جودەت بگێڕینەوە: « کاتێ بە فەرمانی سەردار سوپا لەشکری خالۆ قوربان بۆ شەری دژی سمکۆ بەرەو سابلاغ کەوتە رێ، لە زەنگان سوڵتان حوسێنخانی مەهدی موش کە ئەفسەرێکی قازاخ بوو ، کردیان بە بەر پرسی ئامادە کردنی ئازوخە و پەیدا کردنی جێگا و پارە بەر و شتی وا. پارەیەکیشیان دابە بۆ ئەم کارانە. دوایە پێمانزانی کە نیوەی پارەکەی ناردۆتەوە تارانێ بۆ ماڵو منداڵی. لێمان پرسی تۆ چۆن پارەی ئازوخەی ئۆردوت ناردۆتەوە تاران.؟ لە وەڵامدا گوتی: « بەر پرسی ئەم پارەیە منم. ئەم رێگایە ئەمین نیە. ئەگەر پارەی ئۆردو بدزن کێ بەر پرسە.؟ بۆ قایمکاری نیوەی پارەکەم ناردۆتەوە تاران. کاتێ پێویست بوو، تیلگراف دەکەم پارەکە دێتەوە. پارەکە چۆتە جێگایەکی ئەمین.

من پاشان رەفتاری ئەم کابرایەم خستە بەر چاو. لە هیچ مزڵێک نەمبینی کە سوڵتانی ناو براو بەر لە ئۆردو بگاتە نێو گوندی و لە گەڵ ئۆردو لە گوندی دەر کەوێ. هەمیشە دەمایەوە تا ئۆردوو دەروات بەم بیانوە کە حیسابی خەڵک دەدات.

وای لێهات گوندەکانی سەررێگا کە خەبەری هاتنی ئۆردوویان دەزانی خەڵک رایان دەکرد و گوندیان چۆڵ دەکرد تا ئۆردۆ نەرۆیشتبایە نەدەهاتنەوە ئاوایی. ئەفرادی لەشکر برسی و هیلاک کە دەگەیشتنە نێو گوندی بە ماڵان وەر دەبوون و هەر چی دەستیان کەوتبایە دەیانسەندو دەیانبرد. هەر کەسیان دیتبایە هەڵیان دەپێچا کە نان و مریشک و برینج و پەنیر و قەندو چایان بۆ ئامادە بکا. کابرا ئەگەر لە توانای دا نەدەبوو دەکەوتە بەر قامچی و لێدان و ئەشکنجە. هەر سەر بازیش نەبوون کە زوڵمیان دەکرد، ئەفسەرەکان خەراپتر بوون. خۆم شاهیدی رووداوێکی دڵتەزێن بووم. گەیشتینە گوندێک خەڵک هەموو رایکرد بوو. پیرە مێردێک لە ماڵێکدا مابوو. ئەحمەد خانی یاوەر ئەفسەرێکی قازاخ سەردار

سوپا لەگەڵ ئۆردو نارد بووی. پیرە مێردی هەڵپێنچا کە خواردنی بۆ ساز کا. کابرا دەیگوت هیچم نیە. ئەحمەد خان هەڵیکێشا شیری و لە باسکی کابرای داو خوێن فیچقەی کرد. من تۆزێ سەر کزنەم کرد و پێشتر هاو مزڵ بووین، لێی جیا بوومەوە. گوتم کە سوڵتان حوسێنخانی مەهدی موش پاش رۆیشتنی ئۆردو لە گوندی دەمایەوە کە گۆیا حیسابی خەڵک بدا. لە گوندێک ریش سپیان کۆ دەکاتەوە و یەک یەک لێیان دەپرسێ : تۆ چیت داوە بە سەر باز. یەکیان دەڵێ: «مەنێک نان، پێنج سیر قەند، دوو سیر کەرە، نیم سیر چای وجوجکەیەک.»

سوڵتان دەڵێ:« ئەحمەق بۆ چما تۆ نازانی جیرەی سەر باز جوجکە و رۆنی کەرە نیە. تەنیا ١٣ سیر نان و نیو سیر پەنیر و هەشت مثقالْ قەند ودوو مثقالْ چایە.» کابرا دەڵێ بە زۆری سەندوویە. سوڵتان دەڵێ : من تەنیا پارەی جیرەی رەسمی دەدەم. پاش ئەوەی حیسابی دەکەن و سورەتحیسابیان پێ ئیمزا دەکا، ئەسکیناسێکیان بۆ داویت و دەڵێ خۆتان پێکەوە بەشی بکەن. دەڵێن ئێمە ئەم کاغەزە نا ناسین و چۆن بەشی بکەین ؟ سوڵتان ئێژێ کە وایە دوو کەس لە گەڵ من بێنە شار تا وردی کەمەوە. دوو کەس لە گەڵ خۆی دەبات سوڵتان بە سواری و ئەوان پیادە. هیلاک دەبن و لە نیوەی رێگا دەگەڕێنەوە.» (٣٦)

پاش کوشتنی خاڵە قوربانی، رەزاخان کە ببوە سوپا سالاری ئێرانی، لەشکرێکی گەورە بە سەرۆکایەتی سەرتیپ ئەمانوڵلای جیهانبانی دەنێرێتە سەر سمکۆ. وەک سەروان ئەحمەد پووری کاویان دەنووسێ : ئەم لەشکرە بریتی بوە لە ١٥هەزار سوارو پیادەو جاش و تۆپخانە. پاش دوو رۆژ شەری توند، هێزی سمکۆ سەڵماس بەجێ دێڵێ و بۆ لای چاریە پاشە کشە دەکات. لەشکری عەجەم وەدوایان دەکەوێ و چاریە گەمارۆ دەدات. دوای شەرێکی توند سمکۆ چاریەش بە جێ دێڵێ و روو دەکاتە کوردستانی تورکیا. لەشکری عەجەم چاریە دەگرێ، ماڵی سمایلاغا تالان دەکەن و گوندەکەش وێران دەکەن. دوای چوار ساڵ ناوچەی ورمێ‌و سەڵماس دەکەوێتەوە بەر دەستی حکومەتی تاران. سمکۆش

به هێزێکی کەمەوە دەگاتە دیوی تورکیا. حکومەتی تورک چەکیان دەگاو سمایلاغای دەیەنە نیزیک باشقەلاَ لە گوندێک دەست بەسەری دەکەن.

## سمکۆ و حکومەتی تورکیا.

ڕێبەرانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، هەر لە کۆنەوە سەبارەت بە بارو دۆخی جوغرافیایی کوردستان و دابەشبوونی ولاَتەکەیان بە سەر چەند دەوڵەتی دژی کورد دا، بە ناچاری لە کاتی خەبات و تێکۆشاندا پاڵیان وە یەکێک لەو حکومەتانە داوە کە دوژمنی کوردەو بە سەر بەشێکی نیشتمانەکەی دا زاڵە. تەجرویەی تاڵی رابردووش دەری خستوە کە ئەم سیاسەتە قەت سەر نەکەوتوە و هەمیشە بە زیانی بزوتنەوەی کورد تەواو بوە.

سمایلاغای شکاکیش لە سەرەتای ڕاپەرین و دەسپێکی خەبات دا، لە گەڵ حکومەتی تورکیا پێوەندی دەگرێ‌و بۆ بردنەپێشی خەبات دەیەوێ لە ناکۆکی نێوان دەوڵەتی قاجارو حکومەتی تورکیا، کەلک وەر بگرێ. حکومەتی تورکیاش بۆ دژایەتی ئەرمەن و ئاسوری و بۆ گوڕم و فشار بۆ سەر دەوڵەتی ئێران، تا ڕادەیەک یارمەتی سمکو دەدا. بەلاَم پاش ئەوەی ڕەزاخان دێتە سەر حوکم و لە گەڵ تورکیا پەیمانی دژی کورد دەبەستێ، حکومەتی تورکیش هەست بە دەسەلاَت و توانای سمکو دەکا، ئیتر وردە وردە لێی لالوت دەبێ. بەلاَم هەر لەو کاتەشدا دەیەوێ لە نفوز و کەسایەتی سمکۆ لە نێو کوردەکانی کوردستانی خواروو کەلک وەرگرێ و لە ڕێگای سمایلاغاوە عەشیرەتە کوردەکانی کوردستانی خواروو، دژی ئینگلیز هان بدا. بۆ ئەم مەبەستە ئەحمەد تەقی باوەر پێکراوی خۆی دەنێرێتە لای سمکۆ. لە وەلاَمی ئەحمەد تەقی دا سمایلاغا دەڵێ: «ئێستا ئینگلیز زۆر بە هێزە. کێشەو بەربەرەکانی لە گەڵ ئینگلیز بۆ کورد گران تەواو دەبێ. باوەر ناکەم تورکیای زەبوون بتوانێ بە ناردنی هێز دەست بخاتە کاروباری ڕەواندزەوە.

ئەمرۆ چاکترین شت بۆ کورد ئەوەیە کە بزووتنەوەکەمان لە ئێراندا ڕێک بخەین و بوونی خۆمان لە ئێراندا بپارێزین. ئەمە بۆ ئێستامان زۆر باشە. دەتوانین لە دوا ڕۆژدا کەلکی لێ وەر گرین.»

لەم بۆ چوونەدا دەر دەکەوێ کە **سمکۆ** لە سەر تورک زۆر ڕوونبوەو حیسابی بۆ نەکردوە. بڕوای بەوە نەبوە کە تورک بتوانێ هیچ سودێکی بۆ کورد ستانی خوارووی هەبێ. کاتێک **ئەحمەد تەقی** دە چێتە کن **سمایلاغا** و دەڵێ :« مەفرەزەی تورکان وا دەچێتە ڕەواندز» **سمکۆ** گرژ دەبێ و تێکدەچێ. بەڵام هیچ ناڵێ.

گوتمان **سمکۆ** لە گوندێکی ئەرمەنیان لە نیزیک باشقەڵا وەک دەس بەسەر دەژیا. ڕۆژێک تورک **ئەحمەد تەقی** و ڕەشید جودەتی دەنێرنە لای. داوای لێ دەکەن کە بچێتە (وان)و چاوی بە فەرماندەی هێزی تورک بکەوێ. **سمکۆ** دەچێتە وان، میوانی فەرماندەی سوپا دەبێ. فەرماندە هەزار لیرەو چەند تفەنگ و تەقەمەنی دەداتێ و پاشان پێی دەڵێ: « حکومەتی ئەنقەرە بڕیاری داوە هەزار سەربازی تورک بە جلی کوردییەوە بخاتە ژێر فەرمانت، بچیەوە ئێران و لە وێشەوە بچیە عیراق و دژی ئینگلیز یارمەتی **شێخ مەحمود** بدەی.» **سمکۆ** ئەم بڕیارە بە خۆشی وەردەگرێ. بڕیار دەدەن **سمکۆ** بچێتەوە باشقەڵا و چاوەڕوانی ئامادە بوونی چەک و عەسکەر و قۆرخانە دەبێ. مەرجێکی فەرماندەی سوپاش ئەوە دەبێ کە **سمکۆ ئەحمەدئاغای** برای وەک نوێنەری خۆی لە تورکیا بێڵێتەوە. فەرماندەی سوپا هەزار عەسکەر ئامادە دەکاو دێتە باشقەڵا کن **سمایلاغا**. ڕاست لەو کاتە دا کە لە کن **سمکۆ** دانیشتوە، لە لایەن **مستەفا کەماڵەوە** بروسکەیەکی پێدەگا، لەم بروسکەیەدا، **مستەفا کەماڵ** پێی ڕادەگەیێنێ کە :« باری سیاسی نێو دەوڵەتان وای لێکردین کە فەرمانتان بدەینێ جوڵانەوەی **سمایلاغا** وەدوا بخەن. خۆتان و عەسکەرەکان بچنەوە مەرکەزی ویلایەت.» (٣٧)

لەم پێوەندی‌یەدا **سمایلاغا** گوتوویە :« هەرگیز هەلی ئاوامان بۆ هەڵناکەوێتەوە. هەر ئەوەندە زەحمەت بوو ، تا گەیشتباینە وە چاریە. بەلاّم بەخت و شانس یاریدەی نەداین. وادیارە تورک وەک نۆکەر تەماشای کورد دەکەن و دەیانەوێ بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان یاریمان پێ بکەن . »(٣٨)

گەلێک بەڵگەو دوکومێنت بە دەستەوەن کە تورک قەت بڕوایان بە **سمکۆ** نەکردوە. و لە بەهێز بوون و پەرەگرتنی دەسەلاتی ترساون. بێجگە لەوە، کاتی لە گەڵ ئێران دژی کورد، یا بەقەولی خۆیان« عەشایری سەر سنور» پەیمانیان بەستوە، تورک هەستیان بەوە کردوە کە کوردەکانی تورکیاش بە ڕاپەڕینی **سمایلاغا** هیوادار بوون و پێوەندی پتەویان لە گەڵ دامەزراندوە. سەیرێکی نامەی فرماندانی جەبهەی ڕۆژ هەلاّتی تورکیا و سەرۆکی ئەرکانی جەنگ بکەین، بە ناوی « بەسری بەگ » کە بۆ «ئۆزدەمیر»ی نووسیوە. **بەسری بەگ** دەنووسێ : **لە دیار بەکرەوە بۆ ئۆزدەمیر قائمقام** «

١٤/٦/٣٣٨ رۆمی. استخبارات ژمارە ١٧٤٥. لە دیار بەکرەوە بۆ ئۆزدەمیر بەگ قائم مقام :

١ - **سمکۆ** کابرایەکی فێڵ بازە. بە هۆی زرنگی خۆیەوە ئەو خەنجەرەی کە هەڵیگرتوە بۆ کاتی خۆی، دەیشارێتەوە. ئەم پیاوە بیری سەر بەخۆیی (استقلالی) لە مێشکدایە. مەبەستی ئەوەیە تا ئەو کاتەی لە ئێراندا دەسەلاتی زیاد نەکاو بە هێز نەبێ لە گەڵ ئێمە تێک نەچێت‌و بەم جۆرە بە مەرام و ئامانج بگات.

٢ - سەرکەوتنی **سمکۆ** لە ناو عەشایری کورد و بەمجورە گەورە بوونی و دەسەلاّت پەیدا کردنی بۆ حکومەتی میللی ئێمە دەست نادات. بەلاّم لەم ڕۆژەدا تێکچوونیشمان لە گەڵ **سمکۆ** باش نیە. ئەگەر بتوانین و هەوڵی ئەوە بدەن کە بە پروپاگاندە و بلاّو کردنەوەیەکی‌وا کە عەشایر پێی تەفرە بخوا و بیانکەین بە دوژمنی **سمکۆ** بە ڕاستی‌یەم کردەوەیە خزمەتی گەورە بە حکومەت دەکەین.

وەک ئەوە کە بلێن : **سمکۆ** بە پارەی ئینگلیز ئەم شۆرشە دەگێرێ و بۆ قازانجی خۆی و خزمەتی ئینگلیز خوێنی کوردان دەرێژێ... » بەناوی قوماندانی جەبهەوە - سەرۆکی ئەرکانی جەنگ - **پەسری.**» (٣٩)

وادیارە نامەی **پەسری پەگ** بۆ پروپاگاندەی دژی **سمکۆ** کاری خۆی کردوە. نوزدەمیر لە رەواندزەوە رۆژی ١٢/٧/٣٣٨ی رۆمی نامەیەک بە ژمارەی ٢١ بۆ قوماندانی جەبهەی جزیرێ دەنێرێ و دەنووسێ:

« راکردنی سەربازە جزیرییەکان ئێمەی خستە هەڵوێستێکی گرنگەوە، ئیتر ئەوانەی بۆ ئینگلیز هەوڵ دەدەن و پروپاگاندەی بۆ دەکەن رێیان بۆ کرایەوە تا خەتی تیلگرافیشیان هەڵبڕی. بە هۆی کرێنی ولاغە بەرزە وە لەم سنورەدا دەست نەکەوتنی، هیوای رێکخستنی هۆی گواستنەوەشمان نەماوە. نوێنەرەکانمان بە دەستی بەتاڵ گەرانەوە.( **پاپەکری سەلیماغاو شێخ محەمەد ئاغای باڵەک**) و هێندێ لە پیاوەکانی **سمکۆش** زۆر بەر بەرەکانیمان دەکەن و بۆ سەرکەوتنی ئینگلیز هەول دەدەن و پروپاگاندە دەکەن . ئینگلیزەکانیش بە بارەش روپیە بلاو دەکەنەوە... » (٤٠)

ئەم ترس و بێ باوەڕی تورک بە **سمکۆ**، لە گەڵ بلاو بوونەوەی ناو بانگ و دەسەلاتی، وا لە تورک دەکات کە پەلاماری بدەن وسەرکوتی بکەن. لەو پەلامارە دا، خێزانی دەکوژرێ و **خسرەوی** کوری بە دیل دەگیرێ و دارو نەداری بە تالان دەچێ و هیچی نامێنێ. **سمکۆ** روو دەکاتە کوردستانی خواروو، لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩٢٣ دەچێتە سولەیمانی و لە لایەن **شێخ مەحمودی** حوکمدارەوە، وەک سەرۆک دەوڵەتێک پێشوازی لێ دەکرێ. بۆ رێز گرتن لە **سمکۆ** حەوت تۆپ دەتەقێنن و جەماوەری سولەیمانی بۆ پێشوازی لە قارەمانێکی کورد لە شار وەدەر دەکەون. چوونی سمایلاغا بۆ سولەیمانی و دیداری لە گەڵ شێخ مەحمود کزنە پەرستی ناوچە نیگەران دەکا. رۆژنامەی (**اتحاد**) چاپی تاران ١٧/ژانویەی ١٩٢٣ وتاری کابرایەک بلاو دەکاتەوە بە ناوی (**ابراهیم حیلمی**)

که له رۆژنامەی (المفید)دا بلاّوی کرد بۆوە و له سەر راپەرینی سمکۆ دەنووسیٚ:

« مەسەلەی کوردستان تەنیا چەکیٚکە بە دەست دەوڵەتە سەرمایە دارەکانی رۆژ ئاواوە کە دەیانەوی لە ئاسیای ناوەندی ئیسلام لەت بکەن. پاشان کابرا باسی راپەرینی سمکۆ دەکا و دەنووسی: بۆ چی ئیٚران و تورکیا کە عیراق فەرمانبەردارە ناتوانن ئەم بزوتنەوەیە لە بەین بەرن وکۆتایی بە تیٚکۆشانی نهیٚنی سمکۆ بیٚنن؟ ئیٚران بە بوونی سمکۆ لە سولەیمانی زۆر شپرزەیە کە دەیانەویٚ دەوڵەتی کوردی دابمەزریٚنن. بەلاّم کوردەکان سەیری دوا کەوتوویی خۆیان ناکەن کە شایانی ئازادی نین. و ئیٚستا هەل و مەرج بۆ ئەوە ئامادە نیە. ناکریٚ کوردستان لە گەڵ لهستان وەک یەک سەیر بکریٚت. بزوتنەوەی ئیٚستای کوردەکان بەرژەوەندی لەشکری شەش لە ولاّتەکانی رۆژ هەلاّتی ئەنا دۆڵ و ئاسوریەکان لە سەرووی عیراق و ئازربایجانی خواروو دەپاریٚزیٚت. سمکۆ و شیٚخ مەحمود لە سیاسەتی ولاّتانی رۆژ ئاوا تیٚ ناگەن و لە کاتی ئیٚستا دا وەدەست هیٚنانی سەر بە خۆیی ئیمکانی نیە.» (٤١)

نەک هەر ئەوە بەڵکو بە چوونی سمکۆ بۆ سولەیمانی دەوڵەتی ئیٚرانیش کیٚچی دەکەویٚتە کەوڵی. لازاریٚف لەم بارەوە دەنووسیٚ:« راپەرینی سمکۆ و دریٚژە پیٚدانی تیٚکۆشانی بوو بە بابەتی وتو ویٚژی نیٚوان باڵیۆزی ئینگلیز (پیٚرسی لورین) لە تاران لە گەڵ حکومەتی ئیٚران. قەوام السلطنە سەرۆک وەزیری ئیٚران لە بوونی سمکۆ لە سنورەکانی ئیٚران و عیراق و لە چوونی بۆ سولەیمانی و پیٚوەندی لە گەڵ سەید تەهاو شیٚخ مەحمود زۆر نیگەران بوو. ١٩٢٢/١١/٢٩ تاران لە یاد داشتیٚکی تایبەتیدا داوای لە ئینگلیز کرد کە دژی سەید تەها و سمکۆ هەنگاوی گرنگ باویٚژیٚ. لە وتو ویٚژیٚکی تردا قەوام داوای لە (پیٚرسی لورین ) کرد کە ئینگلیز سمکۆ بگریٚ و بیداتەوە بە ئیٚران. باڵیۆزی بەریتانیا لە وەلاّمدا دەڵیٚ: بەریتانیا ناتوانیٚ هەڵسورانی سمکۆ کونترۆڵ بکا. لە نیٚوان ئیٚران و عیراقیشدا قەرار دادی دانەوەی پەنا بەری سیاسی نیە.

لورین نەیتوانی ئێران قانیع بکا کە بەریتانیا دەستی لە راپەرینی سمکۆ و رێبەرانی جیاوازی کورد دا نیە. قەوام لە یادداشتێکدا راستەو خۆبەریتانیای بەوە تاوانبار کرد کە یارمەتی پارە و چەک بە سەید تەها دەکات. ئێران پێی لە سەر ئەوە دادەگرت کە سەید تەهاو سمکۆ بە یارمەتی ئینگلیز خۆیان بۆ راپەرینێکی تازە ئامادە دەکەن. لورین هەموو ئەو بوختانانەی رەتکردەوە. بەلاّم بەڵێنی دا کە پێشی دەست تێوەردانی سمکۆ و سەید تەها بگرێ لە نێو عەشیرەتەکانی کوردستانی ئێراندا. لە سەرەتای ژانویەی ۱۹۲۳ وتو وێژێکی هەموو لایەنە لە نێوان قەوام و لورین لە بارەی مەسەلەی کوردە وە دەست پێکرا. سەرەک وەزیری ئێران پشتی ئینگلیزی گرت لە مەسەلەی موسڵ دا بۆ ئەوەی ویلایەتی موسڵ نە درێتەوە بە تورکیا. لورین رایگەیاند کە نە دانەوەی ویلایەتی موسڵ بە تورکیا بە قازانجی ئێرانیشە. ئێران دەبێ لەم مەسەلەیەدا یارمەتی بەریتانیا بکا. بەریتانیاش بۆ ئارام کردنەوەی کوردستانی ئێران هەنگاو دەنێ.» (٤٢)

وا دیارە مەسەلەی کورد و کوردستان لە نێوان دەوڵەتەکانی ئیستیعماری و حکومەتە دەستنێژەکانیاندا هەمیشە جێگای سەوداو مامڵە بوە و لە چوار چێوەی بەرژەوەندیی خۆیاندا چاویان لێکردوە و تا ئێستاش ئەم سیاسەتە چەپەڵە بەر دەوامەو بە داخەوە مەسەلەی کورد تۆپ تۆپێنێ پێدەکرێ.

**سمایلاغا** ماوەی مانگێک لە سولەیمانی دەمێنێتەوە. ۱۹۲۳/۲/۲۳ ئینگلیزەکان بە فڕۆکە بەیاننامە بە سەر سولەیمانیدا بلاّو دەکەنەوەو داوا لە سمکۆ دەکەن کە سولەیمانی بە جێ بێلێ. وادیارە لەگەڵ شێخ مەحمود بە تەواوی ناگەنە یەک بە تایبەت ئەو دەم شێخ مەحمود لە گەڵ تورکان پێوەندی دادەمەزرێنێ و کەسانی تورک خوا لە دەوری شێخ مەحمود لە هاتو چۆ دا دەبن. سمکۆ ئەو دەم لەسەر ئەو بڕوایە بوە کە حکومەتی تورک ئەو هێزەی نەماوە و جێگای بڕواش نیە کە کورد بتوانێ پشتی پێ ببەستێ. بە ناچار سولەیمانی بە جێ دێلێ و دەگەڕێتەوە.

# سمکۆ و ئینگلیز

سمایلاغا لە گەڵ دەسپێکی خەبات و تێکۆشان هەوڵ دەدا لە گەڵ حکومەتی بەریتانیا پێوەندی بگرێ و بەڵکوو بتوانێ پشتیوانی ئینگلیز بۆ لای خۆ رابکێشێ. لە مانگی بانەمەری ساڵی ١٩١٩ سەید تەهای شەمزینی کە باوەر پێکراو وهاوکاری بوە، دە نێرێتە بەغدا، تا لە گەڵ نوێنەری دەوڵەتی ئینگلیز پێوەندی بگرێ. سمکۆ پێشنیاردەکاکە دەوڵەتی بەریتانیا بۆ یەک گرتنەوەی کوردستانی ئێران و عیراق و سازکردنی دەوڵەتێکی کوردی پشتیوانی لێ بکا. دیارە سەید تەها پێشتریش لە گەڵ ئینگلیزەکان پێوەندی هەبوەو بڕواشیان پێ کردوە. پاش چاو پێکەوتنیان لە بەغدا، ئینگلیزەکان رووی خۆش بە پێشنیاری سمکۆ نیشان نادەن، سەید تەها بە ناهومێدی دەگەڕێتەوە.

ساڵی ١٩٢١ سمکۆ حکومەتی ئینگلیز لە گەڵ چاو پێکەوتنی سمکۆ و لە شاری شنۆ هاودەنگ دەبێ . دیارە ئەوە لە کاتێک دابوە کە حکومەتی ئێران ویستوویەتی پەیمانی وثوق‌الدولە لە گەڵ ئینگلیز هەڵوەشێنێتەوە. دەوڵەتی ئینگلیز ویستوویەتی لە رێگای سمایلاغاوە گوڕم بخاتە سەر حکومەتی ئێران. ویلسون نوێنەری ئینگلیز لە رێگای بابەکراغای پشدەری‌یەوە لە گەڵ سمکۆ پێوەندی دەگرێ و ئەم پێوەندی و ئاخافتنی نێوانیان سێ مانگ درێژەی دەبێ. بەڵام دوای کودیتای رەزاخان و سەرەک وەزیریی سەید ضیاالدینی طباطبایی کە دەستکردی ئینگلیز بوە، ئیتر پێوەندی سمکۆ و ئینگلیز بەرەو ساردی دەچێ.

یەحیای دەوڵەتابادی لە بیرەوەری‌یەکانی خۆیدا دەنووسێ: « هەر چەند ئینگلیز ماوەیەکە دەیەوێ لە نێوان رووسیاو تورکیا و ئێراندا کوردستانی سەر بە

خۆ پێک بێنێ و بیخاتە ژێر چاوە دێری بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆی. بەلاّم ڕاپەراندنی ئەم نەخشەیە بۆ ئێران و تورکیا زیانی هەیە. چونکە کوردستانی ئێران و تورکیاش بە کوردستانی گەورەوە دەلکێنێ. لەو کاتەدا کە تورک دوای تێکدانی دەوڵەتی ئالی عوسمان و خەلافەتی ئیسلامی گیانی شۆڕشگێڕی دێتەوە بەر، بردنە پێشی سیاسەتی سەر بەخۆیی کورد لە لایەن تورکیاوە توشی تەنگ و چەڵەمە دەبێت. لە لایەن ئێرانیشەوە ئینگلیزەکان کە لایەنگری پێشکەوتنی کاری سەردار سوپان و نایانەوێ دڵی بشکێنن، مەسەلەی سەر بەخۆیی کوردستان دەخەنە پشت گوێ و لە بیری دەبەنەوە. لەو کاتەدا حکومەتی نیزامی ئێمە لە کوردستاندا بە خێرایی نفوز دەکا و لە گەڵ تورکیش لە مەسەلەی کوردستاندا ڕێک دەکەوێ و هیچ سیاسەتێکی بێگانەش پێشی ناگرێ.» (٤٣)

لەم قۆناخەدا ڕاپەڕینی کوردەکان بە لای بەرژەوەندی ئینگلیز دابوە. سیاسەتی بەریتانیا لە بەرانبەر کوردەکاندا لە کۆنفرانسی مارسی ١٩٢١ی قاهیرەدیاری کرابوو. لەو کۆنفرانسەدا بڕیار درابوو کە کوردەکان لە ژێر چاوەدێری ڕاستەخۆی ئینگلیز لە خود موختاریەکی ناوچەیی کەلک وەر بگرن.

« ... ئینگلیزەکان لە دوو بارەوە ویستیاری پێکهاتنی دەوڵەتێکی کوردی بوون. یەکەم بوونی دەوڵەتێکی بە هێزی ئێوا ن

ئێران و عیراق بە قازانجی ئەوان بوو. دووەم گوشاری تورکیا لە باکوور و بەر هەڵستکاری نێو عیراق دژی بەریتانیای کەم دەکردەوە. ئینگلیزەکان لە پشتیوانی سەر بەخۆیی کوردەکانی عیراق بەرلە هەمووشت تەئسیری ئەم کارەی لەسەر کوردستانی ئێران لەبەرچاو بوو. لەبەر ئەوە تێکۆشانی سمکۆ لە ئازەربایجان ودەرەتانی وەدەست هێنانی جۆرە سەر بەخۆییێکی بێ بەر هەڵست لەم هەرێمە جێگای سەرنجی کاربەدەستانی ئینگلیزی بوو. سێر پرسی کاکس کومیسیۆنەری بەرزی بەریتانیا لە بەغدا لە ١٤ی ئوکتۆبری ١٩٢١. ٢٢ی ڕەزبەری . .١٣٠ دا بۆ لۆرین باڵیوزی بەریتانیا لە تارانی نووسی: مەسەلەی دەکرێ ئەم ئیمکانەش

لەبەرچاو بگیرێ کە ئەگەر دەوڵەتی ئێران نەتوانێ دەسەلاتی بۆ سەر ورمێ بگێڕێتەوە. بۆ شێوەیەکی وەک پشتکۆ مل راکێشێ. واتە بۆ سەقامگرتوویی جۆرە نەزم و یاسایەک کە ئەنجامەکەی دەزێتە داوەزرانی کوردستانێکی سەر بەخۆ لە ژێر چاوە دێری بەریتانیادا .» ( ٤٤ )

لە مانگی ئوتی ساڵی ١٩٢١ سیر پیرس کاکس نوێنەری ئینگلیز چاوی بە سمکۆ دەکەوێ. لەم چاو پێکەوتنەدا سماڵاغا دەپرسێ:« ئایا لە نێو چوونی تاج وتەختی قاجار بۆ کورد مەترسی تێدا نابێ؟ جگە لە مە کورد ئێستا پێویستی بە چەک و کەرستەی شەر هەیە، داخوا دەوڵەتی بەریتانیا لەم بوارەدا یارمەتی کورد دەکا؟» دیارە وەلامی لەبار وەر ناگرێتەوە. چونکە لە مانگی ئوکتوبری ئەوساڵەدا، دەوڵەتی ئینگلیز بە بیانووی ئەمە کە گۆیا دەوڵەتی ئێران ئاگاداری پێوەندی نێوان ئینگلیزو سمکۆ بوە، رادەگەیێنێ کە هیچ نوێنەرێکی ئینگلیز بۆ وتو وێژ لە گەڵ سمکۆ ئامادە نابێ.

سماڵاغا جارێکی دیکەش لە رێگای مستەفا پاشا یاملکییەوە نامەیەک بۆ نوێنەری بەریتانیا دەنێرێ و دەنووسێ:« بە ناردنی سەید تەها بەڵێن بە ئێوە دەدەم کە ئەگەر حکومەتی بەریتانیا یارمەتی بکا و چەک وقۆرخانەمان بداتێ و پشتیوانیمان لێ بکا و مەرجەکانی ئێمە قەبوڵ بکا، ئێمە (وان و ئەرزە رۆم و هەکاری و بیتلیس )لە تورکە ناسیونالیستەکان پاک دەکەینەوە و دەتوانین ئانکاراش بگرین. ئەگەر حکومەتی ئینگلیز دژمان نەوەستێ دەتوانین سنەش بگرین .»

تەقەلای سمکۆ بۆ راکێشانی پشتیوانی بەریتانیا بێ فایدە بوو. چونکە پاش ئەوەی ئینگلیز لە ئێران پیاوی خۆی هێنا سەر کار، ئیتر بەجارێک مەسەلەی کوردی خستە لاوە. دوای چوونی سمکۆ بۆ عیراق و دیتنی ئینگلیزەکان، ئیتر دوو روویی و درۆزنی ئینگلیزی بۆ دەر دەکەوێ و دەزانی پشت بەستن بە ئینگلیز خێری تێدا نیە. سمکۆ لە کوردستانی عیراق، لە گوندی (بەحرەکە)ی نیزیک

هەولێر چاوی بە ( کاپیتان لاین و ادموندز)ی ئینگلیزی دەکەوێ. ادموندز لە بارەی ئەم چاو پێکەوتنەوە دەنووسێ:« لە ئاخری مانگی ئوکتوبردا بە هاتنی کوتوپڕ و بێ ئاگاداری سمکۆ بۆ (دێر) لە ١٨ کیلۆ میتری هەولێر، ڕەوتی ڕووداوەکان گۆڕانی بەسەرداهات. سمایلاغا لە شۆڕشێکدا کە دەیویست ڕەنگی ناسیونالیزمی کوردی لێ بدات، لە ئێران دوور کەوتبۆوە. تەواوی ناوچەی سەر سنور لە دیلمانەوە تا دەگاتە بانە کەوتبوە بەر پەلاماری بە هەوڕای هێزەکانی تورک و ئەرتەشی ئێران لە ڕۆژ ئاواو ڕۆژ هەلاتەوە کە ئیسلاحاتی ڕەزا شا زیندووی کرد بۆوە. سمکۆ تۆپ و چەک و جبەخانەی نەمابوو. خێزانی کوژرا بوو، کوری خۆشەویستی شەش ساڵەی بە دیل گیرا بوو. بۆ وەر گرتنی یارمەتی هاتبوە عیراق. لە وە نارەحەت و سەری سور مابوو کە رێگایان نەدابوو بێتە هەولێر. ڕۆژی شەشی توامبر لە گەڵ (لاین) چووینە گوندی( بەحرەکە.) سمکۆ گوتی :« زۆر لە ئێرانیەکان توڕەو دڵشکاو نیم. چونکە لە دەستی ئەوان چەندەم وێکەوتوە، ئەوەندەشم لێداون. بەڵام دەمەوێ لە گەڵ تورک حیسابی خۆم پاک کەم کە بەڵێنیان پێدابووم یارمەتیم بدەن و پاشان پشتیان تێکردم.» سمکۆ گوتی بەو هیوایە هاتبووم کە ئێوە ئامادە بن لە ئازادی کورد کە بندەستی دوو حکومەتی دوژمنی نێوەن پشتیوانی بکەن. ئەگەر بە هەلە چوە نایەوێ داوای یارمەتی پەنا بەری لە ئێوە بکا. دەگەڕێمەوە بۆ نێو تایفەی خۆم و بە تەنیا خەبات و تێکۆشان درێژە پێدەدەم.» ( ٤٥ )

دوای ئەم چاو پێکەوتنە سمکۆ بە ئەحمەد تەقی گوتبوو:« لە عیراق بە باشی بۆم دەرکەوت کە ئینگلیز فریومان دەدات بەڵام چبکەم لە دەست هێندێ لە گەورە پیاوانمان. وەک سەید تەها و بابەکری سەلیماغا و زۆری دیکەش کە باوەڕیان بە ئینگلیز هەیە.» وەک لە هێندی نووسراوە دەردەکەوێ سمکۆ لە گەڵ ڕووسانیش پێوەندی گرتوە. کونسولی ڕووس لە ورمێ لە وەڵامی سمکۆدا گوتوویە :«داوای سمایلاغا لەگەڵ سیاسەتی ئیمڕۆی ئێمە ناگونجێ'وناشمانەوێ

دروی لە تەکا بکەین »

ئەگەر ئەوە راست بێ داوای ئەو دەمی سمکۆ لە سوڤیت، کارێکی تەواو نەبوە. چونکە ئەودەم سوڤیت پشتیشۆرشگیرانی جەنگەڵی لە ئیران پەردا بوو، کوماری سوسیالیستی گێلان سەری تێدا چووبوو.

## ئەنجام

هەروەک لە سەرەتادا باسمان کرد، مێژوو نووسانی کورد بە داخەوە خۆیان زۆر بە شیکردنەوەی راپەڕینی سمکۆوە ماندوو نەکردوە. بەڵام زۆربەی مێژوو نووس و نووسەرانی شوڤێنیزمی فارس لە سەر راپەڕینی سمکۆ نووسیویانەو بە رێگر و پیاو کوژ و تالانچی ناویان بردوە. کە سەرەوی مێژوو نووسی بە ناوبانگی ئێرانی لە بارەی راپەڕینی سمکۆوە دەنووسیێ: « عوسمانیەکان کوردە سنور نشینەکانیان هان دەدا تا خەڵک بکوژن وگوندەکان تالان بکەن. کوردیش هەمیشە لە کاری ئاوا دەگەرێ. سمایلاغای شکاک یەکێ لە پێشقەرەوڵی ئەو تالانچیانە بوو کە بە تۆڵەی کوشتنی جەعفەرئاغای برای دەستی بە خوێنی بێ گوناحان سوور کرد. »

وەک دەبینین بە درێژایی مێژوو شۆڤێنیزمی نەتەوەی باڵادەست بۆ بەدناو کردنی کورد لەم چەکە ژەنگاویە و ژاراویەی وەک (رێگر و تالانچی و هاندراوی بێگانەو جیاوازیخواز) و بەیت و باوی ئاوا پرو پوچ کەلکیوەر گرتوە. بەڵام بە پێچەوانەی بوختان و دروی نووسەرانی بێگانە، سمکۆ لە سەر دەمی خۆیدا پیاوێکی ژیر و تێگەیشتو وخاوەن کولتور بوە.

هێشتا لە ساڵی ١٩١٢ و سەرەتای ١٩١٣ لە گەڵ عبدالرزاق بەدرخان لە شاری خۆیە کۆمەڵەی پەروەردەیی گێهاندن)ی دامەزراندوە. چیرکۆف یاریدەدەری کونسولی رووس دەڵێ:« ٢١ی ئوکتوبر سمایلاغای سمکۆ ٢٩ منداڵی کوردی لە خۆیە و چیاریک و سۆما و برادۆست و خۆیداد کۆ کردەوە. پاک و تەمیز و خنجیلە جل و بەرگی نوێی ئورووپاییانیان لە بەر کرا بوو، کڵاوی کازاکی سپیان(

دیاره هەر کلاوی شکاکی بوە چونکە کلاوی شکاکان سپیە. د) لە سەر نابوون. سوارەکانی سمکۆ دەوریان گرتبوون. منداڵەکان تەمەنیان هەشت تا دە ساڵە بوو. بە تەدارەکەوە بە ناو شار دا بران بۆ ئەو شوێنەی بۆیان تەرخان کرا بوو. فارسەکان بە حەپەساوی لە بەر دەم منداڵی (بە قەولی خۆیان گورگە شاخاویەکاندا) وێستا بوون کە چابوکانە بەرەو قوتابخانە رووسیەکە هەنگاویان دەنا. تا گەیشتە ئێوارە دەر بارەی ئەم روو داوەی خۆیە بروسکە بۆ تاران و تەوریز و قوستەنتەنیە لێدرا. سمایلاغای سمکۆ هەر چەندە ئەوەندەش ماوەی نەبوو بەڵام هەڵی لە کیس نەداو لە تەدارەکی کردنەوەی قوتابخانەکەدا ئامادە بوو. هەموو پێداویستیەکانی جێبەجێ کرد » (٤٦)

کاتێ لەشکری عەجەم دەگاتە چاریە و ماڵی سمکۆ تالاَن دەکەن، دەبینن لە ماڵێ دا تەلیفون و پیانۆ هەیەو لە چاریەوە بە تەلیفون لە گەڵ ورمێ و سابلاخ و شوێنە دوورەکانی کوردستان پێوەندی گرتوەو دەنگو باسی وەر گرتوە.

دوژمنانی کورد هەرچی لە بارەی سمکۆوە بیڵێن، ناتوانن ئەم راستیە بشارنەوە کە راپەڕینی سمکۆ راپەڕینێکی میللی بوە و بۆ وەدەست هێنانی ئازادی و سەر بەخۆیی کوردو کوردستان تێکۆشاوە.

عەلی ئازەری لە « مێژووی ١٨ساڵەی ئازربایجاندا لە گەڵ دەر بڕینی قینی ژاراوی و بوختان بە کورد، دیسان ناچار دەبێ دان بە واقعیەت دابنێ و بنووسێ:« ... سەر بزێوی و یاخی بوونی سمکۆ لە لایەن بێگانانەوە پشتیوانی لێ دەکرا. سمکۆیان هاندا کە لە دەوڵەت هەڵگەڕێتەوە. سمکۆ لەو سەردەمەدا داوای جیا بوونەوەو سەر بەخۆیی کوردستانی دەکرد. بۆ گەیشتن بەم ئاواتە خۆی ئامادە دەکرد. یەکێ لەم تۆیە بە زەڕ و ئاژاوە چیانەی کە ئوروپاییەکان لە رۆژ هەڵات چاندبان، ئاواتی جیا بوونەوە بوو. کار بەدەستانی ئوروپا چەند ساڵ لە نێو کورد و ئاسوری و ئەرمەن و تورکەمەن و بەختیاری‌دا کاریان کردوە تا ئەم تۆوەیان لە دڵی ئەواندا چاندوە. کوردەکانیش چەند ساڵ پێشتر ئەم قسەیان بیستوە و بەدوای

ئەم خەیاڵە خاوە کەوتوون. هێندێ جار لەم بارەوە کتێب و وتاریشیان نووسیوە. ئێستاش **سمکۆ** دەیویست بەم ئاواتە بگات. بە لاسا کردنەوەی ئازادیخوازانی عوسمانی کە (ژێن تورک)یان پێک هێنابوو، ئەویش دەیویست دەستەیەک بە ناوی (ژێن کورد) ساز بکا. هەر چی بێ بێگانە ئەم ئاواتەیان خستبوە دڵی **سمکۆ** و هانیان دابوو، کرد بوویانە قارەمان...»

حاجی (**مخبرالسلطنە هیدایەت**) والی ئازربایجان لە بیرەوەریەکانیدا دەنووسێ:« لەم کاتەدا **سمکۆ** هەنگاوی بەرزتری لە تالاْن و رنگری هاویشت. کەوتە خەیاڵی دەست بە سەر داگرتنی شارو ناوچەکان و سەپاندنی قودرەت و دەسەلاْت. لە چاریە حکومەتی خۆی دامەزراند. لە شارەکانی دەوروبەر وەستاو بەنتای هێنان. چاریەی ئاوەدان کردەوە، کۆشک و باغاتی لێ دروست کرد...»

**حەسەن ئەرفەع** دەنووسێ:« راپەرینی **سمکۆ** هەوەڵین تێکۆشانی کوردەکانی ئێران بووە، بۆ وەدەست هێناتی سەربە خۆیی ...» (٤٧)

ساڵی ١٩٢٢ سمایلاغا نامەیەک بۆ والی ئازربایجان دەنێرێ و لە ویدا دەڵێ:« چۆنە نەتەوە پچوکەکانی دنیا کە خەڵکیان چوار یەکی کورداتیش نیە خودموختاریان لە دەوڵەتە گەورەکان ئەستاندوە. بنوارە ئەلمانیەکان چۆن دابڕن کراون. لە راستیدا ئەگەر نەتەوەی کورد لە ئێراندا بە مافی نەتەوایەتی خۆی نەگا، مردن و نەمانی لەو ژیانە چاکترە کە ئێستا تێیداین. حکومەتی ئێران پێی خۆش بێ یا ناخۆش ئێمە کوردستان دەکەینە خودموختار کە وابوو فیدا کردنی پتری گیانی ئینسانەکان کارێکی بێ جێیە.» (٤٨)

رۆژ هەڵاْتناسی بە ناو بانگی رووس لازاریێف دەنووسێ: «بزووتنەوەی میللی کوردەکانی ئێران لە گەڵ بزووتنەوەی کەمایەتیەکانی دیکەی وەک عەرەب و لور و بەختیاری و... فەرقی هەبوو. ئەوە نەک هەر لە پانتاییدا، بەڵکوو لە ئیدیۆلۆژی و سیاسی و ئامانجیشدا. ئەو بیرو باوەرە ناسیونالیستیەی کە هێشتا لە سەرەتای چوزەرەدان و پشکوتندا بوو، بەرەو سەر بەخۆیی سیاسی و نیشتمانی

پاڵ پێوە دەنرا. هێزێکی بزوێنەر و تەکاندەری دیکەش بۆ کوردەکانی ئێران گەلاڵەی مەسەلەی کورد بوو لە پەیمانی سیڤر دا هەر چەندە کوردستانی ئیرانیشی نە دەگرتەوە.» (٤٩)

بۆ چوونێکی دیکەی سمکۆ لە هەل و مەرجی ئەو زەماندا بۆ باسکردن دەبێ. کاتێک کۆڕێکی یانەی کوردی شاری ئەستەمبوڵ بە سەرۆکایەتی **مستەفا پاشا یاملکی** دەچێتە لای **سمکۆ**، لێی دەپرسن :« تۆ کە دەتەوێ لەم خاکەی ئێستا لە بەر دەستت دایە، حکومەتی کوردی پێک بێنی و سەر بەخۆ بی، بۆچی ئالاَت هەڵنە کردوە ؟

**سمکۆ** لە وەلاَم دا دەڵێ:« هێشتا رێکخراوێکی زۆر رێکو پێکمان دانەمەزراندوە. من مرۆڤێکی کوردم. وەرن ئەم ولاَتە رزگار کەین، هێندە گرنگ نیە کێ دەبێتە حاکم و رێبەر. من لەم ولاَتەدا تاقە پیاو نیم کە مەقام پەرست و لە خۆرازی بم. پێم وانیە کە مەسەلەی ئالاَ ئەوەندە گرنگ بێ. پێویستە ئەوەش بزانین کە شکاک ئالاَی جۆر بەجۆریان هەیە. هەر عەشیرەتە ئالاَی خۆی هەیە. ئێوە بە چاوی خۆتان ئەوە دەبینن.»( ٥٠)

بە لای منەوە گرنگی راپەرینی سمکۆ لەوەدا بوە کە پێوەندی بزووتنەوەی خۆی تەنیا لە چوار چێوەی کوردستانی ئێراندا قەتیس نەکردوە. بەڵکوو لە گەڵ بزوتنەوە و سیاسی و کەسانی ناوداری بەشەکانی دیکەی کوردستانیش لە پێوەندی و راوێژ و بیرو را گۆڕینەوە دا بوە .

بە داخەوە **سمکۆ** بۆی نەلوا لە نێو گێژاوی سیاسەتی نێو دەوڵەتان و کۆمەڵی دواکەوتووی کوردەواری و بارودۆخی عەشایری و دەرەبەگایەتیدا، لە سیاسەت و تێکۆشانی خۆیدا سەر کەوێ و بە ئاوات بگا. پاش ئەوەی کە نەیتوانی پتر لە سولەیمانی بمێنێتەوە، رۆژی ٢٨ی مانگی فیوریەی ١٩٢٣ مالاَوایی لە **شێخ مەحمود** دەخوازێ و دەگەڕێتەوە بۆ کوردستانی تورکیا. ماوەیەک لەوێ نیشتە جێ دەبێ و ساڵی١٩٢٤ سەر لەشکر تەهماسبی فەرماندەی لەشکری ئێران لە

ئازربایجان پێوەندی لەگەڵ دەگرێ و بە لێنی پێدەدا کە ئەگەر بێتەوە لە چاریە دابنیشێ، عافو دەکرێ وکەس دەستی لێ نادات. سمکۆ لە سەر بەڵێنی سەرلەشکر تەهماسبی دێتەوە کوندی چاریە. ساڵی ١٩٢٥ رەزاشا دێتە ئازربایجان و لە سەڵماس چاوی بە سمکۆ دەکەوێ و بە لێنی دەداتێ کە ئەگەر دانیشێ و سەر بزێوی نەکا، کەس کاری پێ نابێ.

بەلام سمکۆ دوای ساڵێک دیسان دەست دەکاتەوە بە لەشکر کۆ کردنەوەو شاری سەڵماس گەمارۆ دەداو شەر ساز دەبێتەوە. نووسەر و رۆژنامە نووسی ئەو دەمی سۆڤێت سمکۆ بەوە تاوانبار دەکەن کە بە هاندانی ئینگلیز خۆ بۆ شەری دژی ئیران ئامادە دەکاتەوە. گۆرگۆ کریاژین نووسەرێکی رووس دەنووسێ: « شورشگێری بە ناوبانگی کورد سمکۆ سەر لە نوێ خۆ ئامادە دەکا بۆ پەلامار دانی ورمێ و خۆ و سەڵماس. جگە لەوە لە نێو هاوکارەکانیدا کوردی بە ناو بانگی ئانگلۆ فیل سەید تەها هەڵکەوتوە.» لازارێف کە ئەمە دەگێرێتەوە لە بەر پەرچدانەوەی بۆ چووتی رۆژ هەلاتناس و رۆژنامە نووسەکانی ئەودەمی سۆڤێتیدا دەنووسی :« تەواوی ئەم بۆ چوونانە هەستێکی بە تینی دژی ئینگلیز نیشاندەدەن. لە کەش و هەوایەکی ئاوا دا تاوانبار کردنی سمکۆ و رێبەرانی تری کورد لە ئێراندا بە دنەدانی ئینگلیز شتێکی سەیر نیە. گێرانەوەی ئەم بەیت و باوانە لە نووسراوەکانی ساڵەکانی بیستی سۆڤێتیدا، لەوەوە سەر چاوە دەگرێ کە جگە لە رۆژنامەکانی ئەو دەمی ئێران دەستیان وە هیچ خەبەرو سەرچاوەیەک رانە گەیشتوە. لازارێف لە سەری دەروا و دەنووسێ: هیچ بەڵگەیەکی وا بە دەستەوە نیە بیسەلمێنێ کە ئینگلیز ویستبی سمکۆ سەر بکەوێ و ببێتە سەرۆکی برووتنەوەیەکی جیاوازیخوازی. ئەگەر ئینگلیز یارمەتیەکی بە سمکۆ و یا بە سەرۆک عەشیرەتێکی تری کورد کرد بێت لە ئێراندا ئەویش نە بە چەشنێکی هەراو، بێگومان بۆ ئامانجێکی تاکتیکی بوە.» ( ٥١ )

دوای چەند رۆژ شەر ناتوانێ لە بەرانبەر لەشکری دەوڵەتی دا خۆ بگرێ، پاشە

دوای رۆیشتنی ئەو سەرهەنگ سادقخان لە دەوروبەری مزڵی سمایلاغای سەربازان دەبوسە دەتێ و فیزیان دەکا لە گەرانەوەی دا، دەسرێژی لێ بکەن و بیکوژن.

لای ئێواری بە سمکۆ دەڵێن کە ماشینی سەر لەشکر لە رێگا تێکچوەو سبەی دەگاتە شاری. سمکۆ دەگەرێتەوە بۆ شار. کە دەگاتە بەر هەیوانی مزڵەکەی لە کۆلاّن و لە سەربانەوە دەسرێژی لێ دەکەن و بە برینداری دەبەوێ رابکات، بەلاّم بۆ هێنانی خسرەوی کوری دەگەرێتەوە، گوللەیەکی دیکەشی وێدەکەوێ و شەهید دەبێ. خورشیدئاغای هەرکیش دەکوژرێ. بەم چەشنە یەکێ لە سەردارە مەزن و هەڵکەوتوەکانی کورد بە فێڵ و دەزی حکومەتی عەجەم رۆژی ۲۱ی یونی ساڵی ۱۹۳۰ شەهید دەکرێ. تەرمی سمکۆی قارەمان دەبەنەوە ورمێ و سێ رۆژان بۆ نیشاندانی خەڵک لە مەیدان هەڵیدەواسن. بەقەولی ویلیام ئیگلتون هەتاوی دەسەلاّتی سمکۆ کاتێ بە یەکجاری ئاوا بوو کە کەوتە ئێو داوێک کە ئەرتەشی ئێران رۆژێک لە رۆژەکانی ۱۹۳۰ لە شاری شنۆ بۆی دانا بووە.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم


١ - خاطرات دکتر کریم سنجابی ١٣٦٦ ل. ٤٥ - ٤١

٢ - هەمان سەر چاوە . ل ٤٦

٣ - سەعید بدل - تاریخچە جنبشهای ملی کرد ١٩٨٧. ل ٧٢ - ٦٢

٤ - لینین - کلیات روسی بەرگی ١٣ ل ٣٨

٥ - علائەدین سجادی - شۆرشەکانی کورد. ١٩٥٩ ل

٦ - عمر فاروقی - نگاهی بە فرهنگ و تاریخ کردستان ١٣٦٢ ل

٧ - مەردوخ ، مێژووی کورد و کوردستان ل ٣٨٥ - ٣٨٢

٨ - خاطرات حسین فردوست ١٣٧. ل ١٣ - ١٢
٩ - د.سکندر امانالل‌هی بهار رند. پژوهشی در باره پیوستگی قومی و پراگندی جغرافیائی لرها در ایران ١٣٧. ل ٧٨-٧٧
١٠ - کەریمی حسامی - کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری ١٩٨٦ ل ١٤
١١ - مێژووی ئێران چاپی موسکو روسی ١٩٧٧ ل ٤٣٣
١٢ - ایرج افشار. کرماشان و تمدن دیرینه آن ١٣٧١ ل ٩٣٩ - ٩٣٨
١٣ - کریستیان دۆلانۆ . ساواک پاریس ١٩٩. ل ١٦
١٤ - حەسەنی قزڵجی . پێکەنینی گەدا ١٩٧٤
١٥ - حەسەن ئەرفەع . کوردەکان و لێکۆڵینەوەی مێژوویی و سیاسی ١٩٦٦ ل ٦٦
١٦ - هاوکاری . ژماره ٨٣٧ ١٩٨٦/٤/٢٤
١٧ - هەمان سەر چاوه
١٨ - صالح محمدامین کورد و عەجەم ١٩٩٢ ل ٣٣٧
١٩ - نیکیتین . ایرانی‌را که من شناختم ل ٢٣٦
٢٠ - دانیال متی . دراسات کردیه پاریس ژماره ١ ل ٣٩
٢١ - هەمان سەر چاوه
٢٢ - نیکیتین . ایرانی‌را که من شناختم ل ٢٢٥ - ٢٢٤
٢٣ - سجادی . شۆرشەکانی کورد ١٩٥٩ ل ٢٥٢ - ٢٥١
٢٤ - کسرەوی . تاریخ ١٨ ساله ازربایجان ١٣٧١ ل ٧٢٧
٢٥ - ملک الشعرا بهار . تاریخ مختصر احزاب سیاسی ل ٢٨٣ - ٢٧٥
٢٦ - د. قاسملو . کوردستان و کورد ١٩٧٣ ل ٨٦
٢٧ - دانیال متی . دراسات کردیه پاریس ژماره ١ ل ٤٣
٢٨ - عبدالرقیب یوسف . هاوکاری ژماره ٨٣٧ ٩٨٦/٤/٢٤
٢٩ - دانیال متی . دراسات کردیه ژماره ١ ل ٣٤
٣٠ - گۆڤاری بەیان . هێمن ژماره ١٧ ١٩٧٤
٣١ - گرشەی کوردستان. ژماره ٩ ١٩٨١
٣٢ - لازاریف. مەسەلەی کورد و ئیمپریالیزم. روسی ١٩٨٩ ل ٢٢١
٣٣ - ابراهیم فخرائی . سردار جنگل ١٣٦٣ ل ٣٩١
٣٤ - هەمان سەر چاوه ل ٣٩٧

٣٥ - هەمان سەر چاوە ل ٣٧٢
٣٦ - هەمان سەر چاوە ل ٣٧٢ - ٤١٥
٣٧ - هەمان سەر چاوە ل ٤١١ - ٤٠٠
٣٨ - وەمزی قەزاز . بزوتنەوەی سیاسی و روشنبیری کورد ١٩٧١ ل ١٦٩ - ١٦٧
٣٩ - هەمان سەر چاوە ل ٢٠٤ - ٢٠٣
٤٠ - هەمان سەر چاوە ل ٢٠٥
٤١ - لازاریف . مەسەلەی کورد و ئیمپریالیزم موسکو ١٩٨٩ ل ٢٢٧
٤٢ - هەمان سەر چاوە ل ٢٢٥
٤٣ - خاطرات یحي . بەرگی ٤ ١٩٨٣ ل ٢٦١
٤٤ - دکتر علی اصغر زرگر - تاریخ روابط سیاسی ایران و انگلیس دردوران رضاشاه ، ترجمه کاوه بیات ١٧٣٢ ل ٩٤
٤٥ - سیسیل.جی. ادموندز . کردها، ترکها، عربها، وەرگێرانی برایمی یونسی ١٩٦٧ ل ٣٣٤ - ٣٣٦
٤٦ - د. جلیلی جەلیل. هێندێ سیمای ژیانی کۆمەلأیەتی و سیاسی و کولتوری کورد... وەرگێرانی د. ئەنوەر قادر محەممەد. ١٩٩٣ ل ٦١ - ١٣٥ ١٣٦-
٤٧ - حەسەن ئەرفەع. کوردەکان و.... ١٩٦٦ ل ٦٥
٤٨ - سەعید بدل . کورتە مێژووی جولانەوەکانی کورد. ل ٧٠
٤٩ - لازاریف . مەسەلەی کورد و ئیمپریالیزم موسکو ١٩٨٩ ل ٢١٨
٥٠ - سەعید بدل ، هەمان سەر چاوە ، ل ٧٠
٥١ - لازاریف هەمان سەر چاوە. ل ٢٢٣

## بەشی چوارەم:

# سیاسەتی رەزا شا لە کوردستان

دوای لێدان و سەرکوتکردنی سەردار و سەرۆک عەشیرەتەکانی کوردستان، بە تایبەت دوای کوشتنی سمایلاغای شکاک حکومەتی رەزا شا ئیتر لە بەرانبەر سیاسەت و کردەوەی زۆردارانەی خۆیدا لە کوردستان هیچ بەرهەڵستێکی نەدەهاتە پێش و بە قەولی یەحیای دەوڵەتابادی « حکومەتی نیزامی ئێمە لە کوردستان رەگازۆیی دەکا بێ ئەوەی سیاسەتێکی بێگانە کۆسپێک بخاتە سەر رێگای.»(١)

نووسەر جوانی روون کردۆتەوە هیچ هێز و سیاسەتێکی بێگانە نەبوو پێشی سیاسەتی ملهوری رەزا شا بگرێ. لە ساڵەکانی بیست دا زلهێزی ئەم هەرێمە بریتی بوون لە ئینگلیز و دەوڵەتی تازە دامەزراوی سۆڤیەتی. ئەمریکا هێشتا لە رۆژ هەڵاتی نیزیک و ناوەراست نەهاتبوە ریزی زلهێزەکان و حیسابێکی ئەو تۆی بۆ نەدەکرا. وەک دەزانین رەزا شا ئینگلیزەکان هێنایانە سەرحوکم و تا ئەو رۆژەش کە هەرخۆیان لایان برد، سەرە رای مانۆرو ئاخافتنی سەر زارەکی بەرژەوەندی خۆیانیان پێ پاراست.

ئەوەی شورەویش بوو لە سەرە تاوە بە پرو پاگاندەی پوچ و بە درۆی دەزگای تەبلیغاتی رەزا شا فریویان خوارد و تەنانەت بزوتنەوەی شورشگێری گیلانیشیان بۆ کردە قوربانی، پیوەندی دیپلۆماتی و بازرگانی و دۆستایەتیان لە گەڵ دامەزراند بەو خەیاڵە ئێران دۆست و بێ لایەن دەهێڵنەوە. بە رای من شورەوی تا

هەلاتی نیزیک و ناوەراست نەهاتیوە ریزی زلهێزەکان و حیسابێکی ئەو تۆی بۆ نەدەکرا. وەک دەزانین رەزا شا ئینگلیزەکان هێنایانە سەرحوکم و تا ئەو رۆژەش کە هەرخۆیان لایان برد، سەرە رای مانۆرو ئاخافتنی سەر زارەکی بەرژەوەندی خۆیانیان پێ پاراست.

ئەوەی شورەویش بوو لە سەرە تاوە بە پرو پاگاندەی پوچ و بە درۆی دەزگای تەبلیغاتی رەزا شا فریویان خوارد و تەنانەت بزوتنەوەی شورشگێری گیلانیشیان بۆ کردە قوربانی. پێوەندی دیپلۆماتی و بازرگانی و دۆستایەتیان لە گەڵ دامەزراند بەو خەیاڵە ئێران دۆست و بێ لایەن دەهێڵنەوە. بە رای من شورەوی تا رادەیەک یارمەتی بە سەقامگرتوویی حکومەتی دیکتاتۆری رەزا شا کردوە.

ئەوەی پێوەندی بە تورکیاوە هەیە، رەزاشا هەر ساڵێک دوای ئەوەی بە رەسمی لە لایەن پارلمانی ئێرانەوە بە شای ئێران بناسرێت، لە ١٩٢٦/٤/٢٢ پەیمانێکی پێنج ساڵەی لە بارەی دۆستایەتی و ئەمنیەتەوە لە گەڵ تورکیا بەست. لە دەقی پەیمانەکەدا گوتراوە:

« ئەم دوو دەوڵەتە هیچ کارێکی دژی یەکتری نەکەن. هیچ پەیمان و قەراردادێکی نیزامی و سیاسی و ئابووری نەبەستن کە بە زیانی ئەویتریان تەواو بێ. لە کاتی پەلامارێکی نیزامی بۆ سەر یەک لەم دوو دەوڵەتە ئەویتر بێ لایەنی خۆی بپارێزێت. رێگا نادەن لە خاکی یەک لەم وڵاتانەوە چالاکی دوژمنانە دژی یەک لەم وڵاتانە بکرێ. هیچ یەک لەم دوو وڵاتە رێگا نادەن بە تێکۆشان و چالاکی هیچ دەستەو رێکخراوێک کە لە خاکی ئەوانەوە دژی یەک لەم وڵاتانە بە رێوە بچێت. هەر وەها دژی ئەمجۆرە هەڵسورانەی عەشیرەتەکانی سەر سنور بە توندی هەنگاو دەنێن.» (٢)

ئەگەر بە وردی لە نێوەرۆکی ئەم پەیمانە ورد ببینەوە، هەر چەند بە زەقی ناوی کورد نەهاتوە و کردوویانەتە هەزارەی کەروێشک، بەڵام راست بۆ بەر بەست کردن و لێدانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد بەستراوە. چونکە هیچ یەک لە دەوڵەتانی

دراوسیٚ مەترسیان بۆ ئەم دوو وڵاتەی ئێران و تورکیا پێک نە هێناوە. حکومەتی شورەوی لە گەڵ هەر تک وڵات پێوەندی دۆستانەی هەبوە. دەوڵەتی ئینگلیزیش ئەو دەم پشت و پەناو خالیقی حکومەتی پەهلەوی بوە و لە گەڵ تورکیاش دوای مەسەلەی موسڵ ناکۆکی نەماوە. کە وابوو مەسەلەکە رووی لە کوردە و قورسایی پەیمانی ناو براو بە لای کورد و کوردستاندا دەشکێتەوە

پەیمانی ناو براو نە توانی کێشەی سەر سنور چارە سەر بکا و نە خەباتی رزگاریخوازی کورد بە یەکجاری کپ و بیٚ هێز بکا. وەک دەزانین لە کوردستانی سەروو ساڵی ۱۹۳۰ بزووتنەوەی ئارارات بە رێبەرایەتی **ئیحسان نوری پاشا** سەری هەڵدا. راپەرینی ئارارات دڵە تەپەی خستە ناخی هەر تک حکومەتی ئێران و تورکیاو هەر لە سەر بریاری پەیمانی ناو براو بوو کە دەوڵەتی ئێران رێگای دا بە لەشکری تورک کە لە خاکی کوردستانی ئێرانەوە پشت لە هێزەکانی ئارارات بستێنن و بزوتنەوەی ئارارات سەرکوت بکەن.

رەنگە لادان بیٚ لە باسەکەی ئێمە، بەڵام ناکریٚ ئەم راستیە بخەینە پشت گویٚ کە حکومەتی تورک لە لێدان و سەر کوتکردنی راپەرینی ئارارات دا لە یارمەتی دەوڵەتی شورەوی کەلکی وەر گرت کە بە هیچ حیلە شەرعێک لە گەڵ بیرو باوەر و مبادی سوسیالیستی یەکی نەدەگرتەوە. هەر چەندە هێندیٚ لە نووسەرانی کورد وای بۆ دەچن کە هاوکاری داشناکەکان لە گەڵ حیزبی خۆیبوون بۆتە هۆی هەڵوێستی نا لەباری ئەو دەمی شورەوی . **دوکتور عبدالرحمانی قاسملو** لەم بوارەد دەنوسیٚ:« داشناکەکان بەو هیوایە پشتیوانی راپەرینەکەی کوردیان کرد کە حکومەتی تورکیا لاواز بکا و دەرفەتێکی لە بار بۆ خەباتی داهاتوی ئەرمەنیەکان پێک بێنیٚ. لە کاتی دامەزرانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیش دا ئاسۆیەکی نویٚ بۆ خەباتی داشناکەکان لە دژی تورکیا و یەکێتی شورەوی دەرایەوە.» (۳)

ئەم بۆ چوونە وادەگەیەنیٚ کە شورەوی لە لێدانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی

نەتەوەیەکی ژێر دەست و بەشخوراو پشتی تورکیای گرتوە چونکە (ئاسۆی خەبات بۆ داشناکەکان دەکرایەوە) بە لای منەوە ئەم سیاسەتە چەوتەی ئەو دەمی شورەوی لەم بوارەدا بە هیچ بڕو بیانوێک پینە ناگرێ.

لە پاسەکە دورر کەوتومەوە و لە گەڵ داوای لێ بوردن با دەدەمەوە سەر باسەکەی خۆم. لە ژێر تەئسیری بزوتنەوەی ئارارات ساڵی ١٩٣١ کوردە جەلالیەکان لە ناوچەی ماکۆ بە سەرۆکایەتی فرزەندە و برۆ ی کوڕی براهاشای جەلالی راپەرین. مانگی مای ١٩٣١ سیو هەشت هەزار سەر بازی ئێرانی لە گەڵ دوو هەزار کەسی بە کرێگیراو و ١٢٠٠ زۆڵە کورد بە فەرماندەری سس سەر هەنگ ئەخچەوان ناوچەی کوردەکانیان پەلامار دا. هێزی کوردەکان بریتی بوو لە ٦٠٠-٧٠٠ کوردی جەلالی وحەیدەرانلو نیزیکەی ٣٠٠ کەسی کوردی کوردستانی تورکیاشیان رەگەڵ کەوتبوون. لە ١٩ی مانگی مای کوردەکان هێزی ئێرانیان پەلاماردا و بە قسەی سەرهەنگ کەریمخانی سەبیاح لەو پەلامارەدا ١٢٤ سەربازی ئێرانی کوژران و ٣٠٠ کەسیش بریندار بوە. حکومەتی ئێران بۆ لیدانی کوردەکانی جەلالی لە یارمەتی حکومەتی تورکیا کەلکی وەرگرت و راپەرینەکە سەرکوتکرا. دوای شکانی راپەرین حکومەتی ئێران کوردەکانی جەلالیان لەو سنورە دورر خستەوە.» (٤)

بە ناوی نشتە جێکردنی تایفەکانی کوردستان هەزاران کوردیان لە کوردستان گواستەوە.مڵک و سامانیان لێ ئەستاندن و هەڵیان داشتن بۆ شارەکانی تر و ژمارەیەکی زۆر کەم گەیشتنە ئەو شوێنانە کە بۆیان دیاری کرد بوون. لە رێگادا منداڵیان لە برسان دەمردن و ژنەکانیان قەرەواشیان دەکرد. زۆربەی پیاوەکانیان کوژران و لە بەین چوون. (٥)

دوای شکانی راپەرینی ئارارات و کوردە جەلالیەکان، ساڵی ١٩٣٢ پەیمانێکی دیکە لە بارەی دیاریکردنی سنور و پێکەوە سەرکوتکردنی عەشیرەتە کوردەکانی سەر سنوری ئێران و تورکیا لە نێوان ئەم دوو حکومەتە دا ئیمزا کرا. دیارە نە

سەرکوتکردنی راپەرینی سەرۆک عەشیرەتەکان و نە پەیمانی ئەمنیەت و دۆستایەتی لە گەڵ تورکیا، نەیتوانی هێمنایەتی و ئاسایشی تەواو بخاتە دلی کار بەدەستانی حکومەتی شۆڤینیستی تاران، ئەمجارە بۆ چەواشە کردن و بە ئاوەژو نیشاندانی مێژوو و رەگەزی کورد و گۆڕ کردنەوەی شوێنەواری زمان و ئەدەب و کولتوری نەتەوایەتی کورد دەست بە کار بوو. « حکومەتی رەزا شا بە بیانووی لە ناو بردنی سیستمی دەرەبەگایەتی و عەشیرەتی سیاسەتی لە بەبن بردنی کولتور و زمان و داب و شوێن و نەریتی میللی و تواندنەوەی گەلی کوردی بەرێوە دەبرد. » (٦)

حکومەتی رەزا شا نەک هەر نووسین و خوێندنی بە زمانی کوردی قەدەغە کردبوو، بەڵکو لە مەدرەسەکانیش زارۆکی کورد تەنانەت لە کاتی وچانیشدا نەیدەتوانی بە زمانی دایکی پێکەوە بپەیڤن. لە ئیدارەکانی دەوڵەتی زمانی فارسی ئیجباری بوو، لە سەردەرانەی ئیدارەکان نووسرا بوو:« جگە لە فارسی ئاخافتن بە زمانی دیکە قەدەغەیە. »

لە جەنگەی ئەم کولتور کوژیەدا دائیرە المعارفی ئیسلامی لە ئوروپا بە زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەلمانی بلاو کرایەوە. یەکێ لە وتارە هەرە بە نرخەکانی وتاری رۆژ هەلاتناسی بە ناو بانگ پروفیسور ولادیمیر مینورسکی(١٨٧٧ - ١٩٦٦) بوو بە ناوی کورد و کوردستان. پروفیسور مینورسکی لە وتاری ناو براودا بە درێژی باسی رەگەز و زمان و ئەدەبیاتی کوردی کردبوو. بۆ هەوەڵین جار بیرو رای خۆی لە بارەی رەگەزی کورد دەر بریبوو، نیشانیدا بوو کە کورد نەتەوەیەکی رەسەن و سەربە خۆ و خاوەنی زمان و کولتور و ئەدەب و مێژووی تایبەتی خۆیەتی.

سالی ١٩٣١ لە کوردستانی عیراقیش زانای بەناو بانگی کورد محمد امین زەکی بەگ(١٨٨٠ - ١٩٤٨) مێژووی کورد و کوردستانی بلاو کردەوە. ئەم کتێبە لە لایەن کوردەکانی عیراق و ئێران و تورکیاوە بە گەرمی پێشوازی لێکرا.

پاشان هاته سەر زمانی تورکی و عەرەبیش. حکومەتی رەزا شا بۆ کەمکردنەوەی تەئسیری ئەم کتێبەو وتاری پروفیسور مینورسکی لە بواری کولتوری‌یەوە دەست بە کار بوو. حکومەتی ئێران نووسەرانی چڵکاو خۆری بەکرێگیراوی هاندا کە بۆ چەواشە کردنی مێژو وزمان و کولتور و ئەدەبی کوردی قەڵەمیان بخەنە کار. وەزارەتی فەرهەنگی ئێران غولامرەزا رەشیدی یاسمی کوردی کرماشانی کردە مەعمور کە بۆ بەر پەرچدانەوەی کتێبی مێژووی کورد و کوردستانی ئەمین زەکی بەگ کتێبێک بنووسێ و ئەوەی لە توانای دا هەیە بۆ بە فارسکردنی کورد و بە ئێرانی ناساندنی کوردەکان و بۆ چەواشە کردنی زمان و ئەدەب و مێژووی کورد و بە قازانجی دەوڵەتی ئێران کاغەز رەشکاتەوە. شایانی باسە تا ئەو دەم باسی کورد ونووسین لە بارەی کورد و کوردستان لە ئێراندا باسی سەر بوو. بەلام کار بەدەستانی رژێمی ئێران کتێبی رەشیدی یاسمی-یان بە چەشنێکی هەراو بلاو دەکردەوە. جێگای سەرنجە هەر کاتێ مەسەلەی کورد دێتە گۆڕ و باسی کورد و کوردستان بەرژەوەندی رژێمی تاران دەخاتە مەترسیەوە، کتێبی رەشیدی یاسمی لە لایەن کار بە دەستانی حکومەتی ئێرانەوە چاپ و سەر لە نوێ بلاو دەکرێتەوە و بە هەرزان دەخرێتە دەستی خەڵکەوە. بە تایبەت لە سەر دەمی کۆماری کوردستان (١٩٤٦-١٩٤٥) رژێمی تاران ئەو کتێبەی بە چەشنی هەراو بلاو کردەوەو کەلکی تەبلیغاتی لێ وەر دەگرت. ئەم سیاسەتە لە پاشانیش هەر درێژەی هەبوو. دیرۆکی سەرانسەر درۆ وچەواشە و ئاواژو کراو سەبارەت بە نەتەوەی کورد لە ئێراندا نووسراون. لە ناو ئەوانەدا دەتوانین کتێبی(کوردستان) دانانی عەلی ئەسغەری شەمیم و (تاریخی ریشەی نژادی کورد) دانانی ئیحسان نوری پاشا ناو بەرین کە هیچیان پێوەندیان بە مێژووی راستە قینەی نەتەوەی کوردەوە نیە.(٧)

بۆ شارەزایی پتری خوێنەرانی بەرێز لە بۆچوون و نووسینی چەوت و لارێیی رەشیدی یاسمی سەبارەت بە رەگەز و مێژوو زمانی کوردی چ عەیبی تێدا نابێ کە

سەیرێکی وتاری رەخنەیی پروفیسور **قەناتی کوردۆیێف** بکەین کە ئەویش کاک **عبداللە مەردوخ** کردوویە بە فارسی و لە گۆڤاری (الفبا)چاپی پاریس دا بلاوی کردۆتەوە. دیارە دەقی وتاری رەخنەیی پروفیسور قەناتی کوردۆیێف سالی ۱۹۷٤ لە لایەن دوکتور **عبدالرحمان حاجی** مارفەوە کراوە بە کوردی و بلاو کراوەتەوە.

پروفیسور کوردۆیێف دەنووسێ :« ئەم کتێبەی لەم وتارە دا رەخنەی لێ گیراوە، هەر وەک دانەر خۆی دەنووسێ لە سەر داخواز و ویست و هاندانی وەزارەتی فەرهەنگی ئێران دانراوە بەو مەبەستە کە ریشە و یەکبوونی میللی کورد لە گەلْ میللەتی ئێران(فارس. ق. کوردۆیێف) و هەر وەها مێژووی ئەوان و بەشداری کوردەکان لە ژیانی ئێراندا نیشان بدات . (۲۹۹) دانەر بۆ بە جێگەیاندنی ئەم مەئمووریەتە مەسەلەی رەگەز و مێژووی کوردی لە سەر دەمی کەوناراوە، واتە بەر لە سەفەویەکان تا سەر دەمی بنە مالەی ئەم دواییە موتالا کردوە. ئەم کتێبە بە مەبەستی چەواشە کردن و ئاواژو نیشاندانی رەگەز و مێژووی کورد لە سەرەتاوە تاکۆتایی بە درۆ وفێلْ و مەکر پێکەوە لکێنراوە و هەر لە وەشدا دەر دەکەوێ کە ئەم کتێبە بۆ ئەنجامدانی پێویستیەکی سیاسی حکومەتی ئێران نووسراوە. دانەر بۆ شیکردنەوەی رەگەز و مێژووی کورد لە سەر دەمی کۆنەوە تا سەدەی شازدە ی زایینی لە بارەی زمان و کولتور و رەگەز و مێژووی کورد پشتی بە بەلْگەو بیرو رای گەلێک نووسەرانی رۆژ ئاوا و رۆژ هەلاتەوە بەستوە. ئەم بەشە لە کتێبی **رەشیدی یاسمی** دا بۆ کەسێکی مێژوو ناس و کورد ناس دەتوانێ گەلکی لێ وەر بگیرێت. شایانی گوتنە کە تاقە بەشی بە کەلکی کتێبەکەش هەر ئەم بەشەیە.......

پروفیسور کوردۆیێف دەنووسێ : لە بەشێکی کورتی مێژووی کورد دا دانەر رەخنە لەم تیئوریانە دەگرێ کە رەگەزی کورد بە فارس نازانن و بە بێ نیشاندانی بەلْگە و دوور لە هەموو چەشنە بنەمایەکی زانستی هەولی داوە حاشا لەم تیئوریە

بکات کە نەتەوەی‌کورد بە نەتەوەیەکی رەسەن، سەر بە خۆ و خاوەنی کولتور و زمان و مێژووی تایبەتی خۆی دەزانێ و بە هەوڵ و تەقەلایەکی ئاشکرا شوڤینیزمی ئێرانی بە سەر کوردەکاندا بسەپێنێ. یاسمی دەنووسێ: پێویستی لێکۆڵینەوە لە بارەی کورد و مێژوەکەی ئەوەیە کە تەنیا لە خەتی پێوەندی لە گەڵ میللەتی ئێران ( فارس، ق.کوردۆیف)دابێت. چونکە کورد لە باری رەگەزیەوە ئێرانیە و لە رەگەز و زمان و بروای تایبەتی لە گەڵ میللەتەکانی تری ئێران هیچ فەرق و جیاوازی نیە .(١٤٤) رەشیدی یاسمی لە رەخنە گرتن لە لێکۆڵەرەوەکانی کورد دا دەنووسێ: لە زۆر جێگایاندا دیتوومە کە نووسەران هەوڵیان داوە بە بەڵگەی ناقایم و بێ جێ تایفەی کورد کە یەکێ لە لقەکانی رەگەزی ئێرانی و لە ئەرکانەکانی ئێرانیەتە بە تایفەیەکی تورانی و یا سامی و شتێ وای بناسێنن.

رەشیدی یاسمی لە پاکانە کردن بۆ سیاسەتی شۆڤینیستی شادا،ئەوەندە شوی لێ هەڵکێشاوە ئەم زانایانەی کە رەگەزی کورد بە ئێرانی(فارس. ق. کوردۆیف) نازانن، بە دوژمنی میللەتی کوردی ناو بردوون. رەشیدی یاسمی دەڵێ: مێژووی کورد بەستراوەتەوە بە فارس و بە رلە پەیدا بووتی فارس لە ئاخی کوردستانی ئێستاو ئێراندا لە چیاکانی زاگروس هیچ کوردێک وجودی نەبوە. هەر بۆیەش رەشیدی یاسمی دەنووسێ: ئەو زانایانەی کە کورد بە پاشماوەی نەتەوەکانی قەدیمی پێش مادەکان دەزانن کە لە کوردستانی ئێستادا ژیاون، رێگایەکی چەوتیان گرتۆتە بەر. هەڵەیە ئەگەر کوردەکان بە ریشەی ئێرانی نەزانین. بەمجورە دەبینین کە رەشیدی یاسمی بە بێ بەڵگە دەیەوێ ئیسباتی بکا کە ریشەی کورد فارسە. بە رای ئێمە کورد لە فارس ریشە وەر ناگرێ.بەڵکو لە نەتیجەی تێکەڵی تایفە و نەتەوەکانی قەدیمیدا کە لە زنجیرە چیاکانی زاگروس نیشتە جێ بوون، پەیدا بوە. زۆر لە تایفەکانی کورد کە خاوەنی دین و بیرو رای جۆر بە جۆرن و لە رەگەز ناسی ئەواندا ئیختیلاق هەیە و هەر وەها پاشماوەی

گەلێک ناوی تایفەگەلی کۆن لە کۆمەڵی کورد و هێندێ ناوی جوغرافیایی ناوچە شاخاویەکانی ئاسیای پچوک کە بە ناوی هێندێ تایفەی کورد گۆڕاون، دەری دەخا کە نەتەوەی کورد لە ئەنجامی تێکەڵبوونی هێندێ تایفەو نەتەوەی نیشتە جێی ناوچە شاخاویەکانی زاگروس و یا ئەوانەی هاتوونە ویندەری پێک هاتوە.

دانەر لە هەموو شوێنێ پێی وایە کە زمانی ئێرانی بە مانای زمانی فارسیە. لە کاتێکا بە گوێرەی یاسای پێوەندیەکانی زمان، کوردی یەک لە زمانە ئێرانیەکانە. زمانی هێندێ لە تایفە قەدیمەکانی زاگروس کە لە بناخە دانانی پێکهاتنی نەتەوەی کورد دا بەشداریان کردوە لە بنەماڵەی زمانە ئێرانیەکان بوە. هەر بۆیەش زمانی کوردی وەک یەکێ لە زمانە ڕەسەنەکانی زاگروس لە گەڵ زمانی مادی، پارتی، فارسی ئیزیکی و پێوەندی هەبوە. بەڵام بە هیچ جۆر لە زمانی فارسی پێک نە هاتوە و ڕیشەی لەو نەگرتوە وەک ڕەشیدی یاسمی دەیەوێ بیسەپێنێ. بێگومان بەشداری مادو پارتی و فارسی لە پێکهاتنی میللەتی کورد بۆتە هۆی بە هێز بوونی پێوەوەندی لە گەڵ زمانە ئێرانیەکان بەڵام ئەمە بە هیچ جۆر ناتوانێ نیشان بدات کە کورد لە فارس پەیدا بوە و زمانی کوردی لقێکە لە زمانی فارسی......

وشەی کورد ناوی میللەتێکە لە چوارچێوەی سنوورەکانی کوردستاندا ژیاوە. لە شوێنەواری نووسەرانی یونانی و ئەرمەنی و سومەری و هی‌تردا دەبینرێ. بە گوێرەی ئەم سەر چاوانە کورد لە ڕۆژەکانی قەدیمەوە لە ناوچەکانی کوردستانی ئێستادا ژیاوە. واتە لە لای سەروو لە گۆلەکانی وان و ورمێ تا چیاکانی زاگروس. لە لای خوارەوە لە ڕوباری دەجلە و لە لای ڕۆژ ئاوا لە ناوچەی بۆتان.

ڕەشیدی یاسمی هەوڵی داوە بەڵگەی مێژوویی کە لە بارەی کورد و مێژووی کوردەوە هەن، بیانشارێتەوە. جگە لە وەش ویستوویە وا نیشان بدا و بیسەپێنێ کە کورد ڕیشەی لە ئێران داکوتاوە و پێکهاتوە.

دانەر ڕەخنە لەو زانایانە دەگرێ کە لەو بڕوایە دان کورد خاوەنی ڕەگەزێکی

سەر بە خۆیە و دەڵێ: هێندێ لە زانایان مافی ئەوەیان نیە کە کورد بە نەتەوەیەکی خاوەن ریشەی رەسەن وسەربەخۆ بزانن. ئەم زانایانە لەوە دەگەڕێن کە کورد لە میللەتە گەورەکان جیا بکەنەوە. شۆڤێنیزمی ئێرانی و سەپاندن و فێر کردەی ئەو لە لایەن رەشیدی یاسمی‌یەوە گەیوەتە رادەیەک کە دەڵێ: نەک هەر کورد وەک نەتەوەیەکی سەر بە خۆ و رەسەن حیساب نەکەن بەڵکو بە تایفەیەکی بزانن کە لە باری ریشەیی ئێرانی و فارسە. ئاشکرایە تا ئیمرۆ هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە نیە کە نیشان بدا کورد فارسن. هەر بۆیەش ناو براو هەوڵدەدا ئەم بیرو رایە بسەپێنێ و بەڵگەی بۆ بتاشێ و بۆ گەیشتن بەو ئامانجە ئێزیکی زمانی فارسی و کوردی و دین و باوەری ئایینی و کۆمەڵایەتی هاو بەشی و بەشداری کوردەکان لە مێژووی ئێراندا موتالا دەکا. بەم بۆ چوونە دەیەوێ نیشان بدات کە کورد لە گەڵ فارس فەرقێکی نیە و هەر دووکیان میللەتی ئێران پێک دێنن.(١٤.)

یەکەم لە لای هەموان روونە کە میللەتی ئێران هەر وجودی نیە. بەڵکو نەتەوەکان یا قەومەکانی ئێرانی (فارس و کورد و ئەفغان و تاجیک و هیتر) وجودیان هەیە. هەر وەک میللەتی سلاوی وجودی نیە، بەڵکو نەتەوە یا قەومەکانی سلاوی(روس و بولغار و چێک و هیتر) هەن. هەر یەک لەو میللەتانەش خاوەنی زمان و کولتور ومێژووی خۆیانن. هەر بەم جورە نەتەوەکانی ئێرانیش هەر یەک خاوەنی زمان و کولتور و مێژووی خۆیانن. دووەم رەشیدی یاسمی بۆ قازانجی شۆڤێنیستەکانی فارس تەواوی ئەو میللەتانە بە فارس دادەنێ. هەر بۆیەش زۆر جار میللەتی فارس، مێژووی فارس، ئەدەبیاتی فارس، زمانی فارسی و هتد، دەکا بە میللەتی ئێران و مێژووی ئێران و زمانی ئێران و ئەدەبیاتی ئێرانی.

رەشیدی یاسمی زمانی کورد و دینی کورد و مێژووی کورد وکولتوری کورد بە لقێکی زمان و مێژوو وکلتوری فارس دەزانێ. ناو براو لە بارەی زمانی

کوردی دەنووسێ: زمان مەرجی بنەرەتی پێکهاتنی نەتەوەیە. ئەوەش پتر لە هەموو شت یەکێتی کورد و میللەتی ئێران نیشان دەدات.( ١٣٢)

ئەم یەکێتیە لە پێک‌گرتنی وشە گەلی کوردی و فارسی بە سانایی دەبینرێت.(١٣٢) ئەگەر کورد و فارس زمانی وەک یەکیشیان هەبایە، دیسان نەدەگرا کورد و فارس بە میللەتێک دانرابان. هەر ئەوەندە بەسە نروێژ و دانمارک نیشان بدەین کە زمانیکی هاو بەشیان هەیە و بەلاَم لە گەلْ ئەوەش یەک نەتەوە نین.

رەشیدی یاسمی بۆ نیشاندانی یەکێتی زمانی کوردی و فارسی ١٧ وشەی هەلْبژاردوەن کە گۆیا ئەم وشانە لە هەر تک زماندا بە تەواوی وەک یەکن. بەلاَم دانەر ئەم وشانەی لە روانگەی( فونتیک، مورفولوژی و سینتاکس) موتالاَ نەکردون. تەنیا دەلْێ ئەم وشانە وەک وشەی فارسین. بەلاَم ئەگەر رەشیدی یاسمی بەم شێوەیە لە زمانی کوردی کۆلْیبایەوە، سەربە خۆیی و جیاوازی زمانی کوردی بە جوانی بۆ دەردەکەوت. بێگومان ئەو ناتوانێ دان بەو راستیە دابنێت. چونکە ئەو دەم ئاگاتە ئەم ئاماڼجە کە مەبەستیەتی. هەر چەند لە زمانی فارسی و کوردی‌دا گەلێک وشەی وێکچوو هەن، بەلاَم لە گەلْ ئەوەشدا ناکرێ بێژی زمانی کوردی لە زمانی فارسی پێکهاتوە. زمانی کوردی چ لە باری فونیتیک و مورفولۆژی و سینتاکسەوە و چ لە باری پەیدا بوونی وشە گەلەوە زمانیکە سەر بە خۆ. ئەم راستیە ماوەیەکە لە لایەن کورد ناسانی یەکێتی سۆڤێتیەوە نیشاندراوەو پەسند کراوە.......

مێژووی نەتەوەی کورد بە گشتی شاهیدە کە کورد خاوەنی کولتور و زمانی تایبەتی خۆیەتی. خەباتی نەتەوەی کورد لە پێناو ئازادی و سەر بە خۆییدا ئالْقەیەکی خوێناویە لە تەواوی سەدەکانی مێژووی رابردووی میللەتی کورددا.

رەشیدی یاسمی‌تەنانەت لە روانگەی مەزهەبیشەوە کورد بە لقێکی فارس دەزانێ ولەم بارەوە دەنووسێ: ئەمە یەک لە هەلْ و مەرجی نەتەوەیە. لە سەر

بناخەی پاشماوەکانی دینی ئێمە دەتوانین ئیسباتی بکەین کە قەومی کورد لقێکە لە شەجەرەی ئێرانی. ئەوەش ئاشکرایە چۆن هەزار ساڵ پێش تەواوی ئێران و کوردستان دینی ئیسلامیان قبوڵ کردوە. لێرەدا یەکێتی تەواوی ئەوان دەر دەکەوێ. جگە لەوە بەر لە ئیسلامیش دینی دانیشتوانی کوردستان دینی ئێرانی بوە.(واتە زەردەشتی - ق. کوردۆیڤ) ئاشکرایە بەڵگە و بۆ چوونەکانی رەشیدی یاسمی لە بارەی زانستیەوە بێ نرخ و لە حەقیقەت بە دوورن. ناتوانی بە هیچ جۆر دین بە بناخەی یەکێتی نەتەوە حیساب بکەی. هەموو دەزانین کە تورک و عەرەب و فارس و ئەفغان و نەتەوەگەلی تر ماوەیەکە دینی ئیسلامیان وەرگرتوە. بەڵام ئەوان یەک نەتەوە نین. ئەگەر لە روانگەی دینەوە لە کورد بکۆڵینەوە بزانین چ میللەتێکە، ئەو دەم بە ئاسانیی کورد دەتوانێ ببێتە عەرەب و تورک و ئەفغانیش.

هیچ یەک لە بەڵگە نیشاندراوەکانی رەشیدی یاسمی لە بارەی فارس بوونی ریشەو رەگەزی کورد بە بەڵگە حیساب ناکرێن و پشت بە بناخەی زانستی نابەستن. رەشیدی یاسمی خۆشی دەزانێ کە بەڵگەکانی ئەو بۆ بە فارس کردنی کوردەکان بێ ئیعتیبارە و دوور لە راستیە. بەڵام لە لای ئەو ئەمە گرنگ نیە. گرنگ ئەوەیە بە هەر جۆرێکی بکرێ کورد ببنە ئێرانی.(فارس.ق.کوردۆیڤ).یاسمی لەم بوارەوە دەنووسێ: بلا بێژن هیچ یەک لەم بەڵگانەی نیشانمان داوە ناتوانن ئیسباتی بکەن کە رەگەزی کورد ئێرانیە. بەڵام لە گەڵ ئەوەش کورد دەبێ بە ئێرانی حیساب بکرێ.

رەشیدی یاسمی دەیەوێ نەک هەر کوردی ئێران، بەڵکو هەموو میللەتی کورد لە ژێر چەتری میللەتی ئێراندا کۆ بکاتەوە. ئاشکرایە رەشیدی یاسمی چەوسانەوەی کوردەکانی کوردستانی ئێران لە لایەن دەوڵەتی کۆنە پەرستی ئێرانەوە بە کەم دەزانێ. ئاواتی ئەوەیە کە میللەتی کورد بە گشتی بەرێتە ژێر دەسەلاتی حکومەتی ئێران تا بە کەیفی خۆی بیانچەوسێنێتەوە. هەر بۆیەشە کە

سەرنجی دەوڵەتی ئێران بۆ لای داگیر کردنی کوردستانی عیراق و تورکیا رادەکێشێ. ئەو ئەم ولاّتانە لە زەمانی هەخامنشیان بە ئێرانی دەزانێ...

رەشیدی یاسمی بەڵگەی ئەو زانایانە کە گوتویانە: کوردەکان لە رابردوودا سەر بەخۆییان هەبوە و خاوەنی دەوڵەت و پادشا بوون و حکومەتی سەر بە خۆی تایبەتیان هەبوە، بە بەڵگەی لاواز و بێ بناخەیان دەزانێ......»

وتاری رەخنەیی و زانستیانەی پرۆفیسور قەناتی کوردۆیف کە کاک عبداللە مردوخ کردوویە بە فارسی گەلێک درێژە و لە هەموو بارێکەوە بیرو راو بۆ چوونی چەوتی رەشیدی یاسمی سەبارەت بە رەگەز و زمان و کولتور و مێژووی کورد نیشانداوە و لە کۆتاییدا دەنووسێ:« دانانی کتێبی ناو براو کە لە سەرنچینەی شۆڤێنیزم دانراوە، ناوبراوی وەها گرتۆتە خۆ کە مێژووی کورد وەک مێژووی نۆکەر و بە کرێگیراواتی پاسداراتی تاج و تەختی ئێران تەماشا بکات. رەشیدی یاسمی سیاسەتی داگیر کردنی ولاّتی خەڵک هان دەداو دژی کورد پروپاگاندە دەکات کە گۆیا لە بەرانبەر حکومەتی کۆنە پەرستی شای ئێراندا سەریان دانواندوە» (٨)

من تەنیا کورتەی وتارەکەم کردوە بە کوردی و هێناومەتە نێو باسەکەم بۆ ئەوەی لە تەک روونکردنەوەی پتری سیاسەتی حکومەتی رەزاشادا، شێوەی مێژوو نووسانی بێگانە پەرستیش بە خوێنەرانی کورد نیشان بدەم بۆ ئەوەی ئەوانەی بە نێو ئاخنی کتێبی رەشیدی یاسمی هەلاّ دەڵێن چاویان بکرێتەوە.

رەشیدی یاسمی بۆ حاشا کردن لە رەگەز و مێژووی رەسەنی کورد و بە فارس دانانی کورد شتی ئەو تۆی دۆزیوەتەوە کە تەنیا کەسانی وەک ئەو دەتوانن بیهێننە سەر کاغەز. ناو براو دەنووسێ:« کوردەکان ناوی کوردی لە منداڵەکانیان دەنێن وەکو: نەریمان، روستەم، فەرەیدون. کچەکانیان وەکو: ستارە، پاکیزە، نیرگس و سوسەن. کورد هەمیشە شانازی بە پیاوە گەورەکانیەوە کردوە. وەکو: زەردەشت، روستەم، و کەیقوباد.»(٩)

ڕەشیدی یاسمی بۆ بەجێ گەیاندنی فەرمانی وەزارەتی فەرهەنگی ئێران هەر شتێکی چەوتی بە خەیاڵدا هاتبێ خستوویەیەتە سەر لاپەڕی کتێبەکەی و هەر وەک پروفیسور کوردۆیێڤ روونی کردۆتەوە ئایین و مەزەبی کوردیشی کردوە بە ئێرانی. بەڵام با بزانین ئەو ئایین و مەزهەبە ئێرانیەی ڕەشیدی یاسمی شانازی پێدەکات هەڵوێستی سەبارەت بە کوردەکان چۆنە وکاک محمدی قازی نووسەر و وەرگێری بە ناو بانگی کورد ڤین و بوغزی ئەو مەزهەبە لە ئاست کورد چۆن دەگێرێتەوە:« لە ئیمتیحانی شەرعیات باش وەڵامم دابۆوە. چاوە ڕوانی نمرەی ۱۹و ۲۰ بووم. بەڵام کە کارنامەیان دادەستم تەماشام کرد نمرەی ۱۰ یان بۆ داناوم. ڕەخنەم گرت. دوای کێشەو هەرا سەر لە نوێ بە کار نامەدا هاتنەوە. دیتیان تەواو وەڵامی هەموانم داوەتەوە. لە ماموستایان پرسی بۆ وات کردوە؟ وەڵامی ئەو پرسیارانەی تەواو داوەتەوە. گوتی:« ئەو سوننی مەزهەبە. بڕوای بەم وەڵامانە نیە.»(۱۰)

لە سەر بنەمای ئەم سیاسەت و ڕێنوێنیەی حکومەت، نووسەرانی شۆڤینی و کۆنە پەرستی فارس دەستیان کرد بە بڵاو کردنەوەی نووسراوەی ڕەگەز پەرستانە و دوور لە ڕاستی. عەلی ئەسغەری حیکمەت لە ڕۆژنامەی ستارە ۳۰ مانگی مای ۱۹۳۳ دا دەنووسێ:« لە هێندێ ناوچەی ئازربایجان و ناوچەکانی تری سەر سنور بە دیالێکتێک دەپەیڤن کە تێکەڵاوێکە لە فارسی و تورکی و عەرەبی. لە کاتێکا زۆربەی نیزیک بە تەواوی خەڵک (٪۹۰)بە زمانی فارسی مۆدێرن قسە دەکەن و نووسینی فارسی سەردەم بە کار دێنن.»

شۆڤینیزمی فارس بە حکومەت و ڕوناکبیرەوە هەمیشە ویستوویەتی بە وشەی « پارێزەرانی سنور و حەسڵە ئێرانی و مەرزدارانی غیور و ..هتد» خەڵک بە فریو بەرن. با خۆمان پەخمە نەکەین تەبلیغاتەکەیان زۆریش بە هەوادا نەڕۆیشتوە. ئێستاش زۆر لە سیاسی و نووسەرانی کورد شانازی بە وە دەکەن کە « ئێرانین و کەسیش لە خۆیان بە ئێراتیتر نازانن» ئەوە نەک هەر لە ئێران، بەڵکوو لە

بەشەکانی دیکەی کوردستانیش کەسانی وا هەن بە بیستنی وشەی ئاری و ئاریایی ئاویان لە زاری دێت و کتێبی ڕەشیدی یاسمی بە « گرنگترین سەر چاوەی مێژووی کورد » دەزانن.

با بزانین دوکتور کەریمی سەنجابی کە خۆی بە کورد دەزانێ و شانازی بەوەدەکا کە باوکی دوو هەزار سواری لە دوا سوار بوە و بەلاّم لە نێو سیاسەت و بیرو بۆچوونی شوێنیزمی فارسدا تواوەتەوە لە سەر کورد دەڵێ چی؟«عنصر کورد بەر لە هەزاران ساڵ لە کۆنترین دەورانێکدا کە مێژوو دەتوانێ شایەدی بدا، لە عناصر پێکهێنەری ئێران بوە و هەرگیز مێژوو وکولتوری جیاواز لە ئێرانی نەبوە. هیچ قەومێکی ئێرانی، هیچ زۆربەیێکی ئێرانی قەت کەمایەتی کوردی نەخستۆتە ژێر ستەم و چەوسانەوەی قەومی. ئەگەر خەڵکی موستەسعەفی کورد تا رابردووی نیزیک کەوتۆتە بەر زوڵم و ستەم، لە لایەن ئەمیرو خان و بەگزادەکانی خۆیانەوە بوە. من خۆم کوردم‌و سەردەمی منداڵی من باوکم دوو هەزار سواری جەنگی لە پشت سەری سوار بون. هەم فەرماندەی عێل‌و هەم یاسا دانەر و هەم قازی بوو. داودخانی ئەمیر ئەعزەم کە لە سەر سەد هەزار سواری ئامادەی جەنگی کەلهور سوڵتانی موتڵەق بوو. ئەوان کەی ڕێگایان دەدا بە حوکمرانی ئەیالەت و نوێنەرانی دەوڵەتی ناوەندی کە دەست بخەنە نێو کاروباری ئەوان، تا دەگا بە زوڵم و ستەمکاری.

ئێستا شاری کرماشان بە نیزیکەی ۰۰٤ هەزارحەشیمەتەوە گەورەترین شاری کوردنشینە لە ڕۆژهەلاّتی‌نێوەڕاستدا. داخوا تائێستا کەس دەنگی ویستی خودموختاری لە خەڵکی ئەو شارە بیستوە؟ هەروەها تەواوی ئوستانی شیعە مەزەبی کرماشان بە زیاتر لە میلیونێک خەڵک و شارستانی ئیلام بە نیزیکەی ۳۰۰ هەزار خەڵک‌وشارستانیگەڕوس بە حەشیمەتێکی بە قەدرایی ئیلام. ئەگەر لە کوردستانی مەهاباد و تا رادەیەکیش سنە ئەم بزوتنەوەبە پێرەو ولایەنگری پەیدا کردوە، هۆیەکەی دەگەرێتەوە بۆ پێشینەی کۆنی ناکۆکی ئایینی.

خەلیفەکانی ئالی وەسمانی‌و موفتی‌و شێخە چڵکاوخۆرەکانیان لە زەمانی صفوی یەوە تا قاجار هەمیشە ئاگری دوژمنایەتی و ناکۆکیان لە نێو خەڵکی سوننە مەزەبدا خۆشکردوە. برایانی کوردی ئەو مەڵبەندە وردە وردە وەها کەوتوونە ژێر تەئسیری تەبلیغات و تەڵقینات و لە خۆیان بێگانە بوون کە ئێرانیەکان و تەنانەت ئێرانە تورک زمانەکانی ئازەربایجانیش بە عەجەم و شیعەو بە رافزی ناودەبەن. هەر دەڵێی خۆیان عەجەم نین. ئێستاش هەر لە سەر زەمینەی ئەم قینەو ئەم رابردوا‌یە کە سیاسەتی بێگانە توی ناکۆکی و دووبەرەکی دەچێنن و فرسەت تەڵەبی وەک فلان و فلان لە سەر دەمی جۆر بە جۆردا پەروەردە دەکەن.»
(١١)

واسیلی نیکیتین جوانی بۆ چوە کە دەڵێ:« پێداگرتن لە سەر ئەم نوکتەیە کە کورد و فارس لە یەک بنە چەکەو ریشەو رەگەزێکن و نە بوونی بەڵگە بۆ دوژمنایەتی دوو نەتەوەی خزم هەمیشە لە بەیاننامەی رەسمی و لە چاپەمەنیەکاندا دوو پات دەبێتەوە و کتێبی رەشیدی یاسمیش هەر ئەم نەتیجە وەر دەگرێ. بەم حاڵەش تاران لە سەر کوتکردنی هەرای خالیدئاغای جەلالی لە لای ئارارات و یا راپەرینی سمایلاغای سمکۆ لە لای شنو و یا جافرسانی هەورامی لە ١٩٣٢ دەست ناگێرێتەوە.»(١٢)

ئەم ملهوری و سیاسەتە شۆڤێنیەی دەسەڵاتدارانی ئێرانی و خۆ بە ئێرانی دانان و خۆ بە کەم گرتنی کوردەکان تا ئێستاش درێژەی هەیە و ئاش هەر لە سەر هەمان تەوەر و بستە دەسورێت. جا ئەوە نەک هەر حکومەت و سیاسەتی رەسمی، بەڵکوو بە رواڵەت روناکبیرەکەش لە ئێران سەبارەت بە کورد و مەسەلەی نەتەوایەتی هەر هەمان هەڵوێست دەنوێنێ و بەم قسە بێتامانە کوردەکە کاس و هێر دەکا.

عەلی ئەصغری شمیم لە گۆڤاری ( آموزش و پرورش ) ساڵی٨ ژمارە ٩ ١٣١٧ لاپەرەی ٤٤-٤٧، لە ژێر ناوی (وەزعیەتی یەکێ لە تایفە گەورەکانی

ئێران ) دا دەنووسێ:« کوردەکان گەورە ترین و قەدیمترین قەومی ئارییایی ئێرانین کە لە ناوچە شاخاویەکانی رۆژ هەڵاتی فلاتی ئێران بە کرماشانیشەوە لە قەدیمەوە نیشتە جێن ولە پاراستنی میللیەت و داب و ئەخلاقی ئێرانیدا سەر کەوتوون. کوردەکان باشتر و زیاتر لە قەومەکانی دیکەی ئێرانی رەگەز لە پاراستنی داب و رەسم وعادەتی ئێرانیدا سەر کەوتوون و کەمتر لە تایفەکانی دیکە ئاڵو گۆریان بە سەردا هاتوە. کوردەکان هەمیشە پێشقەرەوڵی پاراستنی سەر بە خۆیی و میللیەتی ئێران بوون و ئیمرۆش لە پتەو کردنی یەکێتی میللی و هاو هەنگاوی لە گەڵ شارستانیەتی تازەی ئێراندا شان بە شانی ئێرانیگەلی دیکە هەنگاو دەنێن. کە وابوو جگە لەوەی کە گوترا هەر بیرو بۆ چوونێکی تر لە بارەی کوردەکانی ئێرانەوە دەر برا بێت هیچ نرخێکی زانستی و پیجوری نیە.»

ئەمە لە کات و سەر دەمێکدا کابرای روناکبیری فارس ئەم بەیت و باوە ریز دەکا کە سێبەری رەشی حکومەتی پەهلەوی عاسمانی کوردستانی بە جارێک رەش هەڵگیرا بوو. هەموو بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی و سەر هەڵدانی عەشیرەتی سەرکوتکرا بوو. نووسین وخوێندنەوە بە زمانی کوردی باسی سەر بوو. جل و بەرگی کوردی قەدەخە کرا بوو، پولیسی رەزا شا شاقەلی مەلایان و نێفەکی خەڵکیان دەبری و سوکایەتیان بە خەڵک دەکرد. دیارە ئەم هەوڵ و تەقەلایە بۆ حاشا کردن لە زمان و ئەدەبیات وکوێر کردنەوەی شوێنەواری کولتور و داب و نەریتی کوردی هەر وا بە خۆرایی نەبوو. تۆ بڵێی رەزاخان ئەوەندە لە ئینگلیزەکانی پشتیوان و راوێژ کەری فێر نە بووبێت.« رێبەرانی ئیستیعمارگەر لە سەر ئەو باوەرە بوون کە بۆ دەسەڵات و نفوزی زیاتر بە سەر وڵاتانی کولونیدا، وە بۆ هێنانە ژێر زنجیری میللەتان بەر لە هەموو شت پێویستە زمانی دایکیان بگۆرێ. ئەو دەم دەتوانی رەسەنی و شارستانیەت و ئەصالەت لە میللەتی ژێر دەست بستێنێ. زمان پتەوترین بەربەندێکە کە رێگای تێخزانی نفوزی لە کۆمەڵگادا دژوار دەکا.(١٣).

لەم بوارەدا **وەزاشا** وەک زۆر شتیتر پێرەوی لە **مستەفا کەمالی** ئەتا تورک کردوە. **مستەفا کەمال** ساڵی ١٩٣٠ لە کۆنگرەی ئەکادیمیای مێژووی تورکەکاندا گوتوویە: « ئێوە دەزانن بۆچی(باڵکان)مان لە دەست چوو؟ بیر کردنەوە لەم کارە شتێکی بە کەڵکە. میللەتانی باڵکان( بولغار و سربی و رومانی) هەر لە سەرەتاوە پیتی نووسینیان بۆ خۆیان دروست کرد. لە بارەی زمان و ئەدەبی خۆیان لێکۆڵینەوەیان ئەنجام دا.بایەخیان بە زمان و کەلەپوری خۆیان داو ئەدەبی خۆیان پێش خست. ئاخاڤتن و نووسینیان بە زمانی خۆیان درێژە پێدا، زمانی تورک و کولتوری عوسمانیان وەلا نا. کاتێ کە دیتیان لەم بوارەدا پێشکەوتنیان وەدەست هێنا، ئەمجار بریاریاندا جیا ببنەوە لە تورکیا و خەباتیان دەست پێکرد.»(١٤)

بۆ چوونێکی زۆر راستە. ئەگەر میللەتانی باڵکان بە خوتبەی ئیسلام بەسترابانەوەو دژایەتی (خەلیفەی ساختەچی ئیسلام) یان پێ کوفر و گوناح بایە، بە دەردی کورد دەچوون و لە جیاتی خزمەت بە زمان و کولتوری خۆیان ، خزمەتیان بە زمان و ئەدەب و کولتوری بێگانە دەکرد.

**دوکتور داوەری شێخاوەندی** دەنووسێ:« لایان وابوو بە ناوی سیاسەتی نوێ‌سازی و میللەت سازیو دامەزراندنی حکومەتی ئیداری ونیزامی ناوەندی و بە پەرە پێدانیزمانی فارسی و یەکسانکردنی نەزمی پەروەردەو فێر کردن و داهێنانی لیباسی یەک شکڵ و قەدەخە کردن و بە سوک گرتنی جل وبەرگ و زمان و زاراوی قەومی - ناوچەیی دەتوانن وردە وردە رەنگ و نیشانی قەومەکان لە ئێران پاک کەنەوە وتەواری خەڵک بە شکڵی(میللەتی ئێران) و بە کراسی فارسی برازێننەوە.» (١٥)

ئەم هەوڵ و تەقەلایە بۆ کوێر کردنەوەی شوێنەواری زمان و ئەدەب و کولتوری کوردی دوای روخانی حکومەتی رەزا شاش لە لایەن شوڤێنیزمی فارس و دەزگا دەوڵەتیەکانەوە هەر بەر دەوام بوو تا ئێستاش درێژەی هەیە. گۆڤاری ( تهران

خوێندوویانە. شوێنەواری شومی ئەو بێگانەییە گەیوەتە ناوەندی تارانیش. بێگومان بۆ ئێوەی خوێنەری خۆشەویست هاتۆتە پێش کە لە کۆڕێک دا بەشدار بوون تا سەعاتێک بە خۆشی رابیوێرن. لە پڕ لەم دانیشتنەدا عەرەب، تورک، کورد یا بلوچ پەیدا دەبن و لە نێو خەڵک دەست دەکەن بە ئاخاوتنی زمانی خۆیان کە دەبێتە هۆی بێزاری دانیشتوان و هەموو لە ئاست ئەوانە خۆیان بە بێگانە دەزانن. ئەمە خەراپترین عادەتی قەومی ئێرانیانە. بەم چەشنە کاتێ سەیری نەخشەی جوغرافیایی ئێران بکەین دەبینین هەر قوژنەی خەڵکێک گرتوویەتەوە و خاوەنی رەگەز و زمان و داب و نەریتی تایبەتی خۆیانن. ئەوانەش بوونەتە هۆی جیاوازی و چەند دەستەیی ئەفرادی ئێرانی.

رێگای چارە.؟ تاقە رێگایەک هەیە، رێگایەکی هاسان و کردەیی. بەڵێ، چارەی ئەم گیرو گرفتە لە وانەیە لە دوا رۆژدا بۆ وڵاتی داریوش و دارا مەترسی هەبێ. رێگایەکی هاسانی هەیە. تاقە رێگای چارە ئەوەیە کە لە سەرانسەری وڵات دا زمانی فارسی پەرە پێبدەین. لە پێناو ئەم پەرە پێدانەدا ئەوەندە تێبکۆشین کە ئیتر ناوچەکانی ئازربایجانی رۆژ هەڵات و رۆژ ئاوا، ناوچەی کوردستان و ئابادان، تورکی و کوردی و عەرەبی لە بیر بەرنەوە. ئەوانیش وەک ناوچەکانی فارس بە فارسی بنووسن و بخوێننەوە و بە فارسی بدوێن. پێویستە دەست بە کار بین. تێبکۆشین. وابکەین لە هەموو شوێنێ، لە گەرانێ، لە ئیدارە، لە مزگەوت، لە کۆڕی دینی و مەزهەبی و لە ئاخافتنی جۆر بە جۆردا بە فارسی قسە بکەن. ئەم کارە دەبوایە لە سەرەتاوە کرا بایە. ئیمرۆ دوای نیو سەددە لە دامەزرانی فەرهەنگ و کلاسی تازە رادەبرێ، دەبوایە هەموو ئێرانیەکان بە یەک زمان قسە بکەن. لە باری خوێن و رەگەز و زمانیشەوە یەکسان بن. بەڵام بەداخەوە لەم کارەدا کەمتەر خەمی کراوە. ئەم کارە کە بناخەی سەر بە خۆیی وڵات پتەو دەکات بایەخی پێنەدراوە..

ئاخرین پەیڤ! ئاخرین وتەم ئەوەیە کە زمانی فارسی وەک رەگەز و خوێن

دەبێ بە نێو دەماری تەواوی ئەفرادی ئەم وڵاتەدا بڕوات. ئیتر هیچ هێزکارێکی بێگانە پەیدا نەبێت و ۲۰ میلیون ئێرانی کاتی چاو پێکەوتن لە گەڵ یەک نەکاتە بێگانە. پێویستە ئێران هەر وەک لە ڕابردووی پڕ لە شانازی تێن وەر دەگرێ و خوێنی سووری ئارییایی لە دەمارەکانیدا دەسووڕێتەوە، بە زمانی شیرینی فارسی قسە بکا. ئێرانی دەبێ لە زمانی حەماسە ئافەرینی گەورەی ئێران ئەبولقاسمی فیردەوسی توسی و هەزاران ئەستێرەی پرشنگداری دیکە کە بە ڕاستی پاسدارانی وشەی ئێرانی بوون تێبگا و هەمیشە لە بیرو باوەری ئیلهام بەخشی ئەوان کەلک وەر بگرێ.»

ئەم نووسینە نموونەیەکی بچووکە لە بیر و بۆ چوونی ڕەگەز پەرستی و شۆڤینیستی کە لە مێشکی قەڵەم بە دەستانی نەتەوەی باڵا دەستی فارس و لە نێو دام و دەزگای حکومەتی تاراندا پەنگی خواردۆتەوە. بە لام دوکتور خوراسانی سەرەرای هەستی ڕەگەز پەرستی، بێ ئەوەی بخوازێ دانی بەوەدا ناوە کە :« لە هەر گۆشەیەکی ئێران خەڵکێک هەن، فارس نین و خاوەنی مێژوو ڕەگەز و زمان و ئەدەب و کولتوری تایبەتی خۆیانن» واتە ئەوان لە فارس جیاوازن و نەتەوەی سەر بە خۆن و لە ژێر ستەمی نەتەوایەتیدا بەند کراون و بۆ پچڕاندنی ئەم بەندە و ڕزگاری لە ژێر دەستی و پەرە پێدانی زمان و کولتوری خۆیان خەبات دەکەن. پێم وانیە ڕاوێژ و پێشنیاری ڕەگەز پەرستانەی دوکتور خوراسانی و سەر نێزەی حکومەتەکەی بتوانی ئەم نەتەوانە بتوێنێتەوەو وازیان پێ لە خەبات و لە زمان و کولتوری خۆ بێنێ. لە دنیای ئیمڕۆدا ئەم شێوە بیرو بۆ چوونە ئەگەر بەیت و باوی ئیسلامەتیشی ڕەگەڵ خەبت، دیسان هەر مەحکوم کراوە .

لە گەڵ سیاسەتی کوێر کردنەوەی کولتوری میللی کورد و پەرە پێدانی فەرهەنگی ملهوری و ئیستیعماری، کردەوەی زوڵم و زۆریش لە ڕێگای ئەفسەرانی ئەرتەش و ژاندارمری بەوە لە کوردستان درێژەی هەبوو. ئەفسەرانی ئەرتەش و ژاندرمری لە مەرکەز کوردستانیان بە ئیجارە دەگرت و دەهاتن بە گیان وماڵی

خەڵک وەر دەبوون و چەند ئەوەندە زیاتر لە ئیجارەکەیان لە خەڵکی کورد دەستاندەوە. حوسێنی فردوست لە بیرەوەرەکانیدا دەنووسێ:« رەزاخان هەموو فەرماندە نیزامیەکان و مەعمورەکانی بەردەستی خۆی دەوڵەمەند کردبوو بێ ئەوەی لە گیرفانی خۆی قرانێکیان بداتێ. دەیگوت: بچن بۆ خۆتان مڵک و پارە پەیدا بکەن. بەمجۆرە دەستی ئەفسەر و ژاندارمی لە راو رووت و تالأنی خەڵکدا ئاوالە کرد بۆوە. جاری وا هەبوو مڵکێکی ٥٠ هەزار تمەنیان بە هەزار تمەن لە خاوەنەکەی دەستاند.» (١٦)

ژاندارمە بە بیانووی گۆرینی جل و بەرگ و دۆزینەوەی ماڵی قاچاغ و ئەستاندنی مازادی گەنم لە دێهات ئاگریان دەکردەوە.. دیارە روشەڵی و زۆرداری ژاندارمە هەر بۆ کوردستان نەبوو. عێل و عەشایری تری غەیرە فارسیش لە بەر دەستی ئەرتەش و ژاندارمەدا دەتلانەوە. « سەروانێک دەبێتە مەعموری نیشتە جێکردنی قەشقاییەکان. سەروان سەگێکی دەبێ و دەترەکێ دوو گجولان دینێ. چەند منداڵ لە تایفەی (ئەژدیها کوژ) سەگی سەروانی دەبەن و دەیفەوتێنن. سەروان سێ ژنی منداڵە بەر دینێ و مەجبوریان دەکات شیر بدەن بە گجولە سەگەکان.» (١٧)

ئاغایەتی فارسەکان بە سەر کەمایەتیەکاندا و حکومەتی ناسیونالیزمی فارس بە سەرۆکایەتی دەرەبەگ و بورژوازی فارس دەسەلأتی خۆی بە سەر هەموو ئیراندا سەپاند. (١٨)

پێشەوا **قازی محەمەد** لە وتارێکی خۆیدا بە کورتی پەردە لە سەر جنایەتی حکومەتی عەجەم لا دەداو دەڵێ: « کێ بێ نەیبیستبێ کە بە چ فێڵ و نامەردیەکی دە زەماین تەجەراندا **جەعفەرئاغای شکاک** لە تەورێزێ کوژرا.کوشتنی **هەمزەئاغای** مەنگور و هەزاران ئەمسالی وایان نە بیستبێ؟ کێ بێ نەیبیستبێ کە بە چ ناجەوانمەردیەکی قشونی رەزا خانی پەهلەوی چۆن دە وەختێکدا کە ئاراراتی گەرمی شەرێ لە گەڵ تورکان بوون چ ناپیاوانە و نا

جەوانمەردانە وە نێو ژن و منداڵی کوردان کەوتن. ئەعوز وبیلا چیان بە سەر هێنان و چیان لێکردن. جەلالی چۆن هەموو بار کران و دەگەڵ هەزاران ماڵی کوردی لای وان هەر یەکەی بۆ نوقتێکی ئێرانێ بران. ئەلئانیش بەشی زۆریان کەس نەیزانی چیان لێ هات و چۆن تەلەف بوون. ئەو دەردەی دایان بە گەڵباغیان کە بە زستانێ باریان کردن سەدها منداڵیان دە بەفرێ دا قڕ بوون و پیاویان دەستو پێیان سەرما بردی و گەڵێندرانە شارانی هەرە دووری ئێرانێ و بە ئەشەددی عەزاب بەشی زۆریان تەلەف بوون. هەتکی ناموس ر بێ عیفەتیەکی کە دەو هەموو کارانەدا بە سەر کورد دا هات شەرمێ دەکەم شەرحی بدەم و تا ئەوڕۆ بەشەر نەیکردوە. کاری ئەمنیە یان چی لێ بلێم، سەر تا سەری ئێرانێ دۆست و دوژمن شاهیدی فەجایع و جینایات و هەتکی ناموسی وانە. حەتتا تەعەروزیان بە پیاوان دەکرد. شەهرەبانی و نەزمیەیان سەد لە ئەمنیە خەراپتر، عەدلیە مەرکەزی تالان و بڕۆ و رووتاندنەوەی خەڵکی بوون... ئەوەی سەرتیپ هوشمند بە سەر بانەو هەورامان و مەریوانی هێصنا دنیا بیستوویە..»( ١٩ )

گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە سەر دەمی حکومەتی رەزاشا بەرەو فەوتان و توانەوە دەرۆیشت. تۆزێک بیر کردنەوە لە چارە نووسی ئەم میللەتە و لە بێدەسەلاتی و خۆ بە کەم زانینیان، دووکەڵ لە تاخی مرز هەڵدەستێنێ. تۆ تەماشای ( گولزاری شاعیرانی کوردستان ) بکە کە سەید عبدالحمیدی حیرەتی سەجادی شیعری ٢٥٠ شاعیری کوردی کۆ کردۆتەوەو لە کتێبێکی ٢٨٥ لاپەرەییدا چاپی کردوە،لە داخ و حەسرەت زیاتر چیت بە بیر و مێشک دا دێت؟ یەک شیعری بە زمانی کوردی تێدا نادۆزیەوە. بێگومان زۆر لەم شاعیرانە بە زمانی خۆشیان شیعریان گوتوە. بەڵام یا نەیانوێراوە بڵاوی بکەنەوە، یا لە بەین چوون، یا بەشی هەرە زۆریان هەر وەک زانایانی ئایینی کورد و مەلاکان بایەخیان بە زمانی خۆیان نەداوە و لە دەریای ئەدەب و زمانی بێگانەدا مەلەیان کردوە و تووشی گێژاو بوون. ئەوە نەک هەر لە باری کولتور و زمانەوە، وەک پێشتر

باسکرا، بەڵکو لە باری ئابوری و بژیوی رۆژانەشەوە کورد لەو پەری شپرزەیی دابوو. فەلاح و زەحمەتکێشی گوندی لە کوردستان لە ژێر باری قورسی دوو جورە ستەم و چەوساندنەوەدا پشتی چەما بوو. بەشێکی ئەم چەوساندنەوە وەک ستەمی نەتەوایەتی خاوەن مڵک و دەرەبەگی کوردیشی دەگرتەوە. خاوەن مڵک و دەرەبەگی کورد لە بەر دەستی ژاندارم و سەر باز و عەجەمی شڵتاخچیدا رەزیل و داماو ویێدەسەلاّت بوو. ماموستا هەژاری رەحمەتی لە بارەی بێدەسەلاّتی دەرەبەگ و خاوەن مڵکی کوردەوە دەڵێ:

**« میللەتێک هەن لە نێو مە عاشیرەت - خۆ بە خۆ شێر لە غەیرە بێ غیرەت »**

**« هەر کە تورکێک گرتی چەکێ دالی - کونە مشکێک لە وان نیە خالی»**

بەلاّم هەر ئەو بندەستانەی ژاندارم و عەجەمی بەرەلاّلە رۆتاندنەوەو چەوساندنەوەی خەڵکی خۆیان و ئاکار و کردەوەی دزێو وناپیاوانە لە گەڵ یەکتر پێش برکەیان بوو.

وەرزێری(١) کورد جگەلە مڵکانەی رەسمی و باو بە گوێرەی داب و شوێنی مەڵبەند و ناوچە جیاوازەکانی کوردستان کە بە زۆربە (دەو دوو، سێ یەک، نیوە کار و لە دینەکار دەیەکی) دەگرتەوە دەبوایە سەرانەو باج و بێگارو سوروساتی‌دیکەش بدات. وەک: **سەرانە یا بێگار، قروجانە، هێلکانە. مەرانە، خوریانە. داسانە، کایانە، تەپالأنە، جیژنانە، کوێخایانە، گزیرانە، پێشکێش، بەندەوان ،** ..هتد

**سەرانە یابێگار:** هەمور رەعیەتێکی گوندی دەبوایە لە ساڵدا چەندرۆژ بە بێگار واتە بە لاش بۆ ئاغا کار بکات. لە هێندێ گوند وەرزێری وا هەبوو رۆژە بێگارەکانی دەکریەوە.چونکە ئاغا خۆی ئەوەندە روت و برسی بوو، هیچ کارێکی نەبوو بە کابرای بکات، پارەی لێ دەستاند. پێیان دەگوت سەرانەدەڵێن لەگوندی

کەریزەی گڵی لە ناوچەی بوکان١٣ ئاغاو ١٢رەعیەت دەژیان. یەک لە ئاغاکان ببوە کارداری رەعیەتێکی خۆی. بەلاّم لەمانگدا دوو رۆژ نەدەچوە سەر کار. کابرای رەعیەت دەیگوت: کاکە :جوتەکە راوەستاوە بۆ نایەی؟ لە وەلاّم دا دەیگوت: ئەوە وەبەر رۆژە بێگارەکە بکەوێ ئەورۆ نایەمە کار!

**فروجانە:** هەموو ماڵە رەعیەتێک دەبوایە ساڵێ چەند فروج بدا بە ماڵی ئاغا.

**هێلگانە:** هەموو ماڵە رەعیەتێک دەبوایە ساڵی چەند هێلکە بدا بە ماڵی ئاغا.

**مەرانە** : مەر دارەکان دەبوایە ساڵێ چەند حەیوانی گۆشتی بدەن بە ئاغا.جگە لەوە ئاغا زەکاتی حەیوانیشی‌دەستاند. ئەوە » بە گوێرەی دابی ناوچە و یا روشەڵی ئاغا. **مام عەزیزی** ئاغای کێلێ سیپان لە نێو مامەشان لە ٤. حەیوان یەکێکی دەستاند. لە هێندی ناوچە دمبر دەیانبریەوە چەند حەیوان بدەن بەئاغا. پێیان دەگوت مەختە.

**خوریانە** : هەموو مەردارێک دەبوایە ساڵێ چەند خوری بدا بە ئاغا. پاشان ژن و کیژی گوندی دەبوایە وەکو بن، ئەو خوریانە بشۆن و بە شانەیان کەن و بە سەر ماڵانیان دا دەبرین بیرێسن. بەوەشیان دەگوت تەشیانە.

**داسانە** : لە هێندێ ناوچەی کوردستان وەرزێر چەند پاڵەی بۆ گیا دروون هەبایە، دەبوایە پاڵەی دراوێک بدا بە ئاغا.

**کایانە** : هەموو ماڵە وەرزێرێک دەبوایە چەند رەشکە کا، یا عارەبە کا، یا چەند باقە وێنجە و گیا بدا بە ماڵی ئاغا.

**تەپالانە** : هەموو ماڵە رەعیەتێک دەبوایە ساڵێ‌ئەژمارێک تەپاڵە بدا بە ماڵی ئاغا. لە هێندێ شوێن هەموو ماڵە رەعیەتێک دەبوایە ساڵێ چەند بارە دار و یا گوێنی سوتەمەنی بۆ ماڵی ئاغا بێنێ. لە شارویران و سندوسی مڵکی ئاغایانی دێبوکری هەموو ماڵە وەرزێرێک دەبوایە لە نیزیکی شوشەوانی بەری عەجەمی و

لە پایین ڕێگای دوو شەو ڕۆژ عارەبە دارێک بۆ ماڵی ئاغا بێنێ. گوندی وا هەبوو دوو کەرەتیان پێ دەکردن.

**جێژنانە** : هەموو جێژنەیەک دانیشتوانی گوندی دەبوایە بە ماڵی ئاغایەوە بچن. بە گوێرەی‌بارودۆخی ژیانی ڕەعیەتەکان لە وشتر و ئەسپ و جوانەگاو نێری و بەرانەوە بگرە تا مامر و کەڵە شێر و کەللە قەندی بۆ بەرن. ئەم بەزمە بۆ هاتنەوەی ئاغا لە سەفەری دوریش هەر بە ڕێوە دەچوو.

**کوێخاپانە** : ئاغا کوێخا یا گزیری ڕادەگرت و دە لاقی خەڵکی بەر دەدا ومووچەو بەراتیشی لە خەڵکی گوندی دەستاند

**پێکێش** : ئەگەر لە گوندی کیژێک بە شو درا با و یا کورێک ژنی هێنا بایە، یەکەم دەبوا ئاغا ڕازی بێ دوەم دەبوایە پێشکێش بدرێ بە ئاغا و بە گوێرەی ژیانی کابرا ئاغا پێشکێشی دەستاند ، ئەوەش لە پارەوە

بگرە تا دەگاتە ئەسپ و جوانەگا و بەران و ماقور و شتی تر، دەبوایە بدرێ بە ئاغا.

**بەندەوان** : هەموو ماڵە وەرزێرێک دەبوایە ماوەی ٣ مانگان زەلامێک بدا بە ئاغا. جگە لەوە کە بەهاران بەند و جۆماڵیان پێدەکردن و بۆ مەزراو ئاو داشتنی کشت وکاڵ پێویست بوو، ئەویتر ئاغا قورە کاری و سواغ و تەکمیشی باغی پێدەکردن.

**کۆچ وبار** : وەرزێر و مسکێنی کورد لە بەر نەبوونی زەوی و مڵکی تایبەتی و دەراوی ژیان و زوڵم و ناهەقی خاوەن مڵک زەحمەت وابوو چەند ساڵ لە گوندێک ڕیشە داکوتێ و نیشتە جێ بێت. بە ناچار باری دەکرد و بۆ گوندێکی دیکە. ئەگەر وەرزێری بار کردوو ماڵێکی ئامپا و دەست ڕۆیشتوو بایە، ئەوا ئاغا ڕێگای نەدەدا و بێنووی سەیری بۆ دەدیتەوەو بەرتیلی لێ دەستاند و جاری وا هەبوو لە سەر بار کردنی ڕەعیەتێک لە نێوان دوو خاوەن مڵکدا کێشە ساز دەبوو. خۆ ئەگەر بۆ نێو عەشیرەتێکی دیکە چو بایە هەر بە زەحمەت دەر باز

دەبوو. تا ساڵەکانی ۳۰ لە بەشی گەورگایەتی کوردستانی ئێران رەعیەت نەیدەتوانی بار بکات و بەسترا بۆوە بە زەوی. « لە وڵاتی گەوروس و کوردستان رەعیەت کاتی گۆرینی جێگا و بار کردن لە گوندێک بۆ گوندێکی دیکە، مەجبور بوو پارەیەک بۆ ئازاد بوونی بدا بە پێشکاری ماڵیە و یا بە ئاغا و پسولەی ئیجازەی ماڵ بار کردن وەر گرێت. بە بێ پسولەی ناو براو هیچ رەعیەتێک مافی ئەوەی نە بوو بار بکات و جێگای بگۆرێ. »(۲۰)

وەرزێری کورد نەیدەتوانی تەنانەت بەرهەمی ساڵانەی کشت و کاڵی خۆشی بە خاوەن بکا و بە دڵخوازی خۆی بە کاری بێنێ. لە سەر خەرمان ژاندارم بۆ ئەستاندنی دەغڵی زیادی بە گوندی وەر دەبوون و کاغەزیان لە خاوەن مڵک دەستاند کە دەغڵی زیادی بۆ ئیدارەی دەوڵەتی بەرێ و بە دەوڵەتی بفرۆشێ. خاوەن مڵکیش گەنمی لە وەرزێران دەستاند و دەیبرد بۆ ئیدارەی غەللەی دەوڵەتی. بە چەندیان دەکری و چەندیان ئوفت لێ دەر دەکرد وچەندیان پارە دەدا بە خاوەن مڵک و ئاغا چەندی دەدا بە وەرزێری خاوەنی ئەسڵی کەس سەری لێ دەر نەدەکرد. زۆرجاری واهەبوە کابرای جوتیار لە سەرخەرمان پاش مڵکانەی ئاغا و بەندەوان و سەرکارانە و کوێخایانە و مەلایانە و شوان وگاوان و قەرزی سوت و سەلەمخۆر هیچی بۆ نەماوەتەوەو بە دەست راوەشاندن بەرەو ماڵ بۆتەوە. ( بروانە بەرگی یەکەمی لە بیرەوەریەکانم) گەریمی حسامی

ئەم داب و یاسا چەپەڵە لە بارەی توتن و چەوەندەریشەوە کە داهات و بەرو بووی هەرە سەرەکی و گرنگی زەحمەتکێشانی کوردستانە هەر ئاوا بەرێوە دەچوو بەڵکو خەراپتریش.لە کوردستان بە گوێرەی دابی ئاغاو رەعیەتی توتن و چەوەندەر لە گەڵ خاوەن ملک بە نیوەیی بوو. بەڵام دەولەت بەرهەم هێنەری ئەسڵی کە وەرزێرە، بە رەسمی نەدەناسی و لەگەڵ خاوەن مڵک پەیمانی دەبەست. وەرزێر بەرهەمەکەی پێدەگەیاند و دەیبرد تەحویلی دوخانیە و یا کارخانەی قەندی دەدا ئاغا و خاوەن مڵکیش دەچوو پارەکەی وەر دەگرت و لە سەر حیسابی رەنج

و کوێرەوەری وەرزێر رایدەبوارد و ئەگەر بە درێنگەوە ئاغا شتێکی دابایە دەنا نەیدەوێرا هەر پاسیشی بکا.

دەرەبەگی کورد سیستمی دەرەبەگایەتیشی لە بێگانەوە بۆ بە میرات بە جێ ماوە. کورد وەک میللەت کە بە تێکرایی دوا کەوتوو بوە، دەرەبەگەکەشی هەردوا کەوتوو بوە. لەو میراتەش دەرەبەگی کورد بەشی خراپەکەی وەرگرتوە و قەت نەیتوانیوە و نەیویستوە دام و دەزگایەکی پێشکەوتووی روناکبیری کتێبخانە و موسیقا و نیگار کێشی و بیناو کۆشکی تاریخیو داب و رەسمی بەرزی ژیانی ئوروپایی دامەزرێنێ و بۆ نەتەوەکەی وەک کەلەپوری کوردی بەجێی بێلێ. لە ئابیتەوە بگرە تا شێوەی ستەم و چەوساندنەوە و دیاردەکانی سەر خانی کۆمەڵی لە داگیر کەرەوە بۆ بە جێ ماوە و لە بێگانە بالاّ دەستەکان فێر بووە و بە شێوەی خەرابتریش درێژەی پێداوە. بە قەولی زانای بەرێز **مامۆستا مەسعود محەمەد** رەنگە راوە کەروێشک و شەرناخێوی و نیشانە داگردن و خۆ خۆری و یەکتر کوشتن هی خۆی بێت، ئەویش لام وایە بۆ شانازی و خۆ پێوە هەڵنان نابێ. هێندێ لە نووسەرانی کورد سەبارەت بە هەڵکەوتی کۆمەڵایەتی و چینایەتی خۆیان و یا شارەزاییان تەنیا لە ناوچە و مەڵبەندی دەوروبەری خۆیان جاری وا هەیە لە باسکردنی دەرەبەگ و سیستمی دەرەبەگیەتی لە کوردستان تارماییکی دیفاع لە دەرەبەگ و کەمکردنەوەی ستەم و ملهوری و خۆفرۆشی دەرەبەگی کورد و تەنانەت نەفی دەرەبەگایەتیش لە کوردستان لە سەر لاپەری نوسینەکانیاندا خۆ دەنوێنێ.لە کاتێکا بە بۆ چوونی من شیکردنەوەی سیستمی دەرەبەگایەتی تەنیا مڵک زۆر بوون و یا دەسترۆیی و نەداری تاکی دەرەبەگ نیە. پێویستە شێوەی رەفتار و عەلاقات و هەستان و رۆنانی ئەم توێژە و یا چینە کۆمەلایەتیە لە کۆمەڵگای کوردەواریدا شیبکرێتەوە. رەنگە لە نێو خاوەن مڵک و دەرەبەگی کورددا پیاوی نیشتمانپەروەر و بێ زەرپش هەڵبکەوێ. بەلاّم ئەوە بە دەگمەنە و سیتمەکە ناگرێتەوە. من لە سەرەتای ئەم نووسینەدا باسی خانانی هەرمیلەم کرد کە

هەموو ژیانی پێ ئەوە بوو کە ( دوو کرمانج بێنێ لە سەر بانی دوو شەقیان لێدات و دوو سەگبابیان پێ بڵێ. ئەم باسە شیکردنەوەی بابەتی گەرەکە و یەک لەو مەسەلانەیە کە ساخکردنەوەی لە بەرژەوەندی بزووتنەوەی کورد دایە.

ئەمانە نموونەی پچوکەن لە دەست درێژی و زوڵم و جنایەتی هێندێ دەرەبەگی کورد و ئەگەر کشتیان کۆ بکرێنەوە، بە قەولی فارسان مەسنەوی ٧٠ من کاغەزی دەوێ.

رەشایی و هەژاری کورد لە بەر نەداری و بێکاری ناچار بوون روو بکەنە بەری عەجەم و چوغری ورمێ بۆ فەعلەیی و دوو سێ مانگ لە ماڵ و منداڵی خۆیان دوور بکەونەوە. پاش ٥٠ ساڵ ئێستاش کوردستانی ئێران هەر لەم حاڵە دایە. ئێستاش هەزاران کەسی کورد لە بەر بێکاری و نەداری بە ماڵ و خێزانەوە روو دەکەنە شارەکانی عەجەمستان و لە کورە خانەکان‌دا فەعلەیی دەکەن.

حکومەتی رەزا شا هەر چەندە لە رێگای ئەرتەش و ژاندارم و ئینتزاماتی عەشایری و سەر نێزەوە دەسەڵاتی شومی خۆی بە سەر کوردستاندا سەپاند بوو، بەڵام دیسان لە بێزاری و تورەیی و سەربزێوی خەڵک هەر دەترسا و دڵنیا نەبوو. ساڵی ١٩٣٥یاسای دانانی کوێخا سجیل(موختار)ی لە گوندەکان هێنا کایەوە. بە گوێرەی ئەم یاسایە دەبوایە لە هەموو گوندێک کابرایەک بە کوێخا سجیل دیاری بکرێ. ئەوەش دەبوایە ئاغای گوندی دیاری بکات و بەراتیشی لە خەڵک بستێنێ. کوێخا سجیل لە ئیدارەکانی دەوڵەتی نوێنەری ئاغا و لە گوندیشدا نوێنەری دەوڵەت بوو. حکومەت لە رێگای کوێخا سجیلەوە چالاکی و هەلسورانی خەڵکی دەخستە ژێر چاوە دێری و دەبوایە هەموو کارو باری گوندی مانگێ جارێک بە ئیدارەی ژاندارمەی ناوچە رابگەیێنێ. لە یاسای دانانی کوێخا سجیل دا نووسرا بوو: « کوێخا نوێنەری خاوەن مڵک و بەر پرسی پاراستنی نەزم و هێمنایەتی و قانونە لە گوندی‌دا» بە کورتی کوێخا سجیلیش لە رووتاندنەوەی خەڵکدا ببوە شەریک و هاو دەستی ژاندارم و کار بە دەستانی حکومەت.

## بێزاری خەڵک لە ڕژێمی پەهلەوی.

ستەمی نەتەوایەتی و زوڵم و زۆر داری ژاندارم و کار بە دەستانی حکومەتی پەهلەوی ڕۆژ لە گەڵ ڕۆژ کۆمەلانی خەڵکی لە حکومەت پتر تووڕەو بێزار دەکرد. دژایەتیەکی توند و ئاشکرا لە ئاست ژاندارم و ئەرتەش و مەعمورەکانی دەوڵەت لە نێو خەڵکدا خۆی دەنواند. بە گۆرانی و مەتەڵۆک و ناو ونرتکەی وەک: قوڵە شێن و جوجە خۆر و تریاکی و چی و چی بێزاری خۆیان دەر دەبری.(٢١)

وەک بیستوومە مەلا دەڵێن کەسێک دەستی نەروا خێر و خێرات بکا، هەر بە قسە لەعنەت لە شەیتان بکات، خوا بە خێری بۆ دەنووسێت. بەڵام بێزاری کورد لە ڕژێمی پەهلەوی لەوەشی تێپەراند بوو. جار وبار لە هەر شوێنێ دەرفەتیان هێنا بایە، خەڵک دەستی لە ژاندارم دەوەشاند و لە خوێنی دەگەوزاند.(٢٢)

لە ساڵەکانی ١٩٣٠-١٩٣٧ کۆمەڵێکی سیاسی - کولتوری لە ناوچەی موکریان دادەمەزرێت و لە گەڵ حیزبی(خۆیبون) و شۆرشی ئارارات لە پێوەندی دا دەبێ و هەر وەها لە گەڵ تێکۆشەرانی کوردستانی خوارویش پێوەندی دادەمەزرێنێ. وەک شەهید ماموستا حەسەنی **قزڵجی** باسی دەکرد، دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە بریتی بوون لە : پێشەوای شەهید **قازی محەمەد**، **قازی کاکە حەمەی بۆکان**، **شێخ ئەحمەدی سرێلاوا** و **مەلا ئەحمەدی فەوزی**. پتر بۆ بلاو کردنەوەی کتێب و نووسراوەی کوردی و پاراستنی زمانی کوردی تێکۆشاون. ماموستا **فەوزی** لە سولەیمانیەوە هاتۆتە دیوی موکریان، لە نێو بزووتنەوەی کوردستانی خوارو و ڕاپەرینی **شێخ مەحمودی** نەمر چاوی کراوەتەوە و لە وریا کردنەوەی هەستی نەتەوایەتی و تێکۆشان بۆ پەرە پێدانی زمانی کوردی دەورێکی بالای هەبوە. ڕەنگە ئاقە مەلای نیشتمانپەروەری ئەو دەمی بوو بێ کە هەستی کوردایەتی لە کوردستانی ئێراندا

بلاو کرد بێتەوە. بە داخەوە نەلەبارەی ئەو کۆمەڵە و نە لە بارەی ماموستا فەوزیەوە نووسراوەیەک بە جێ نەماوە مەگەر بۆ ناساندنی پتری مەلا ئەحمەدی فەوزی پەنا بۆ نووسراوەی ماموستا هێمنی ڕەحمەتی بەرین.

شاعیری میللی کورد ماموستا هێمن لە بارەی مەلا ئەحمەدی فەوزی‌یەوە دەنووسی:« ماموستا فەوزی لە گوندی کولیجە مەلایەتی دەکرد. دەبێ بلێم من دەستکردی فەوزیم. ئەو هەلی وەشاندمەوە، تێکی هەڵشێلام و سەر لە نوێ دروستی کردمەوە. ئەو دەرکی زانین و فێر بوونی بۆ کردمەوە. ئەو ڕێگای ژیانی پێ نیشاندام.بێگومان ئەگەر نە چوبامە خزمەت فەوزی و لە کەن ئەو ماموستایە نەمخوێندبایە، ڕێبازی ژیانم ئەو ڕێبازە نە دەبوو کە گرتم و پێیدا ڕۆیشتم و ئێستاش بەرم نەداوە. ئەو تێیگەیاندم من ڕۆڵەی کوردم و کوردیش نەتەوەیەکی بێ بەش و چارە ڕەش‌و زۆر لێکراوە و دەبێ ڕۆڵەکانی لە پێناو ڕزگاری کردنیدا فیدا کاری بکەن و لە خۆ بوردوویی نیشان بدەن........ ئەو حالی کردم کوردی زمانێکی ڕەوان و بەر بلاو ودەوڵەمەندە و دەکرێ ئەدەبێکی گەورەو دنیا پەسندی هەبێ.ئەو حاجی قادری کۆیی، نالی، کوردی، سالم، مەولەوی، حەریق، مەحوی، ئەدەب و وەفایی پێ ناساندم و شیعرەکانی ئەوانی بۆ شیکردمەوە..... فەوزی بە بڕوای من یەکێکە لەو گەورە پیاوانەی مێژووی کوردستان کە داخەکەم شوێنەوارەکانی فەوتان و خۆشی لە بیر چۆتەوە. ئەو لاوە کوردانەی لە سەردەمی پاتشایەتی ڕەزاخانی پەهلەوی دا کە بە تەقلیدی ئەتا تورک خەریک بوو گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا بتوێنێتەوە و یەکێک لە سێ کوچکە ئاورە بوو کە پەیمانی سەعدآبادی پێک هێنا بوو ، نازایانە کوردایەتیان دەکرد، یا ڕاستەو خۆ شاگردی فەوزی بوون ،یا شاگردی شاگردەکانی ئەو..» (٢٣)

ئەو لاوە کوردانەی کە ماموستا هێمنی شاعیر ئاماژەیان بۆ دەکات ، دەبێ هەر ئەو کۆمەڵە پچوکە بووبێ کە لە گەڵ مەلا ئەحمەدی فەوزی لە

ئەو لاوە کوردانەی کە ماموستا هێمنی شاعیر ئاماژەیان بۆ دەکات ، دەبێ هەر ئەو کۆمەڵە پچوکە بووبێ کە لە گەڵ مەلا ئەحمەدی فەوزی لە تێکۆشانی کوردایەتی دابوون. یا دەکرێ ئەندامانی ئەو دەستەیە بوو بن کە لە ساڵەکانی ۹۳۵ دا لە سابلاغ کۆمەڵێک بە ناوی(محەمەدی) بە سەرۆکایەتی نیشتمانپەروەرێک بە ناوی محەمەد خەتیو دادەمەزرێنن. ئەم دەستەیە کتێب و رۆژنامەی کوردی وەگیر دەخەن و لە نێو خەڵکدا باسی سیاسی بلاّو دەکەنەوە. زۆربەی بەشدار بوانی ئەم دەستەیە لە زەحمەتکێشانی توێژی خوارووی کۆمەڵبوون. دیارە هەر ئەوەی هۆیەک بوە کە نەتوانن نووسراوەیەک سەبارەت بە ئامانج و مەرامی خۆیان بلاّو بکەنەوە. بە تایبەت لە سەردەمی حکومەتی رەزا شادا کە هەموو بیرو باوەر و بزووتنەوەیەک خەفە کرا بوو. دیار نیە ئەم دەستەیە لە تێکۆشاندا چەند بەر دەوام بوە، ئەوەندەیە محەمەد خەتیو لە لایەن دەستەیەکی دەوڵەمەند و توێژی سەرووی کۆمەڵەوە کوژراوە.» (٢٤)

حکومەتی رەزا شا نەیتوانی گیانی ئازادیخوازی و بیری نیشتمانپەروەری کوردایەتی لە جەستەو فیکری روناکبیرانی نیشتمانپەروەری کورد دا بمرێنێ. بیری ئازادی و رزگاری بە شێوەی جۆر بە جۆر لەو سەر دەمە تاریکەدا لە بەرهەمی روناکبیرانی کوردستاندا دەنگی داوەتەوە. لە نێو رۆناکبیراتی ئەم بەشەی کوردستاندا شاد رەوان حەسەن سەیفی قازی ناسراو بە ( سیف القضاه ) و ماموستای شاعیرانی موکریان لە بەستە شیعری (کوردینە)دا زۆر بە ئاشکرا و بە ئازایی بێ بەشی و ژێر دەستی کورد نیشان دەدا و کوردەکان بۆ خەبات و بەر بەرەکانی هان دەدا. شاعیر بێ خوداتی و بێکەسی کورد لە گەڵ بارو دۆخی بالاّدەستەکانی کورد پێک دەگرێ و دەڵێ :

« کوردینەتا کەی ئێمە لە کێوان میسالی دێو
دێین و دە چین و بۆ مە نەبێ قەت خوداو خێو»
« رێی وانە کەهکەشان و رێی ئێمە بەردەلاّن

جێی وانە تەخت و بەخت و جێی ئێمە بەرد و چێو»
« ڕەشماڵە ماڵ و کەشک و پەنیرە مەتاعی مە
قەسرو سەرایی خەڵکی‌دیە پڕ لە زێڕ و زیو»
سەیفولقوزات هۆی ژێر دەستی و کلۆڵی کورد دەست نیشان دەکات و لۆمەیان دەکا و دەڵێ:
« چون دوژمان دەگەڵ یەک و ئیمانە یە کیتی
ڕاتان دەدەن بە جارێ لە هەورازی بۆ نشێو»
« ژێر دەستی و ئیتاعەتی بێگانە تا بە کەی
شەرمە لە بۆ مە هێندە بژین بێ نیشان و نیو»
سەیفی قازی لەو سەر دەمە تاریکە دا کوردەکان هاندەدا بۆ تێکۆشان و دەڵێ:
« ئەو ژینە بەو زەلالەتە بۆ چیتە چاوەکەم
بمرین لە ڕێی نەجاتی وەتەن یا بە تیر و میو
« ئازادی سەر بە خۆیی ، میری و گەورەیی
داوا بکەن بە زار و زمان و ددان و لێو »
سەیفی قازی ساڵی ١٩٣٥ لە پارچە شیعرێکی دیکە دا ڕوو دەکاتە کوردەکان و دەڵێ:
« حەیفە میللەتێک شەش هەزار ساڵ بێ
نۆکەری ماڵان ڕوت و ڕەجاڵ بێ»
نۆکەری ماڵان شەرمە لە بۆ مە
کزۆڵان هەلگرین بە کۆمە کۆمە»
چیدی دوژمنان بە خۆ خۆش مەکەن
بوزو و کەپەنک بالاّ پۆش مەکەن»
تا کەی لە دەرکان کز و بلاّو بین؟

بێ مەزن و گەورە و سەر بێ کلاو بێن»
« هەر کەس ئارەزووی مالآنی هەبێ
وەجاخی کوێر بێ، منداڵی نەبێ»
« ئەو بەد بەختیە لە کورد رووی دابوو
لە بەر نە خوێندن گۆزبان ساوا بوو»
« واجبە خوێندن بۆ دنیا و دینی
پێغەمبەر فەرمووی بۆ چوونی چینێ»(٢٥)

ئەگەر بە وردی شیعرەکانی سەیفی قازی بدرێنە بەر لێکۆڵینەوەی زانستی و بابەتیانە شی بکرێنەوە هەر ئەو رێبازە نیشان دەدەن کە ئەحمەدی خانی لە کوردستانی سەرو وحاجی قادر لە کوردستانی خوارو رچەیان شکاندوە و سەیفی قازیش لە کوردستانی رۆژ هەڵات درنگتر نەیهێشتوە ئەم رچەیە کوێر بێتەوە، بە سەریدا رۆیشتوەو بە نەتەوەکەشی نیشان داوە.

رێنخراوێکی دیکە لە مەهاباد باسی لێوە کراوە و هیچ نووسراوەو بەڵگەی لە پاش بە جێ نەماون، (حیزبی ئازادی خوازی کوردستان) بوە. « لە ساڵی ١٩٣٩ -١٩٤٢ جورە پێوەندی‌یەک بە ناوی ( حیزبی ئازادیخوازاتی کوردستان)ەوە پەیدا ببوو کە رابەریان دوکتور عەزیز زەندی بوو. بەلآم هیچ پرۆ گرام وگۆڤارو بلآوکراوەی دەرەوەیان نەبوو. تەنها بەیانێکی ناو داری ئەم حیزبە ئەو بەیانە دووروودرێژە بوو کە بە بۆنەی هاتنی لەشکری سووری سۆڤیاتی یەوە بۆ بە خێر هێنانیان لە ساڵی ١٩٤٢ دا دەر کرا بوو کە تیایا داوای هەقەکانی کورد کرا بوو بە هەقی رزگاری و سەربەخۆیی کوردستانیشەوە .» (٢٦)

دیاردەیەکی دیکەلەم قۆناخەدا بۆیە دەبێ باسی بکەین ئەم کۆمەڵە خەڵکەبوو کە رژێم ناوی نابوون ( قاچاخچی). ئەوانە خەڵکی جۆر بە جۆر بوون لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بۆ بەرێچووون و پەیدا کردنی نانی رۆژانە هاتو چۆی کوردستانی گەرمێنیان دەکرد و کوتاڵ و شتو مەکیان دێنا و بە دزی واتە بە

قاچاخی دەیانفرۆشت. حکومەتی پەهلەوی ناوی قاچاخچی بە سەردا بریبوون و بە هەموو تواناوە بەر بەرەکانی دەکردن. ئەو (قاچاخچیانە) کە قەت دانیان بەم سنوورە دەستکردەی نیشتمانی کوردا نەدەهێنا، بە هاتو چۆی کوردستانی ئەو دیو خەو وئاسایشیان لە سنور دارەکانی ئێران و عیراق و تورکیا حەرام کرد بوو.ئەوان لە هاتوو چۆی خۆیاندا تەنیا کوتاڵ و شتو مەکی فرۆشتنیان نەدەهێنا، بەڵکو بیری کوردایەتی، دەنگو باسی بوونی قوتابخانە و خوێندن بە زمانی کوردی و جار و بار کتێب و چاپەمەنی کوردیشیان دەهێناو زۆر بە نهێنی دەیانگەیاندە دۆست و برادەری بروا پێکراو و خولیای بیری نەتەوەیی. لە دانیشتنی خزمانە و لە مزگەوتاندا چیرۆکی شۆرشی **شێخ مەحمودی** نەمر و راپەرینی بارزانیان بۆ خەڵک دەگێرایەوە. لە نێو قاچاخچیەکانی سابلاخ **میرزا حوسێنی فروهر( حوسێنی** زێرینگەران)و**مام ئەحمەدی تیلاهی** بۆ هێنانی نووسراوەی کوردی و بلاو کردنەوەی بیری کوردایەتی دەوری بالآیان هەبوو. هەر ئەم دەورە بوو کە لە کاتی کۆمەڵەی ژ.گ دا میرزا **حوسێنی زێرینگەران** لە راپەراندنی کار و باری کۆمەڵەدا دەورێکی سەرەکی هەبوو. لە ناوچەی سندوس (قاچاخچی‌یەکانی) گوندی دەریەندی بە پشتیوانی **شێخ جەلالی تاهیری** کە نیشتمانپەروەرێکی ئازاو خەباتگێری دژی زوڵم و زۆری و سەرە رۆیی ژاندارم و مەعمورەکانی حکومەتی بوو، کتێب و نووسراوی کوردی‌یان دەهێنا. بۆ هەوەڵین جار لە ژیانی روشنبیری بنەماڵەی ئێمەدا هێندێ شیعری کوردی زانای مەزن و بە ناو بانگی کورد **مەلا محەمەدی کویی** کە شاد رەوان **حەمەدی خانمێ** لە عیراقەوە بۆی هێنا بووین بیر و ماڵەکەی ئێمەی رووناک کردەوە. **حەمەدی خانمێ** نیشتمانپەروەرێکی ناوچەی سندوسی بوو کە بە پیاوەتی و جوامێری سوتاوی کوردایەتی لە ناوچە ناسراو بوو. ساڵی ۱۹۳۸ لە گەڵ دەستەیەک لە (قاچاخچیەکانی) گوندی دەریەند و ناوچەی شنۆیە گیراو هەموویان بۆ شیراز و دەور وبەری شیراز دوور خستنەوە. ئەم تێکۆشەرە لە هەوەڵی دامەزرانی

کۆمەڵەی ژ.ک تا ئاخرین رۆژی سەر نانەوەی وەک ئەندامێکی چالاک و تێکۆشەر و کۆڵنەدەری حیزبی دێموکرات خەباتی درێژە پێدا. زیندان، چەرمەسەری دەستی دەرەبەگ و وەدەر نان لە گوندی و کوێرەوەری ژیان نەیانتوانی تێکۆشانی ئەم نیشتمانپەروەرە کز و لاواز بکەن. شیعرەکانی مەلای گەورە کاری کردبوە سەر بیر و مێشکی ئێمە. بە رۆژ دەمانبرد لە مەزرا و لە خەتی جوتیدا دەمانشاردەوە. زۆر جاران لە مزگەوت بابم بۆ خەڵکی دەخوێندەوە

« هەتا دەمرم لە بۆ کوردان دەناڵم - عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بە ماڵم» لەو کاتەوە لە مێشکمدا جێگیر بوەو عیلاجی کوردیش هەر نەکراوە.

ئێمە پێشتر شارەزاییکمان لە سەر بلیمەتی و کوردایەتی و نیشتمانپەروەری مەلای گەورە هەبوو. خوا لێخۆشبوو مەلا مەعسومی عوسمانی کوری خەلیفە مەلا حەسەنی قەلاً بۆ خوێندن چوبوە ئەو دیو ولە کۆیە لە خزمەت مەلای گەورە خوێند بووی . مەلا مەعسوم لە دانیشتن و لێک کۆ بوونەوە و باس و خواسدا لە جیاتی « بەحسی دین و روکنی ئیمان» باسی مەزنەتی و زانایی و ئازایی و نیشتمان پەروەری مەلای گەورەی دەکرد. دەیگوت چۆن زۆرە شێخ و کۆڵکە مەلایان دەکوتێ و ریسوایان دەکا و دژی خەرافات و نە خوێندەواری خەبات دەکا. بۆ ئێمە وەک خەون دەهاتە پێش چاو چۆن دەبێ مەلایەک هەبێ ئاوا وەک مەلا مەعسوم دەگێرێتەوە بوێرێ ئەم قسانە بکا و ئەم شیعرانە بلاو کاتەو شەق دە بەیت و باوی خورافات هەڵدا. ئێمە لە ولاتی خۆمان مەلامان هەبوون نەک هەر باسی شتی ئاوایان نەدەکرد، بەڵکوو بۆ رەفتار و کردەوەی دزێوی ئاغاش لە ملیان دەداو تەنانەت دژی مەکتەب و فێر بوونیش دەوەستان. مەلا مەعسوم ئیلهامی لە مەلای گەورە وەر گرتبوو کاتێ کۆماری کوردستان تێکچوو، ناو براو مەلای گوندی خەلیفانی ملکی مارفئاغای شارەلەی برای لەرەتیائاغای مامەش بوو. مەلا مەعسوم لە گەڵ خەڵکی گوندی دەچێتە

جێژنانەی ئاغا. مارفاغا لە نێو خەڵک روو دەکاتە مەلا مەعسوم و دەڵێ: « مەلا! مەلا سەگەکان چ دەکەن؟»

مەلا مەعسوم ناپێچێتەوەو دەڵێ:« مارفاغا بە قورعانی بۆ خۆم لێم خوێندوە پتر لە سەد کتێبی شەرعیم خوێندۆتە و تووشی یەک وشەی ( مەلای سەگ) نەبووم، بەلاّم هەزار وشەی ( ئاغای سەگ)م لە کتێباندا دیوە. ئیتر رادەبێ‌و دەگەرێتەوە. بە ساردی پایزێ مەلا مەعسومیان لە گوندی دەرکرد. ( بروانە بەرگی یەکەمی بیرەوەریەکانم)کەریمی حسامی.

وادیارە لە باسەکەم دوور کەوتوومەوەو لە گەڵ داوای لێبوردن لە خوێنەرانی بە رێز دەبێ بڵێم لە رێگای ئەم بە رواڵەت قاچاخچیانە)وە، پێوەندی مەعنەوی و سیاسی لە نێوان خەڵکی کوردستانی دابەشکراودا بە تین دەبوو. ئەم سنورە دەستکردە نرخێکی نە دەما وهێزەکانی ئەو حکومەتانەش قەت نەیانتوانی هاتو چۆی خەڵک بوەستێنن.

ساڵی ۱۹۳۷ پەیمانی سەعدآباد لە نێوان حکومەتگەلی ئێران و عیراق و تورکیا و ئەفغانستاندا گرێدرا. بناخەی پەیمانی سەعدآباد ساڵی ۱۹۳۵ لە کۆبونەوەی کۆمەڵی گەلان لە ژنێف لە نێوان وەزیرانی دەرەوەی ئێران و عیراق و تورکیا دارێژرا بوو.ئامانج و جەوهەری ئەم پەیمانە کە ئینگلیزەکان وەستای نەخشە و دارشتنی بوون، مەبەستی سەرەکی بریتی بوو لە کۆ کردنەوەی حکومەتەکانی ناوچەی رۆژ هەلاّتی نێوە راست بە تایبەت ئێران و عیراق کە خاوەنی کانگای هەراوی نەوت بوون بۆ گەمارۆ دانی سنورەکانی یەکێتی سۆڤیێتی. بۆ ئەوەی زنجیری گەمارۆ دانی سۆڤێت ئالقەی بەتاڵی تێدا نەمێنێ دوو ساڵی گەرەک بوو تا حکومەتی ئەفغانستانیش بۆ هاتنە نێوی ئەم پەیمانە ئامادە بکەن و لە ۱۹۳۷/۷/۸ دا لە تاران واژۆ بکرێ.(۲۷)

ئەمانجەکانی پەیمانی سەعدآباد لە ۱۰ مادەدا کۆ کراونەوە و ئیمزا کراوە. ئەوەی بۆ ئێمە جێگای سەرنج و لێ ورد بوونەوەیە، مادەی ۷ی ئەم پەیمانەیە کە بە

ئاشکرا ئامانجی سەرکوتکردن و نەهێشتنی بزووتنەوەی سیاسی و چەکداری کوردی پێوە دیارە.

مادەی ٧-١- هەر یەک لە دەوڵەتە هاو پەیمانەکان بەڵێن دەدەن کە لە دەور وبەری سنورەکانی خۆیان لە پێکهاتن و بزووتنەوەی تاقم و دەستەو کۆمەڵی چەکدار پێشگری بکەن و رێگا نەدەن هیچ رێکخراو وتەشکیلاتێک لەم وڵاتانە دا بمەزرێ کە ئامانجی وێرانکردنی بنیاتەکانی مەوجود و یا شێواندنی نەزم و هێمنایەتی وڵاتی هاو پەیمان بێ لە ( سەر سنور یا دوور تر)یا بۆ روخاندنی یەک لە حکومەتەکانی هاوپەیمان تێبکۆشێ»(٢٨)

دوای بەستنی پەیمانی سەعدآباد حکومەتی ئێران گوشاری بۆ سەر گەلی کورد توند و تیژ تر کرد. بە بینوی گرتنی (قاچاخچیان)لە سەراتسەری کوردستان دەستیان کرد بە گرتنی کەسانی ناسراو وجوامێر و خاوەن مڵک و سەرۆک عەشیرەت و رەشبگیریەک تەتانەت چڵکاو خۆرەکانی خۆشیان پاشقول نەدان. هێندێکیان لە بەندیخانەکانی ورمێ و تەورێز راگرتن و بەشی زۆریشیان بۆ ناوچەی شیراز و ئیسفەهان دوور خستنەوەو تا رۆخانی حکومەتی پەهلەوی نەیانتوانی بگەرێنەوە. (٢٩)

لە ناوچەی بانە ساڵی ١٣١٧ حەسەنخانی لەشیر وعیزەتخانی کوری و میرزا شەریف و عەبدوڵا ئازەئین و نەسروڵاخانی ساوان و فەیزوڵاخانی برای و سەلیمخانی کیوەرز و کوری مەحمود خانیان گرت و بردیانە تاران و تا ساڵی ١٣٢٠ نەیانتوانی بگەرێنەوە .»(٣٠)

زانای نیشتناپەروەر ( سەیف القضات) لە پارچە شێعرێکدا باسی قەدەغە کردنی زمانی کوردی و گرتن و دوور خستنەوەی کوردەکان دەکا و دەڵێ:

« بۆ چی زمانی دایکی لە ئێمە مە نع کرا - ئەو هێندە زوڵم و زەحمەت و فەرق و جوداییە

دەگرانە دیل و بوونە ئەسیری لە نێو عەجەم - هەورامی ،

سابلاغی و عیلی جەلالیە

هێندێک بۆ عیراق و بۆ سمنان و دامغان - دەستێکی بۆ شیرازێ کە جێی شێخی سەعدی‌یە

یا دەر تراوی مەرتەنە یا جەپسی بێ گوناه - کوردێکی مەزن و عاقڵ و مەردی حیسابیە

ئاغای سەیف ئەو شیعرانەی دوای رووخانی رژێمی پەهلەوی گوتوە بۆیە دەڵێ:

« هەر ماڵە کوردێکی دەچووی دەت دی شیوەنە - ئەو رۆژگە هەر دنیەکی دەچی سەیر و شادی‌یە

چەن خۆشە کە کوردەکان دەبینم بە جێکی خۆ - شێخێن و پێنج و پەستەک و چۆغە و سێزرانیە

قوربان و بم وەرن بینە دۆستی یەکتری - زۆر عەیبە رێکری و دزی کارێکی چا نیە» ( ٣١ )

« لە حکومەتی رەزا شادا کوردەکانی ئێران تەک هەر لە مافێکی سەرەتاییش بێ بەشکران، بەڵکو بە توند ترین شێوە سەر کوت کران. شۆڤێنیزمی فارس دەسەڵاتی گرتە دەست.ئەدەب و کولتوری کورد کەوتە بەر پلار و ئەوتان.. گۆرینی ناوی شارو گوندەکان، دابەشکردنی تازەی کوردستان، قەدەخە کردنی زمانی زگماک(کوردی)، تەنانەت لەبەر کردنی لیباسی کوردی، ئاواژوو کردنەوەی مێژوو بۆ سەلماندنی ئەم مەبەستە کە کورد و فارس دوو نەتەوەی جیاواز نین دەستپێکرا.نووسەرانی وەک (رەشیدی یاسمی) خەریکی ئامادە کردنی ئەم بابەتە بوون. لە سەر دەرگای ئیدارەکانی دەوڵەتی لە کوردستان نووسرابوو، بە فارسی قسە بکەن.حکومەتی ئیزامی لە سەرانسەری کوردستان دامەزرا. چارە نووسی‌خەڵک کەوتە دەست مەعموری ئیزامی و ژاندارمی رەزا شایی. تەنبیکردنی بە کۆمەڵ، کۆچ پێکردنی ئیجباری، زیندان و کوشتار لە سیاسەتی

ڕەزا شا بوون. سەرە ڕای ئەم بارودۆخە و حکومەتی نیزامی و توند و تیژی لە کوردستان، خەڵک خەباتیان درێژە پێدەدا و جاروبارێزاری خەڵک بە شکڵی ڕاپەڕین و کوشتنی نیزامی و ژاندارم خۆی دەنواند» (٣٢)

بە کورتی سیاسەتی شۆڤێنیستی حکومەتی ڕەزاشا کوردەکەی لە تواندنەوەو فەوتان نیزیک دەکردەوە. بەلاْم بە قەوڵی ئارچیبالد ڕوزولت: «ڕەزا شا هەر چەند بە گۆڕینی لیباس هەستی نەتەوەیی و مەزهەبی سەر کوتکرد، بەلاْم بە تەواوی لە بەین نەچوو. هەر وەک پۆلوی بن خۆڵەمێش داپۆشرا، بەلاْم بە یەکجاری نە کوژایەوە.»(٣٣)

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

١ - حیاتی یەحیا - تاریخ معاصر جلد چهارم - ١٣٦٢، ل ٢٦١

٢ - قاموسی دیپلۆماتی - بەرگی یەکەم، موسکو ١٩٨٤، ل ٤١١ -٤١٢

٣ - دوکتور عبدالرحمانی قاسملو - کوردستان و کورد، ١٩٧٣، ل ٦٤

٤ - کریس کوچیرا- مێژووی کورد لە سەدەی ١٩-٢٠، وەرگێڕانی محمد ڕایانی، ١٣٦٩، ل ١٧٢-١٧٣

٥ - گۆڤاری دنیا- ژمارە ١٢، اسفند ١٣٥٤

٦ - مەسەلەی میللی لە وڵاتانی نیزیک و ناوەڕاست-موسکو، ١٩٧٠، ل ١٠٨

٧ - عبدالله مردوخ-تحریف تاریخ کرد، گۆڤاری الفباء،جلد پنجم، پاریس،١٩٦٣،بەهەمت غلامحسین ساعدی

٨ - هەمان سەر چاوەی پێشوو

٩ - ڕەشیدی یاسمی- کردو پیوستگی نژادی و تاریخی ، وەر گێڕانی کەریم زەند، ١٩٦٩، ل ٧٤

١٠ - محمد قاضی- خاطرات یک مترجم، ١٣٧١، ل ١١٣

١١ -خاطرات دکتر کریم سنجابی ١٣٦٨ ل ٤١٩ - ٤٢٠

١٢ - واسیلی نیکیتین-کردستان و کرد، وەرگێڕانی محمد قاضی، ١٣٦٦، ل ٤٢٣

١٣ - دوکتور جلال مەتینی- ڕۆژنامەی کەیهان، ٢٤ ژانویە، ١٩٨٠

١٤ - دوكتور ئيسماعيل بيشكچي- دوو چاو پێكەوتنی رۆژنامە نووسی، ١٩٩٢، ل ٤.
٤١

١٥ - دوكتور داوەری شێخاوەندی-زایش و خیزش ملت، تاران، ١٣٦٩، ل ٢٧٣

١٦ - خاطرات حسین فردوست- ١٣٧٠، ل ٨٧

١٧ - سیمین دانشور- سوشون، ١٣٦٥، ل ٥.

١٨ - ئیوانوف- مێژووی تازەی ئێران، موسكو، ١٩٧٧، ل ٨٦

١٩ - كوردستان - ژمارە ٥ ، ٢٧ی مای ١٩٤٦- گردەوە كۆیی حەسەنی قازی ١٩٩٤

٢٠ - مرتضی راوندی-تاریخ اجتماعی ایران، ایرانشهر، ژمارە ٢٨، سپتامبر،١٩٨٣.

٢١- كەریمی حسامی-كۆماری دیموكراتی كوردستان یا خود موختاری، ١٩٨٦ ل
٢٧-٢٨

٢٢ - هەمان سەر چاوەی پێشوو ل ٣.

٢٣ - هێمن- تاریک و روون، ١٩٧٤، ل ١٠-١١

٢٤ - نووسراوەی دەستەی لێكۆڵینەوەی رادیۆ تەلەڤیزیۆنی مەهاباد، ١٩٥٥

٢٥ - دیوانی سیف القضات ، گردەوە كۆیی قازی ئەحمەد، ١٣٦١ر ل ٣٥-٣٦-٥٢-٥٣

٢٦ - جەلال تالەبانی- كوردایەتی، ١٩٦٦، ل ٨٨

٢٧ - قاموسی دیپلوماتی- بەرگی سێیەم، موسكو، ١٩٨٦، ل ٦

٢٨ - كۆی پەیماننامەكانی مێژوویی ئێران- بەرگی سێیەم، تاران، ل ٢١٧-٢١٨

٢٩ - كەریمی حسامی- كۆماری دیموكراتی كوردستان یا خود موختاری، ١٨٦٦، ل ٣٥

٣٠ - محمد رئوف توكلی-جوغرافیاو تاریخ بانە-كردستان ١٣٦٣ ، ل ١٨٧

٣١ - بەهمەنی خاكباز- نكاتی تاریخی پیرامون جنبش ملت كرد..... ل ٤.

٣٢ - تارچیبالد روزولت- شرق اموختن ، ١٣٧١، ل ٢٧.

## بەشی پێنجەم:

# شەری دووەمی دنیاگر و رووخانی حکومەتی پەهلەوی

ساڵی ١٩٣٩ بە پەلامار دانی لهستان لە لایەن لەشکری ئەڵمانی نازیەوە شەرێکی خویناوی لە ئوروپا ساز بوو، هەر پێنج قارەی جیهانی گرتەوە. لە سەرو بەندی ئەم شەرەدا حکومەتی ئێران پێوەندیکی بە تینی سیاسی و ئابووری و کولتوری لە گەڵ ئەڵمانی فاشیستی دامەزراند بوو. پسپۆر و کار ناس و ئەندازیاری ئەڵمانی لە تەواوی بنکە و بنیاتە پیشە سازیەکانی ئێراندا کاریان دەکرد و دەستیان هەبوو.

لە سەرەتای شەردا حکومەتی پەهلەوی هیوایەکی زۆری بە سەر کەوتنی ئەڵمان هەبوو. تەبلیغاتێکی هەراو بە قازانجی هیتلەر دەکرا و وایان بڵاو دەکردەوە کە هیتلەر لە رەگەزی ئارییە و تەنانەت ناویشیان بۆ ساز کرد بوو، دەیانگوت ناوی (حەیدەرە).

و لە گەڵ ئەوەی کە نازیەکان لە ئەڵمان دەسەڵاتیان پەیدا کرد، رەزا شا دوکتور مەتینی دەفتەری کرد بە سەرۆک وەزیر و ئەرکی سەرەکی دەوڵەتی مەتین دەفتەری ئەوە بوو کە لە ئەڵمان نیزیک بیتەوە. ژمارە ی ئەندازیار و پسپۆری ئەڵمانی لە ئێران لە ٦٠٠ کەس تێپەربوون. لە گەڵ پێشرەوی لەشکری

ئەڵمان و نیزیک بوونەوەیان لە چیاکانی قەفقاز رەزا شا جار وبار قسەی بە ئینگلیزەکان دەگوت. دیارە ئینگلیزەکان کە پیاوەکانی خۆیان خزاند بوە نیو دەر باری سەلتەنەتی ئیرانەوە لەم هەڵوێستەی رەزا شا بێ خەبەر نەبوون. لە گەڵ شکانی ئەڵمان لە جەبهەی شەر رەزا شا پەشۆکا. مەنسورالملکی نۆکەری ئینگلیزی کرد بە سەرۆک وەزیر. مەنسورالملک بە رەزا شای گوت : هاو پەیمانەکان لە بوونی کارناس و ئەندازیاری ئەڵمانی لە ئیرا ندا نارازین. گورج لە ماوەی٢٤سەعات دا ..٩ کار ناسی ئەڵمانی بە سواری کامیۆن نارده تورکیا، لای وابوو بەم کارە مەسەلە کۆتایی پێدێت و ئینگلیز دەستی لێ نادەن بەڵام بە هەڵە چوو بوو. سەعاتی چواری بەیانی زوو رۆژی سێی خەرمانانی ١٣٢. هێزی هەر سێ دەوڵەتی ئینگلیز و رووس و ئەمریکا هاتنە نیو خاکی ئیران. رەزا شا ناچار بوو تەسلیم بێ. لە ترسێ ئەوەی لە لایەن رووسەوە بە دیل نەگیرێ بە پەلە رایکرد.« (١)

دوکتور کەریمی سەنجابی لە بیرەوەریەکانیدا دەڵێ:« پێشکەوتەکانی ئەڵمان لە ئورووپا و توانا و دەسەڵاتی، رەزا شای غەرە کرد بوو. ئەو چونکە کابرایەکی دیکتاتور بوو، دیکتاتوری خۆش دەویست. جگە لەوە لە ئینگلیزەکانیش دەترسا و بەڵام لە دڵدا هیتلەر و ریژیمەکەی ئەوی خۆش دەویست. لە لایەکی تر لە رووسان دەترسا و لەکومونیزم بیزار بوو.بۆیە تەواو مەیلی بە لای ئەڵماندا کەوتبوو.» (٢)

لە گەڵ ساز بوونی شەر لە ئورووپا حکومەتی ئیران توندو تیژی پتری نیشاندەدا. ژاندارم وەک سەگی هار بە دێهات وەر دەبوون، بەیاننامەیان بلاو دەکردەوەو دەستیشیان لە راو ورووت و تالانی خەڵک نەدەگیراوە. لە بەیاننامەکاندا نووسرابوو: هەر کەس باسی شەر بکات لە ئورووپا بە توندی سزا دەدرێ.

لەو سەرو بەندەدا کە سرت و خورت لە بارەی شەر و چارە نووسی حکومەتی ئیران لە نیو خەڵکدا پەیدا ببوو. رۆژی سێی خەرمانانی ١٣٢. رادیۆ تاران راگەیاندنی ستادی ئەرتەشی ئیرانی بلاو کردەوە . لە بەیاننامەکەدا گوترا بوو

سۆپای رووس و ئینگلیز لە لای خوار و سەروو سنووری ئێرانیان پەڕاندوە و هاتوونە نێو خاکی ئێرانەوە. خەڵک بە بیستنی ئەم خەبەرە کەوتە خۆشی و مزگێنیان بە یەکتر دەدا.

هەر لەم رۆژەدا چەند فڕۆکەی شورەوی سنووری ئێرانیان پەڕاند و لە عاسمانی شین و ساوی کوردستان هەوەڵێن بەیاننامەی ئازادیان بە زمانی کوردی و تورکی ئازربایجانی بە وڵات دا بڵاو کردەوە. بە دوای بڵاو کردنەوەی ئەو بەیاننامەیەدا ئەرتەشی شاهەنشاهی کە ماوەی ۲۰ ساڵ بۆ راو ورووت و لێدان و کوشتاری خەڵک پەروەردە کرا بوو، چەکی فڕێدا و ئاداری بە سەر پاداریەوە نەما. شاعیری ناوداری کورد *مامۆستا هەژار* بەم بۆنەوە لە پارچە شیعرێکدا دەڵێ:

**« چ فڕۆکە موجەسەمەی شادی - کێنی تێدا بوو؟ فرشتەی ئازادی**

**« بە بڵاو بوونی دوو پەڕ ئاگاهی - بوو بڵاو ئەرتەشی شەهەنشاهی»**

ئەفسەرانی پایە بەرزی لەشکری ئێران کە سنگیان بە میداڵ و نیشان دەرازاندەوە، ئەم جارە لە کوردستان لە ترسی قین و تورەیی خەڵک خۆیان بە جلی جوانی ژنان دادەپۆشی و بەرەو تاران و تەورێز رایان دەکرد.

بەر لە وەی لەشکری هاو پەیمانان بێتە ئێران، ئەرتەشی ئێران لە تەورێز لە ناوچەی جوڵفا نێزیک سنووری شورەوی لە مانۆر دابوو، خۆی بۆ یارمەتی ئەڵمان و پەلامار دانی شورەوی ئامادە دەکرد. دەڵێن رۆژێک فەرماندەی لەشکری ئێران دەچێتەوە تەورێز کە راپۆرت بدا بە شابەختی کە فەرماندەی هەموو لەشکری سەرووی رۆژئاوا بوو.

شا بەختی دەپرسێ:

- ورمێ لەشکر چۆنە؟

- قوربان زۆر خەراپە. لەشکری شورەوی لە نێمەوە دیارە. قەتار وترومبیل لە

هاتوو چۆ دان و ئازوخەو چەک و کەڵ و پەلی پێویستیان بۆ دێ. لەشکری ئێمەش رۆژی وایە لەم چیار کەژە ئاوی خواردنەوەشی ناگاتێ.

شا بەختی تورە دەبێ و دەڵێ:

- بێدەنگ بە. ئەم قسانە چی‌یە؟ ما شاە داریم، شاهنامە داریم، آنها چی دارند؟( واتە ئێمە شامان هەیە و شانامەمان هەیە، ئەوان چی‌یان هەیە؟)

ئەو لەشکرەی خاوەن شا و شانامە بە دیتنی دوو فرۆکەی شورەوی لە ناوچەی سەرووی ئێران و لە کوردستان بڵاوەی کرد و هیچی بە سەر هیچەوە نەما. لە کوردستان گەلی کورد کە ساڵەهای ساڵ ئازار و ستەمی دەستی ئەم ئەرتەشەی دەچێشت، پیاوانە لە ئەرتەشی شەهەنشاهی کەوتە خۆ، دەستیان بە سەر چەک و چۆلی لەشکر داگرت و کوردستانیان لە لەشکر و ژاندارمی تریاکی پاک کردەوە.
بۆ شارەزایی زیاتر لە سیاسەتی ئیمپریالیستەکان سەبارەت بە حکومەتەدەستنیژەکانیان با سەیرێکی وتەکانی‌دوکتور کەریمی سەنجابی بکەین:« لە حەوتووی یەکەمی مانگی شەهریوەری ساڵی. ۱۳۲۰(۱۹٤۱)

رادیۆم کردەوە لە پڕ خەبەرێک وەک برووسک تەواوی لەشمی لەرزاند. بیستم کە هێزی رووس لە شیماڵ و هێزی ئینگلیز لە رۆژ ئاواو جنوبەوە ئێرانیان پەلامار داوە. رادیۆی ئێران ئەم خەبەرەی بڵاو کردەوە، لێی زیاد کرد و گوتی: هێزەکانی دەوڵەتی لە بەرانبەر ئەواندا بەر بەرەکانی دەکەن و تەسلیمی بێگانە نابن. پاشان رادیۆ بی.بی.سی.م کردەوە. دیتم بە دەنگێکی زۆرتوند و چاوە روان نەکراو شەخسی رەزاشای پەلامارەدا. تاوانەکانی ئەو دەگێرێتەوە و دەڵێ: ئازادی ئێرانی لە بەین بردوە، مەشروتەی پێشێل کردوە، مڵکی زۆری داگیر کردون، چەندەی دزی کردوە، فەسادی ئەخلاقی پەرە پێداوە، خەڵکی بێ تاوانی کوشتوە. بە کورتی تەواوی ئەو کارانەی لە سەردەمی رەزا شادا لە گەڵ بێدەنگی ئینگلیز و بەشێکی بە موافەقەت و ئاماژەی ئەوان کرا بوو، بە هێرشێکی توند بە رەزاشایانەوە دەلکێنێ..»(۳)

ئۆردووی سووری سۆڤیەتی هەر وەک بە تێک شکاندنی لەشکری ئەڵمانی تازی وڵاتانی داگیر کراوی ئوروپای رۆژ هەڵاتی لە چنگ فاشیزم نەجات دا، کوردستان و کوردیشی لە دەست زوڵم و زۆر داری حکومەتی پەهلەوی رزگار کرد. بۆ دەڵێم ئۆردووی سوور کوردستانی نەجات دا؟ خۆ مەعلومە کە لەشکری ئینگلیز و ئەمریکاش هاتنە نێو ئێران. بە گوێرەی رێک کەوتنی هاو پەیمانەکان مەڵبەندی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز و رووس لە ئێران پێشتر دیاری کرا بوو. ناوچەی خوارووو واتە لە سەقز بەو لاوە بۆ لای کرماشان ناوچەی نفوز و ژێر کونترۆلی ئینگلیز بوو. ناوچەی سەروش لە ورمێوە بۆ لای ماکۆ وسنووری سۆڤیێت کەوتبوە ژێر نفوز و دەسەڵاتی لەشکری روس مەڵبەندی ناوەندی کوردستان خاڵی مابۆوە. لە مەڵبەندی لەشکری ئینگلیز دەسەڵاتی شوومی حکومەتی تاران سەرە رای راکردنی رەزاشا و تێکچوونی دام و دەزگای دیکتاتوری لە پەنا لەشکری ئینگلیزدا هەر مابوو. لەشکری ئێران دیسان نەک هەر دەسەڵاتی خۆی پاراست بوو، بەڵکوو لەکوردستانی ژێر کونترۆلی ئینگلیز سەر کوتکردنی راپەرین و تێکۆشانی کوردی درێژە پێدەدا. پێشی بزووتنەوەی سیاسی و رزگاریخوازی کوردیش گیرا بوو. بەڵام هەر وەک گوترا لە مەڵبەندی نفوزی لەشکری رووسدا، کورد زنجیری کۆیلەتی پساند بوو، بەرەو دیاریکردنی چارەنووس و وەدەست هێنانی ئازادی قۆڵی لێ هەڵماڵیبوو. « رەزا شای پەهلەوی دەیویست کورد بتوێنێتەوە و شوێنەواری فەرهەنگ و فۆلکلۆر و زانست و جل و بەرگ و دابو رەسمی کوردی بفەوتێنێ. بە کورتی هەوری رەشی ملهوری و دیکتاتوری سەرانسەری عاسمانی ئێران و بە تایبەت کوردستانی داگرتبوو. تابلۆی گەورە بە خەتێکی جوان کە شیعری( چە فرمان یزدان چە فرمان شاه)ی لێ نووسرا بوو، لە گەڵ دەستووری :(فارسی حرف بزنید) لە شوێنە گشتیەکان هەڵوەسرا بوو.»(٤)

بە هاتنی ئۆردووی سوور بۆ بەشی سەرووی کوردستان شا و فەرمانەکەی و نەرتەشەکەی نەمان. کۆمەڵانی زەحمەتکێشی کورد ساڵانی رووسیان ناو نا

کورد که زمان و قەڵەمیان ئازاد ببوو، بەشیعرو پەخشانی جوانی کوردی ببشوازیان لە هاتنی ئۆردووی سوور دەکرد. ماموستا هەژاری رەحمەتی لە شیعرێکی خۆیدا دەڵێ :

«بیست ساڵان لە ژێر چەنگاڵی عەجەم - ناڵاندم بە سەد دەرد و هەم و خەم

کێوی بەختمان وەهای گرتبوو تەم - رووس نەجاتی دام بوو بە فرشتەم»

ناوچەی مەهاباد لەو وەزعە دوور بوو. واتە نە وڵاتە رۆژ ئاوابیەکان لەشکریان تێدا جێگیر کرد بوو و نە لەشکری سوور. بەم شێوەیە وەزعێکی تایبەتی لە ناوچەی مەهاباد خولقا بوو»(٥)

## دوو دیاردەی لێک جیاوازلە کوردستان

هاتنی ئۆردووی هاو پەیمانان و رووخانی حکومەتی رەشی رەزاشا لەو کاتەدا کە بوو بە هۆی ئازادی کورد و نە مانی بالا دەستی زۆر دار و خوێن مژ، هەر لەو کاتەشدا دوو دیاردەی لێک جیا واز لە کۆمەڵی کوردەواریدا سەریان هەڵدا.

یەکەمیان خەسڵەت و ئاکار و کردەوەی دزێو و نارەسەنی دەرەبەگی و عاشیرەتی. ئەم دەرەبەگ و خاوەن مڵکانەی کە لە سەر دەمی دیکتاتوری پەهلەوید لە ئاست ژاندارم و مەعموری عەجەم ملیان حیز دەکرد و بە دیتنیژاندارمێکی تریاکی وەک کیسەڵ دەچوونەوە نێو قاپێلکی خۆیان، ئێستا چەکیان کەوتبوە دەست و لە راو رووت و تالان و شەڕە خۆری کەوتبوونە خۆ.(٦)

سەردار عەشیرەت و دەرەبەگی کورد لە جیاتی دەرفەت هێنان لە هەلی هەڵکەوتوو وە تێکۆشان بۆ یەکێتی و رزگاری و سەر بە خۆیی کەوتنە ئاژاوە

ئانەوەو یەکتر کوشتن و تالانی بیندەسەلاتان. لە ناوچەی ورمێ زیرۆ بەگی هەرکی و هەمزەی سوارە و قوڵە ئاغای دیکەی شکاک و هەرکی لە کار و کردەوەی دزێو ئەوەندەیان شور لێ هەڵکیشا کە رووسەکان مەجبور بوون بە دمیان دادەنەوە. لە ناوچەی بانەو هەورامان حەمە رەشید خان لە عیراق گەرایەوە و دەستیکرد بە ئاژاوە و شەرو شوری رێگرانە، سەقزی تالانکرد، بانەی ئاگر تێ بەردا و لە بەرانبەر لەشکری ئیرانیشدا خۆی نەگرت و گەرایەوە بۆ دیوی کوردستانی خواروو. حەمە رەشید خان جارێکی دیکە هاتەوە کوردستانی ئێران و بوو بە ژەنرالی کۆماری کوردستان و فەرماندەی جەبهەی سەراو سەقز. « ئەرتەشی ئێران لەبەر یەک بڵاو بوو. عەشیرەت دەستیان گەیشتە چەک و جبە خانە. سەرۆک تایفە لە حەپس و دوور خستنەوە گەرانەوە. هێندێ لە وان بە گوێرەی داب ورەسمی خۆیان دەستیان کرد بە تالان و رووتاندنەوەی خەڵک. هێندێکیش بۆ پەرە پێدانی دەسەلاتی خۆیان کەوتنە کار. »(٧)

شاری مەهاباد کە لە بواری بازرگانی و روشنبیری یەوە ناوەندی ئەم بەشە ئازاد کراوەی کوردستان بوو لە لایەن عەشیرەتەکاری دەور و بەرەوە کە چەکدار ببوون، لە مەترسی دابوو. ترسی ئەوە هەبوو کە یەکێ لەو عەشیرەتانە و یا قوڵە ئاغایەکی چەکدار دەست درێژی بۆ سەر مەهاباد بکا. لە نێو شاری مەهاباد دوو هەڵویستی جیاواز دەهاتنە بەر چاو. هەڵوێستی بۆرژوازی دەست رۆیشتووی شار کە بۆ پاراستنی سامان وماڵ وملکیان پالیان وە سەرۆک عەشیرەت و ئاغا بە زیپکەکان دابوو. نەک هەر ئەوە بەڵکوو راستەو خۆ خزمایەتیان لە گەڵ ساز کردن. کچیان دەدان بە کورە ئاغاکانی دەسەلات دار و سەرۆک عەشیرەت دەیان هێنان ماڵ و ملکی خۆیان پێ دەپاراستن.

لە لایەکێ تر بازاریاتی پچوک و روناکبیرانی وریا و هیوا بە خۆ دەستەی چەکداریان بۆ کێشک و بەر گری و پاراستنی نەزمی شار بە ناوی ( قوڵ سپی) پێکدەهێنا.( دوای دامەزرانی کۆمەڵە بوونە قوڵ سوور) قازی محەممەد لە پێکهێنان و چالاکی ئەوانەدا دەوری سەرەکی هەبوو. میرزا حوسێنی فرزەهەر،

میرزا غەنی خسرەوی، حەمەدی مەولودە چرچی، سەید پیرە لە نەزم و پاریزگاری شاردا دەوریان هەبوو.

دیاردەی دوەم بریتی بوو لە وریا بوونەوەی رووناکبیرانی کورد. نووسین و بلاو بوونەوەی شیعری میللی و ئازادیخوازی و رەخنەو سەر کۆنەی کردەوەی دزیوی دەرەبەگ و خۆ فرۆشان. گەشاندنەوەی بیری نەتەوەیی وهاندانی خەلک بۆ خەبات و یەکێتی. « هەستی ناسیونالیستی بۆ کوردەکان لە هەموو مەسەلەیەک گرنگتر بوو. لە سەرەتای شەری یەکەمی دنیا گرەوە ئەوان نەیانتوانیبوو ئاوات و ئارەزووی جیاوازیخوازانەی خۆیان لە هیچ نووسراوەیەکدا بشارنەوە و دایپۆشن. »(٨)

شاعیر و رووناکبیرانی نیشتمانپەروەری کورد بە چالاکي هەل و مەرجي رۆژیان قۆستەوەو دەوری پیرۆزی خۆیان کایە دەکرد.روانگەیەکی تر کە بۆ باسکردن دەبی، تیکچوونی سنووری دەستکردی کولونیالیستی نیوان دوو بەشی کوردستان و هاتوو چۆی ئازادی خەلکی کورد بوو لە نیوان گەرمین و کویستاندا. ئەم دیاردە پیرۆزە لە بواری روون بوونەوەی فیکر و بزواندنی هەستی نەتەوایەتی و تەنانەت گەشەی ئابووریش کاری کردە سەر پێشکەوتنی کۆمەلی کوردەواری. تاجر و بازرگانی کوردستانی ئیران بۆ هێنانی کوتال و شتو مەک دەچوونە هەولیر و سولەیمانی و کەرکوک و برایانی کوردستانی گەرمین بە سەر بەستی لە شارەکانی سابلاغ و بانەو بۆکان و شنۆ و ورمیٰ و نەغەدە دەسورانەوە و مەرو مالاتی خۆیان دەفرۆشت و شتو مەکی پیداویستین دەکری و دەگەرانەوە. نەمانی سنووری دەستکرد و هاتوو چۆی خەلک دەبوو بە هۆی بە پتەو بوونی پیوەندی مەعنەوی و کولتوری و ئابووری نیوان کوردی ئەم دیو ئەو دیوی کوردستان وەک یەک ولات و یەک نەتەوە خۆی نیشان دەدا.کتیب و گۆڤار و نووسراوەی کوردی لەو دیوەوە دەهاتن و هەر لە حەوا دەقۆزرانەوە. بە کوردی کورد لەم بەشەی نیشتمانی دابەشکراویدا هەستی بە ئازادی و سەر بەستی دەکرد.

## سەفەری هێندێ خاوەن ملْک و سەرۆک عەشیرەتی کورد بۆ باکۆ

لەم کاتەدا کە کوردستان لە بارو دۆخێکی بێ نەزمی و هەرکەس هەرکەسیدا دەژیا، رووسەکان هێندێ سەرۆک عەشیرەت وخاوەن ملْکی ناسراو وسەربە دەرەوەی کوردستانیان بۆ باکۆ داوەت کرد. ساڵی ١٩٧٤ لە بەغدا لە گەڵ دیپلۆماتێکی رووس لە سەر مەسەلەی کورد و یارمەتی نەدانی شورەوی بە کورد باسێکم هەبوو. لە هەڵوێستی دژ بە دەرە بەگایەتی خۆمەوە رەخنەم لە سیاسەتی ئەو دەمی شورەوی دەگرت کە ساڵی ١٩٤١ دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتیان بۆ باکۆ داوەت کردوە. کابرای رووس لە وەلآمی رەخنەی مندا گوتی:« باشە. ئەو دەم کێی تریان داوەت کرد بایە. کام وەرزێر و کرێکار و رووناکبیری خاوەن نفوزو دەسەلآت لە کوردستان هەبوون تاشورەوی بانگیان بکا. کام حیزب و رێکخراوەی کوردی هەبوون کە شورەوی پێوەندی‌یان پێوە بگرێ؟ ئەو دەم پیاو ماقوڵ و خاوەن دەسەلآتی کورد ئەوانە بوون و هەر دەبوایە ئەوانیش بانگ کرا بان.» ئەو دەم و ئێستاش بۆ چوونی کابرام پێ راست بوو. کەسانی ناسراو کار لە دەست هاتووی کورد ئەو دەم چاک یا خەراپ هەر ئەوانە بوون هەر دەوڵەتێکی دیکەش ویستبای لە گەڵ نوێنەرانی کورد پێوەندی بگرێ، هەر لە گەڵ ئەو کەسانە وتو وێژی دەکرد. قەوارەی کۆمەڵی کوردەواری ئەو دەم لە سەر ئەم کۆڵەکانە دامەزرا بوو. بە قەولی رێز دار **ماموستا مەسعود محەمەد**: ئەگەر بە ئانقەست خۆمان بە سەهو نەبەین زۆر چاک دەزانین بوونی خاوەن زەوی و سەرەک عەشیرەت و کوێخا و خوردە مالیک لە رۆژگاری کۆندا بوونێکی ناچاری و بە ملەوە بوو کە ئەگەر یەکێک لە وان تێ چوو بایە حەتمیەت یەکێکی تری لە جێگەی ئەو دادەنا.(٩)

لە سەر بتەمای واقعیەتی ئەوسای کۆمەڵی کوردەواری، دوای چەند جار سەفەرو سورانەوەی ئەفسەرانی شورەوی بە کوردستاندا، لە مانگی دیسامبری

١٩٤١ دەستەیەکی ٣٠ کەسیان لە سەرۆک عەشیرەت وخاوەن ملک وکەسانی ناسراو وپیاو ماقوڵی کورددا وەت کرد بچنە باکۆ پێتەختی ئازەربایجانی شورەوی.لەبارەی چاو پێکەوتن و وتووێژیان لە گەڵ رێبەرانی ئازربایجانی شورەوی بەڵگەیەکی رەسمی بلاو نەکراوەتەوە. هێندێ لە نووسەران زۆر یا کەم بە سەلیقەی خۆیان شتێکیان لەم بارەوە نووسیوە و ناوی هێندی لە داوەت کراوەکانیان هێناوە و زیادو کەمیشیان کردوون. ئەوەی شایانی سەرنجە ئەوەیە نە سەفەری باکۆ ونە ستەم و زۆرداری حکومەتی پەهلەوی و نە ژێر دەستی و بێ بەشی کورد و نەدەرفەت و هەلی هەڵکەوتوو بۆ کورد، هیچیان کاریان نەکردە سەربیر وهەست و هەڵوێستی سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگی کوردو وازیان لە خزمەتکاری و چڵکاو خۆری حکومەتی عەجەم نەهێنا و ئەم ئەرکە تا پیرۆزەیان چ لە سەر دەمی کۆماری کوردستان و چ لە پاشان تا رووخانی رێژیمی پاشایەتی لە ئێران درێژە پێدا.(١٠)

# دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.ک
# کۆمەڵەی ژیاندنەوەی کورد

**خوێنەری عادەتی تواناى زیهنی و فکری ئەو تۆزی نیە نووسراوە یا گۆتە بە تەرازووی زانست و مەنتیق هەڵسەنگێنێ. بۆیە مومکینە هەڵەی نووسراو لە مێشکیدا جێگر بێ و لێی بێ بە باوەڕ. جا ئەگەر کەسێک لە نووسیندا هەڵە دەدۆزێتەوە، بۆی بلوێ بە نووسین ڕاستی کاتەوە، بەوەدا خزمەتێکی گەورە دەکا بۆ ئێستا و دوا ڕۆژی میللەتەکەی و بەڵکو هەموو ئادەمیزاد. بە سڕینەوەی هەر هەڵەیەک لە مێشکی خەلق پەڵە هەورێکی ڕەشی جەهالەت دەرەوێتەوە و چرایێکی حەقناسی هەڵدەکرێ.»**

**مەسعود محەمەد (١١)**

ناوی **کۆمەڵەی ژ.ک** بە بڕوای من پڕ بە پێستی بارو دوخی ئەو دەمی کوردستان و لە گەڵ ویست و ئامانجی نەتەوەی کورد یەکی دەگرتەوە. ڕاستە هاتنی ئۆردووی هاو پەیمانەکان و ڕووخانی ڕێژیی دیکتاتوری پەهلەوی کوردی لە ژێر دەستی و زۆرداری حکومەتی عەجەم ڕزگار کرد بوو، بەلاّم ژیاندنەوەی بیر و هۆشی نەتەوایەتی و تواناى مەعنەوی و گێڕانەوەی هێزی هیوا بە خۆ بوونی کورد بوو بە ئەرکی تێکۆشانی **کۆمەڵەی ژ.ک.**

وەک دەزانین **کۆمەڵەی** ژ.ک لە ٢٥گەلاوێژی ١٣٢١- ١٦ی ئوتی ساڵی ١٩٤٢ لە شاری مەهاباد دامەزرا. دامەزرێنەرانی کۆمەڵە وەک زانراوە بریتی بوون لە: **میرزا حوسێنی فروهر(وستای زێڕینگەران) عبدولرەحمانی زەبیحی، سەدیقی حەیدەری، عبدولرەحمانی ئیمامی، قاسمی قادری، عەلی مەحمودی، قادری مودەرسی، محەمەدی نانوا زادە،**

مەلا عبدولای داودی، ئەحمەدینی تەوحیدی، محەمەدی ئەسحابی، محەمەدی یاهو، عبدولرەحمانی کەیانی.

لە سەر چۆنیەتی دامەزران و تێکۆشانی کۆمەڵەی ژ.ک زۆر کەس لە نووسەرانی کورد نووسیویانە و بیر بر وای جۆر بە جۆر هاتوونە سەر کاغەز. لە بەر ئەوەی کۆمەڵەی ژ.ک‌هەوەڵین ڕێکخراوی سیاسی کورد بوە لەم بەشەی کوردستانی مەزن و لە بارو دوخێکی تایبەتی نەتەوەیی و نێو نەتەوەییدا پێکهاتوە و هاتۆتە مەیدانی خەبات و تێکۆشانەوە، بە رای من هەڵدەگرێ لەمەش زیاتر باسی بکرێ و لێی بکۆڵرێتەوەو بە دۆزینەوەو شیکردنەوەی بەڵگەو فاکتی بابەتی و راستە قینە دەوری کۆمەڵەی ژ.ک لە گەشە کردنی هەستی نەتەوایەتی کورد لە کوردستانی رۆژ هەلاتدا پتر روون بکرێتەوە.

نووسەر کە لە سەرەتای دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.ک یەکی لە ئەندامانی چالاکی ئەم ڕێکخراوەیە بوە، بیرو رای خۆی بە کورتی سەبارەت بە سیاسەتی کۆمەڵە و هێندێ چالاکی ئەو لە کتێبی (کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری) و لە بەرگی یەکی بیرەوەریەکانیدا دەر بریوە. لێرەدا هەر چەندە بە مۆنتاژیش دابنرێ، دەمەوێ بیرو راو بۆ چوونی هێندێ نووسەرانی کورد و بێگانە سەبارەت بە سیاسەت و چۆنیەتی کۆمەڵەی ژ.ک بخەمە بەر چاوی خوێنەرانی بە رێز و بە گوێرەی تواناش ئەگەر تووشی هەڵەو ناتەواویەک بم پێیاندا بچمەوە.

١ - دوکتور عەبدولرەحمانی قاسملو وەک لە کتێبی( چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی‌دا) دەڵێ:لە سەرەتای دامەزرانی حیزبی دیموکراتەوە، واتە لە تەمەنی ١١ساڵیەوە خۆی شاهیدی رووداوەکان بوە»(١٢)

دەنووسێ:« یەکەم ڕێکخراوی سیاسی کوردی بە ناوی «کومەلەی ژ.ک» یان کومەلەی ژیانەوەی کورد» لە ناوچەی مەهاباد پێک هات. دامەزرێنەرانی کۆمەڵە ١١کەس بوون کە رۆژی ١٦ی سپتامبری ١٩٤٢ لە مەهابادکۆ بوونەوە. کومەڵەی ژ.ک‌یان پێک هێنا کە ئامانجی رزگاری نەتەوەی

کورد بوو... تێکۆشانی **کۆمەڵەی ژ.ک** تەرکیبی ئەو کاتەی‌و هەر وەها بەر نامەکەی( دیارە بەر نامەیەکی رێک و پێکی نە بوو بەلاّم هێندێ مەبەستی بۆ خۆی دانا بوو)و شێوەی رێکخستنی هەموونیشانەی ئەوەیە کە کۆمەڵە لە لایەکەوە رێکخراوێکی ناسیونالیست بوو، واتە بۆکوردایەتی رووت هەوڵی دەدا و لە لایەکی دیکەوەش رێکخراوێکی سیکتێر و داخراو بوو. هەر بۆیە نەیدەتوانی کۆمەلاّنی بەرینی خەڵک بۆ لای خۆی رابکێشێ بەڵکو وەک رێکخراوێکی نهێنی لە چوار چێوەیەکی تەنگی چەند کەسی یان چەند سەد کەسی‌دا دەمایەوە. پاشان **دوکتور قاسملو** دەنووسێ: کە سەیری نووسراوەکانی گۆواری نیشتمان دەکەین، هێندێ شت نیشانەی ئەوەیە کە کەسانێک لە سەرە تاوە **کۆمەڵەی ژ.ک** یان پێک هێناو بە رێوەیان برد، بە باشی لە وەزعی نێو نەتەوەیی و سیاسەتی نێو دەوڵەتان و تەنانەت لە خەباتی گەلان بۆ رزگاری ئاگادار نەبون. **دوکتور قاسملو** رەخنە لە بە رێوە بەرانی **کۆمەڵەی ژ.ک** دەگرێ کە لە گوڤاری نیشتماندا دەوڵەتی بەریتانیا نەک هەر بە دۆستی کورد دادەنێن بەڵکو بە ئاڵاْ هەڵگری ئازادی هەموو گەلان و هەر وەها گەلی کوردی دەناسێنن. پاشان دەنووسێ: سەرە رای هەمووی ئەوانە **کۆمەڵەی ژ.ک** توانی هەستی نەتەوەیی لە نێو خەڵکی کوردستانی ئێراندا بلاْو بکاتەوە. توانی لە ناوچەی مەهاباد و لە هێندێ ناوچەی دیکە ریشە داکوتێ ولە راستیدا وەک یەکەم حیزبی سیاسی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بێ بە سەرە تاو بناخەیەک بۆ دامەزرانی حیزبی دێموکراتی کوردستان..»(١٣)

٢ - **ئارچیباڵد روزولت** دەنووسێ:« کوردەکانی ئێرانیش بریاریاندا حیزبی ناسیونالیستی خۆیان دامەزرێنن. ئاخرەکەی کۆمەڵەی ژیانی کوردستانیان پێک هێنا. وردە وردە ژمارەی ئەندامان و نفوزی لە نێو کوردەکاندا زیادی کرد.لە مانگی مای ساڵی ١٩٤٣ دەستەیەکی ناسیونالیستی کورد توانی پاسگەی پۆلیسی مەهاباد واتە ئاخرین پێگەی دەسەلاّتی دەوڵەتی ناوەندی ئێران لە وێ تێک برووخێنێ.»(١٤)

## کارە ساتی شارەوانی مەهاباد

ساڵی ١٩٤٣ تاقە شەقڵ و نیشانی حکومەتی تاران لە شاری مەهاباد تەنیا شارەوانی مابوو کە ١٠-١٢ ئاژانی عەجەمی تێدا مابوون و دەسەلاتی هیچیان نەبوو مەگەر راپورت و خەبەریان بۆ حکومەت ناردبایە. دەسەلات و کاروباری شار بە کردەوە لە دەستی **کۆمەڵەی ژ.ک** دابوو. کۆمەڵە بۆ راپەراندنی هێندێ کار وباری پێویست لە شار و لە دێهات چەکداری هەبوون. **میرزا وسێنی زێرینگەران** بەر پرسی ئەم بەشە بوو، بۆ کار وباری دێهات کاک **سەعیدی قزڵجی** ٨-٩ سواری چەکداری بە خەرجی خۆ راگرتبوو،لە ژێر دەسەلاتی کۆمەڵە دابوو. ئەم سوارانە لیباسی تایبەتی فۆرمی ئەفسەرانی رووسیان دەبەر دەکرد. لەو سەرو بەندە دابوو ژەنراڵ **هوشمەندی ئەفشار**، فەرماندەی لەشکری ئێران لە رۆژئاوا بۆ سەر دانی ناوچە دێتە مەهاباد. بەلاَم لە لایەن کۆمەلانی خەڵکەوە بە خۆپێشاندان و **هەرا** و بەردە باران پێشوازی لێدەکرێ. ژەنراڵی ناو براو ناتوانێ لە مەهاباد گیر بێ و بە تاڵوکە خۆی دەربازدەکا.

لە مانگی بانەمەری ئەو ساڵە دا رۆژێکی هەتاوی کوردستان کۆبوونەوەیەکی گەورە لە مەیدانی چوار چرای مەهاباد بۆ وتاری **عەزیز خانی گرمانج** یەکێ لە ئاغایانی بەگزادە سەبارەت بە مێژ وو زمان و ئەدەبی کوردی پێک دێ. **عەزیز خان** بە وتاری خۆی هەستی خەڵک دە هاروژێنێ و دوای تەواو بوونی وتارەکەی روو دەکاتە خەڵک و دەڵێ تا کەی شوێنەواری حکومەتی عەجەم لە مەهاباد بمێنێ، یالاَ شارەوانی پاک کەنەوە. خەڵک شارەوانی پەلامار دەدا پاسەوانی عەجەم لە سەرەتاوە تەقە دەکەن و یەکێک بە ناوی **عەولاَی مینە خاڵندی** دەکوژرێنت. ئیتر خەڵک شارەوانی دەگرن چەند پاسەوان دەکوژرێن و هێندێ خۆ دەشارنەوە و ئیتر شوێنەواری حکومەتی تاران لە مەهاباد کوێر دەبێتەوە.

**حەسەن ئەرفەع** سەرۆکی پێشووی ستادی ئەرتەشی ئێران لەم بارەوە دەنووسی:« لە مانگی مای ١٩٤٣ هێندێ لە خەڵکی مەهاباد بۆ چەک کردنی

کەلانتەری شارەوانیان پەلامار دا. پاش ماوەیەک تەقە کەلانتەریان ویران کرد و هێندێ پۆلیسیان کوشتن. بەم چەشنە ئاخرین نیشانەی دەسەلاتی ئێران لە مەهاباد کوێر کرایەوە.» **ویلیام ئیگلتۆنیش** لە کتێبی (کۆماری ١٩٤٦ ی کوردستان) لەم بارەوە دەنووسێ و گرتنی شارەوانی مەهاباد بە مانگی مای سالی ١٩٤٣ دادەنێ. »(بڕوانە کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری نووسینی دانەر)

بەلام **دوکتور قاسملوو** دەنووسێ « لە کوردستان لە ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٤ دوا نیشانەی دەسەلاتی حکومەتی مەرکەزی کە بریتی بوو لە شارەبانی مەهاباد لە نێو چوو وە چەکدارەکانی شارەبانی چەک کران و دەسەلات بە تەواوی کەوتە دەستی خەلک کە هەر چی دەچوو زیاتر خۆی چەکدار دەکرد.»(١٥)

٣ - **ویلیام ئیگلتون** لە بارەی **کۆمەلەی ژ.ک** وە دەنووسێ:« لە سالی ١٩٤٤ تێکۆشانی کۆمەلە لە هەر تک لای سەرووی کوردستان. چ لە لای مەهاباد و چ لە ناوچەکانی سەرووی میاندواو کە لە ژێر چاوە دێری رووسەکان بوو. لە خوارووی سەقز لە بەر بوونی ئەرتەشی ئێران تێکۆشانی تەنگە بەر بوو. لە ناوچەی سنەو کرماشان هەر چەند زۆربەی کوردەکان شیعەو یا ئەهلی حەقن ڕێو ڕەسمی نیوە کوردی و نیوە فارسی هەبوو. هێزی ناسیونالیستی کوردستان توانیبووی ئەوانیش بۆ لای خۆ رابکێشێ. لە سەرووی سەقز نفوزی کۆمەلە لە نێو تایفە و عەشیرەتەکاندا بە توندی پەرەی دەگرت و بڕیار و قسەکانی کۆمەلە بە تەواوی بە ڕێوە دەچوون. لە بۆ کان هێندێ لە ئەفرادی بنە مالەی ئیلخانیزادە بە گەرمی لە تێکۆشاندا بوون. لە شنۆیە **موساخانی زەرزا** سەرۆکی عێلی زەرزا ئەندامێکی چالاک بوو. دوور تر بۆ لای سەروو سەرۆکەکانی هەرکی هاتبوونە نێو کۆمەلە. **شێخ عەبدولا ئەفەندی** دەیویست ڕێبەرایەتی کۆمەلە بگرێتە دەست. **عەولای قادری** مامەش یەک لە ئەندامانی تێکۆشەری کۆمەلە بوو. لە نێو شکاکان **عومەر خانی شەریفی** ببوە ئەندامی کۆمەلە. تا سالی ١٩٤٥

زۆربەی سەرۆکی تایفەو عەشیرەت و زۆربەی نیزیک بە تەواوی خەڵکی کورد بیوونە ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە. ئەوەی پێویستە بگوترێ ئەمەیە کە لە نێو هەموو تاقم و توێژی خەڵک سەرۆکانی عەشایر بە رێک و پێکی ئەرکی خۆیان بە جێ دەگەیاند.» (١٦)

٤ - « ساڵی ١٩٤٤ کۆمەڵەی ژ.ک بوو بە رێکخراوێکی جەماوەری. لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی ئێران شانەکانی لە چالاکی دا بوون. لە مەهاباد گۆڤاری (نیشتمان)یان دەر دەکرد. تێکۆشان و چالاکی ژ.ک لە ناوچەکانی ناوەند و خوارووی کوردستانی ئێران کۆنە پەرستی ئێران و جاسوسەکانی ئینگلیزی خستە بەر بەرەکانی و سەر کوتکردنی بزوتنەوەی نیشتمانی کورد. لە ئەنجامدا توانیان دوو بەرەکی بخەنە نێوان رێبەرانی ئەم رێکخراوەیە و لە نێوەی دووەمی ١٩٤٥دا لە بەر یەک بڵاو بوو.»(١٧)

٥ - « بەرنامەی کۆمەڵەی ژ.ک هەر چەندە ناروشنی و کەم و کوری تێدا بوو، بەڵام لە چاو پرۆگرامی حیزبە سیاسیە کوردەکانی پێش خۆی، بیر و باوەری خەباتی نەتەوەی کوردی بۆ سەر بە خۆیی دەبردە ناخی خەڵکەوە لەم وڵاتانەی کە کوردی تێدا دەژین. کۆمەڵە یەکێتی هەموو هێزە پێشکەوتو خوازەکانی ئەم وڵاتانەی بۆ خەباتی دژی هێزە کۆنەپەرستەکان و دژی حکومەتە کۆنە پەرستەکانی ئێران و عیراق و تورکیای بە پێویست دەزانی. بەر نامەی کۆمەڵەی ژ.ک مەسەلەی یەکگرتنەوەی کوردستانی خستبوە هەنگاوی دووەم. لە سەر ئەو باوەرە بوو کە بۆ گەیشتن بە یەکێتی کوردەکان لە یەک وڵاتدا، پێویستە بۆ وەدەستهێنانی خود موختاری ناوچەکانی کوردستان لە ئێران و عیراق و تورکیا و بۆ دیموکراتیزە کردنی ژیانی کوردەکان هەنگاو باوێژرێت.» (١٨)

٦ - « لە ئاخری ساڵی ١٩٤٢ بە دەست پێشخەری کاسبکارێکی مەهابادی بە ناوی زەبیحی کۆبوونەوەی رێکخستنی حیزبێکی نوێ لە مەهاباد بە ناوی ژیانەوەی کوردستان لە ١١کەس پێکهات. بەیاننامەی سوێنەتی سەر بە خۆیی نەتەوەی

کورد بریتی بوو لە پێویستی خەبات دژی کۆنە پەرستی نێو خۆی کوردستان و خەبات دژی حکومەتە کۆنە پەرستەکانی ئێران و عیراق و تورکیا و کۆنە پەرستی نێو نەتەوەیی و لە رازەی پێشەوەشدا دژی فاشیزم. ژ.ک وە دەستهێنانی خود موختاری لە ناوچە کورد نشینەکانی ئێرانی کرد بوە هەوەڵین ئاماجی خۆ و لە دوایەشدا یەک گرتنەوەی هەموو بەشەکانی کوردستان لە دەوڵەتێکی سەر بە خۆدا. فەرقی ئەم پرۆ گرامە لە گەڵ پرۆگرامی هەموو حیزبە سیاسیەکانی پێش خۆی لە وەدا بوو کە ئەم پرۆ گرامە بیرو باوەری خەباتی سەر بە خۆیی نەتەوەیی لە ناخی کوردا دەهاژاند و خەباتی هەموو هێزە پێشکەوتو خوازەکانی دژی حکومەتە کۆنە پەرستەکانی ئێران و عیراق و تورکیای بە پێویست دەزانی. مەسەلەی یەکگرتنەوەی کوردستان لە پرۆگرامی ژ.ک دا خرا بوە پلانی دوایی.

گەیشتن بە یەکگرتنەوەی هەموو کوردی لە یەک دەوڵەت دا. بەستبۆوە بە وەدەستهێنانی خود موختاری ناوچە کوردیەکانی عیراق و ئێران و تورکیا و دیموکراتیزە کردنی ژیانی کۆمەڵگای کورد لەم وڵاتانەدا.

ژ.ک بەشێکی زۆری هەموو نوێنەرانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی نەک هەر لە ئێران بەڵکو لە عیراقیشدا لە دەوری خۆی کۆ کرد بۆوە. کومیتەی ناوەندی لە پێشدا لە مەهاباد بوو، پاشان بۆ سولەیمانی لە عیراق گوێزرایەوە و لقی لە مەهاباد مایەوە. ژ.ک لە لایەن زەبیحیەوە سەر پەرشتی دەکرا. لە ئەپریلی ١٩٤٣ لە گردی خوا پەرست کومیتەی ناوەندی لقی مەهاباد پێک هات کە رەحمانی زەبیحی و محەمەدی پاهو هاتنە نێو. لە ترسی راونان و سەر کوتکردنی لە لایەن دەرەبەگ و کۆنە پەرستی ناوچە ژ.ک تێکۆشانی خۆی زۆر بە نهێنی رادەگرت. چالاکی تێکۆشانی ژ.ک لە نیوەی ساڵی ١٩٤٣ لە کوردستانی عیراق لە گەڵ بەر پا بوونی راپەرینی توندی کوردەکانی بارزانی کۆتایی پێهات. ساڵی ١٩٤٤ ژ.ک بوو بە رێکخراوێکی جەماوەری کوردی، شانەکانی لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی ئێران لە ماکۆوە بگرە تا کرماشان لە

چالاکی و تێکۆشاندا بوون. لە مەهاباد گۆڤاری (نیشتمانی) دەر کرد...(١٩) *

٧ - « لە ساڵەکانی شەری دووەمی دنیاگر بە تایبەت دوای تێوە گلانی شورەوی و بە تایبەت دوای شکانی کاتی کۆنە پەرستی ئێران کەش و هەوایەکی لە باری تازە بۆ گەشانەوەی هێزەکانی بزووتنەوەی میللی- دێموکراتی کورد هاتە کایەوە و لە دەوری حیزبی ژیانەوەی کورد کۆ بوونەوە. لە دژی دنەدانی کۆنە پەرستی ئێران و ئیمپریالیستەکانی ئینگلیز و ئەمریکا پێوەندی قایمیان لە گەڵ هێزە پێشکەوتو خوازەکانی ئازربایجان و سەرانسەری ئێران دامەزراند. هەر وەها پێوەندی برایانەشیان لە گەڵ کوردەکانی عیراق دامەزراند کە ئەو دەم دژی ئیمپریالیزمی بەریتانیا خەباتیان دەستپێکرد بوو.»(٢٠)

*لە گەڵ سوپاس بۆ زەحمەت و نووسینی مادام ژیگالینا،ناکرێ هێندێ بۆچوونی هەڵەی نووسراوەکەی بە سەریاندا بازد بدرێت. دەست پێرا نەگەیشتنی سەر چاوەی غەیری سەر چاوەکانی شورەوی ئەو کات و نەزانینی زمانەکانی کوردی و فارسی و کەلک وەر گرتن لە ئاگاداری هێندێ خوێند کاری نائاگای کورد، پێیەندی بە لەبەر چاو گرتنی سیاسەتی رەسمی حکومەتی لە کاری زانستیشدا، نەک هەر ژیگالینا بەڵکوو گەلێک لە رۆژ هەڵاتناسەکانی سۆڤیتی پێشووی وا لێکردوە کە نووسین و شیکردنەوەکانیان تەواو نەبن. هێندێ جار رەش و سپی تێکەڵ دەکرێن و هەڵەی زەق لە نووسینەکانیاندا بەر چاو دەکەوێت. سەیر کەین هەر لەم چەند دێرە کورتە دا« بە دەست پێشخەری زەبیحی کۆمەڵەی ژ.ک دادەمەزرێ» « کومیتەی ناوەندی لە مەهابادەوە دەگوێزێتەوە بۆ سولەیمانی و لقی لە مەهاباد دەمێنێتەوە.» « ژ.ک لە لایەن زەبیحی‌یەوە سەر پەرشتی دەکرێ» ئەم هەڵەیە لە لایەن هێندێ نووسەری کوردستانی خوارووش دوو پات دەکرێتەوە و زەبیحی بە سکرتێری کۆمەڵەی ژ.ک ناو دەبەن. لە کاتێکا ژ.ک نە کونگرەی بەستوە و نە سکرتێر و سەرۆکی هەبوە. دەکرێ بگوترێ زەبیحی، حوسێنی فرۆهەر ئەندامی چالاکی کۆمەڵە بوون. دیسان ژیگالینا« کومیتەی ناوەندی لقی مەهاباد پێک دێت و زەبیحی و محەممەدی یاهو دەچنە ناو » و زۆر شتی تر کە لە گەڵ واقعیەتی رووداوەکە نایەنەوە.

ئیستا با بزانین پروفیسور لازاریڤ ساڵی ١٩٨٧ لە سەر دامەزرانی **کۆمەڵەی ژ.ک** چی دەنووسێ:

٨ - « لە سەر دەمی شەری دووهەمی دنیا گر، هەر پاش تەواو بوونی کە بە دیموکراتیزە کردنی نیسبی کۆمەڵگای وڵاتەکان دادەنرێ، لە کوردستانی ئێران بزووتنەوەی کوردەکان بۆ خود موختاری پەرەی گرت. بەشی زۆر لە وان لە توێژی بورژوازی و وردە بورژوازی پێک هاتبوون کە لایان وابوو رێکخراوی کوردەکان لە سەر بناخە و شکلی عەشیرەتی ناتوانێ بە راستی رێبەرایەتی بزوتنەوەی کورد بکات و بەرژەوەندی ئەوان دابین بکات. جگە لەوە دەستەی کرێکارانی مەهاباد دەهات نەخشێکی بەر چاو لە بزوتنەوەی کورد دا یاری بکات. لە ئاخری ساڵی ١٩٤٢ لە کوردستانی ئێران بە دەست پێشخەری رێبەری شانەی حیزبی تودەی ئێران، کاسبکاری مەهابادی زەبیحی کۆ بوونەوەی دامەزرێنەرانی حیزبێکی تازە پێک هات کە بە (ژیانەوەی کوردستان) ناو لێنرا.»(٢١)*

٩ - « ساڵی ١٩٤٤ کۆمەڵە بوو بە رێکخراوێکی بەر بڵاوی سیاسی کوردستان و لە تەواوی شار و ناوچەکانی کوردستان خاوەنی ئەندام و تەشکیلات بوو. ئەو رێکخراوەیە لە مانگی ئوتی ساڵی ١٩٤٤ لە گەڵ رێکخراوە سیاسیەکانی کوردستانی تورکیا و عیراق لە چیاکانی دالانپەر کونفرانسێکی پێک هێنا کە لە وێدا سیاسەتی گشتی ئەوان بۆ وەدەست هێنانی خود موختاری لە نێو وڵاتەکانی خۆیاندا گەلاڵە کراو رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانیشیان لە هەنگاوی خۆیان ئاگادار کرد.»(٢٢)**

* وەک پێشتر باسکرا، دەبینین کە رۆژ هەڵاتناسەکانی شورەوی زۆر جار لە نووسیندا تووشی هەڵە دەبن. لێرەدا پروفیسور **لازاریڤ** کە لە شیکردنەوەی مەسەلەی کورد شارەزایە و زۆری نووسیوە دیسان ناماقبی نە پێکاوە. لە مەهابادی ساڵی ١٩٤٢ کرێکاری لە کوێ بوە تا دەستەی هەبێ و (نەخشی بەر چاو لە بزوتنەوەی کورد یاری بکات)؟ یان حیزبی تودە ١٩٤٢ کەی رێکخراوی لە مەهاباد هەبوە تا زەبیحی (رێبەری شانەی حیزبی تودە ) بوو بێت؟

** لە گەڵ سوپاس بۆ زەحمەت و تێکۆشانی کاک **عومەری فاروقی** پێویستە روونی

# با کۆمەڵەی ژ.ک پتر شیکەینەوە.

**«ڕوونکردنەوەی گەلێک باسی نەزانراو و بێ سەرو شوێن بووبە فەرمانی دوارۆژ. چاپا من دەرفەتم پەیدا بێ‌و بیکەم یا دڵسۆزێکی دیکەی لە من بەختیارتر بە بەرخۆی هەڵبڕێ‌و قەرزی منی پێ بداتەوە» - مەسعود محەممەد**

لە لاپەڕەکانی پێشوودا بیرو ڕای جۆر بە جۆری هێندێ لە نووسەرانی خۆماڵی و بێگانەمان سەبارەت بە سیاسەت و چالاکی **کۆمەڵەی ژ.ک** باسکرد. بەڵام ئەوەی کە لەو بۆ چوون و نووسینانەدا بە ڕوونی و بە تەواوی ساخ نە کراوەتەوە و پێویستی بە وەدەست هێنانی بەڵگەو پەیجووری زیاتر و وردتر هەیە بریتیە لە ناوی تەواوی **کۆمەڵەی ژ.ک** و ڕۆژی دامەزرانی.

لە بارەی ناوی کۆمەڵەوە لە هیچ سەنەد و بەڵگەی ڕەسمی کۆمەڵە دا ئەم دوو پیتەی(ژ.ک) ڕوون نەکراوەتەوە و نە نووسراوە کە مەبەست لەم دوو پیتە چیە؟ نووسەرانی کورد و بێگانە هەر کەس بە سەلیقەی خۆی جۆرێک بە کاری هێناوە.

لە کتێبی ئیگلتون دا( کۆماری ١٩٤٦ - کوردستان) وەرگێرانی **سەید محەممەدی سەمەدی** لاپەری ١٧« کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان» بە کار هاتوە.ماموستا **عەلائەددین سجادی** لە « شۆڕشەکانی کورد ١٩٥٩» لاپەری ٢٧٥ لە باسی **کۆمەڵەی ژ.ک** دا دەنووسێ:«ئامانجی کۆمەڵەی ژ.ک ئەوە بوو کە « ژیانی کوردستانی گەورە بێ.»

---



کەینەوە کە ساڵی ١٩٤٤ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان هێشتا دانەمەزرا بوو. کۆ بوونەوەی دالانپەر لە سەر نەخشەی ئالاو هاوکاری و بەر نامەی خەبات ڕێک کەوتوون و باسی خود موختاری ئەو دەم لە گۆڕێدا نەبوە. چونکە ئەو دەم بزووتنەوەی بەشەکانی کوردستان پتر ڕزگاری و یەکگرتنەوەی کوردستانی گەورەیان لە بەر چاو بوە.

دوکتور قاسملو له ( کوردستان و کورد و له ٤٠ سالْ خەبات دا» کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردی » نووسیوە.

دوکتور جەمالْ نەبەز له پێشەکی گۆڤارەکانی « نیشتمان » دا ۱۹۸٥ لاپەرەی ۳۱ « کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردی » به کار هێناوە.

ماموستا جەلال تالەبانی له «کوردایەتی »دا، ۱۹٦٦ لاپەرەی ۸۸ « کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستانی» نووسیوە.

له کتێبی کریس کوچیرادا « مێژووی کورد له سەدەی ۲۰-۱۹» دا، وەرگێرانی محەمەدی رایانی ۱۳٦۹ لاپەری ۳٦۱« کۆمەڵەی ژیانی کوردستان» به کار هاتوە.

رۆژنامەی رێگا که دوای تێکچوونی کۆماری کوردستان تاقه یەک ژمارەی له مانگی خەزەڵ وەری ۱۳۲۷ دا لێ بلاْو بۆتەوە دەنووسێ: « رێگا اورگانی کۆمەڵەی ژیانی کورد »

وەک دەبینین له سەر ناوی تەواوی کۆمەڵەی ژ.ک له نیوان نووسەراندا یەکیتی بیر و را نیه. به رای من « کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد » راست بێ.چوونکه له سەر دەمی حکومەتی پەهلەوی دا کورد بەرەو تەمان دەچوو له تاویلکەی ژیان دا بوو. بۆیه « کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد » رەنگە له گەڵ بار ودۆخی ئەو دەمی کورد و کوردستان پتر رێک بکەوێ.

له بارەی رۆژی دامەزرانی کۆمەڵەشەوە ئەم ناروونیه هەیە و ساخ نەکراوەتەوە. رۆژی دامەزرانی کۆمەڵە له هەموو نووسراوەی نووسەرەکانی کورد و بێگانه دا، ۲٥ی شەهریوەری سالی ۱۳۲۱ی ئێرانی رێکەوتی ۱٦ی سیپتامبری ۱۹٤۲ی زایینی دیاری کراوە. که دەبێتە ۲٥ی خەرمانانی کوردی.

که چی له ژمارە ۲ی سالی یەکەمی گۆڤاری (نیشتمان) دا، خەزەڵ وەری ۱۳۲۲ له ژێر سەر خەتی « جیژنی سەر سالی کۆمەڵه » دا دەنووسێ:« رۆژی ۲٥ی گەلاوێژ جیژنی سالانەی کۆمەڵە به شکوە و خۆشیەکی زۆرەوە گیرا. »

که وابوو رۆژی دامەزرانی **کۆمەڵەی ژ.ک** دەبێتە ٢٥ی گەلاوێژی کوردی و ١٦ی ئوتی رۆژ ئاوایی. ماموستا **جەمال نەبەز** لە پێشەکی گۆڤاری (نیشتمان)دا لاپەری ٣٢ دەنووسێ: « مانگی گەلاوێژی کوردی دەکەوێتە نێوان ٢١ی ئاب و ٢٠ی ئەیلولەوە، واتە ٢٥ی گەلاوێژ بە تەواوی بەر ١٦ی ئەیلولی رۆژ ئاوایی و ٢٥ی شەهریوەری ئێرانی دەکەوێ. »

لە کاتێکا بە گوێرەی دەقی رۆژ ژمێری ساڵی ١٣٢٣ی کۆمەڵە کە لە لاپەرەی ٧١ی کتێبی حکومەتی کوردستان ١٩٩٣ نووسینی **نوشیروان مستەفا** دا بڵاو کراوەتەوە، مانگەکان ئاوا دەکەون:

« مانگی ٥ - مردادی ئێرانی - گەلاوێژی کوردی - تەموز و ئاب دەگرێتەوە.
« مانگی ٦ - شەهریوەری ئێرانی - خەرمانانی کوردی - ئاب و ئەیلول دەگرێتەوە.
بەم حیسابە ٢٥ی گەلاوێژی کوردی دە بێتە ٢٥ی مردادی ئێرانی و ١٦ی ئوتی رۆژ ئاوایی
٢٥ی خەرمانانی کوردی دەبێتە ٢٥ی شەهریوەری ئێرانی و ١٦ی سیپتامبری رۆژ ئاوایی.

رۆژ نامەی کوردستانیش ئورگانی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لە ژمارە سێی خاکە لێوەی . ١٣٥٠- ئەوریلی ١٩٧١ دا ریزی مانگەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی چاپکردوە :

« مانگی ٥ - گەلاوێژ دەبێتە مرداد و ئاب و ئاوگوستی رۆژ ئاوایی
« مانگی ٦ - خەرمانان دەبێتە شەهریوەر و ئەیلول و سیپتامبری رۆژ ئاوایی

بەم روونکردنەوەیە ٢٥ی گەلاوێژ و ١٦ی ئاوگوست یا ئاب دەبێ رۆژی دامەزرانی **کۆمەڵەی ژ.ک** بێ. چونکە حیزبی دیموکراتی کوردستانیش وەک درێژە پێدەری **کۆمەڵەی ژ.ک** رۆژی ٢٥ی گەلاوێژ - ١٦ی ئوت ساڵانەی دامەزراتی خۆی یاد دەکاتەوە.

وەک دەزانین **کۆمەڵەی ژ.ک** لە کەش و هەوایەکی تایبەتی ئێران و جیهاندا دامەزرا. لە ئێران بە هاتنی ئۆردووی هاو پەیمانان حکومەتی دیکتاتوری

ڕەزا شا ڕووخا بوو.گەلانی ئێران پشوێنکیان هاتبۆوە بەر و ڕێکخراوەی سیاسی پێشکەوتوو خواز دامەزرا بوون و شنە بای ئازادی سەرانسەری وڵاتی کرتبۆوە. مەڵبەندی ناوەند و سەرووی کوردستانی ئێران کە کەوتبوە ژێر کونترۆلی ئۆردووی سوور، دەسەلاتی حکومەتی تارانی بە سەردا نەما بوو. بارو دۆخی عەشایری و خانخانی بە سەر کوردستاندا زاڵبوو.

لە مەیدانی نێو نەتەوەییدا شەر هەموو ناوچە و مەڵبەندی جیهانی گرتبۆوە و تا دەهات لە ئێران و لە کوردستان وەنێزیک دەکەوت. ١٤ی ئاوگوستی ١٩٤١ ( مەنشوری ئاتلانتیک) بلاو کرا بۆو و لە بەندی ٣ دا گوترا بوو: دوو وڵاتی ئەمریکاو ئینگلیز مافی هەموو نەتەوەیەک لە هەڵبژاردنی چەشنی حکومەتێک کە خۆیان بە باشی بزانن رێزی لێ دەگرن و هیوا دارن ئەو میللەتانەی کە تا ئێستا بە زۆر لە مافی حاکمیەت و سەر بە خۆیی بێ بەشکراون بە مافی خۆیان بگەن.»

لە هەل و مەرجێکی ئاوادا بێجگە لە ڕێکخراوەیەکی نیشتمانی و و لات پارێز هیچ حیزب و ڕێکخراوەیەکیتر نەیدەتوانی کۆمەلانی خەلک بۆ وەدەستهێنانی مافی داگیرکراوی نەتەوایەتی هان بدا. هەر بۆیەش لە کوردستان هێندێ لە روناکبیرانی نیشتمانپەروەری کورد بۆ دامەرزاندنی **کۆمەڵەی ژ.ک** دەست بە کار بوون و ئامانج و مەرامی خۆیان بەم چەشنەی خوارەوە راگەیاند: « **کۆمەڵەی ژ.ک** بە پێچەوانەی هەموو بەرهەڵست و تۆزرت و چەڵەمەیەکی وەکوو دوژمنانی خۆ بە خۆ، دووبەرەکی و خۆ خۆری، پوڵپەرستی و بێگانە دۆستی کە لە ڕێگای پێشکەوتن و سەرکەوتنی کورد دا هەیە بە هەموو هێز و توانای خۆی تێ ئەکۆشێت تا زنجیری کەڵەوەی دیلی و ژێردەستی لە ئەستۆی نەتەوەی کورد داماڵێ و لەم کوردستانە لەت و کوتەی ئێستا کوردستانێکی گەورە و رێک و پێک بێنێتە بەر هەم کە هەموو کوردێک بە سەر بەستی تیا بژیت.»(٢٣)

**کۆمەڵەی ژ.ک** بۆ گەیشتن بەو ئامانجە لە کۆمەڵگای دوا کەوتووی ئەو

سای‌کورده واریدا له بواری کولتوری و سیاسی و کۆمه‌لایه‌تی ده‌ستیکرد به تێکۆشانێکی هه‌راو وبه‌ر بلاو. هه‌ر وه‌ک له به‌رابیدا باسکرا بوو ڕێکخراوه‌یه‌کی جه‌ماوه‌ری و په‌لی هاویشت بۆ ناوچه‌ی کرماشان و به‌شه‌کانی دیکه‌ی کوردستانی گه‌وره‌ش. کردنه‌وه‌ی لقی کۆمه‌ڵه‌ی ژ.ک له سوله‌یمانی و له ناوچه‌ی کرماشان نیشانیده‌دا که کۆمه‌ڵه نه‌وه‌نده‌ش ( ڕێکخراوێکی سیکتێر و داخراو نه‌بوو ..یا له چوار چێوه‌ی ته‌سکی چه‌ند که‌سی و یا چه‌ند سه‌د که‌سیدا نه‌مابۆوه) وه‌ک دوکتور قاسملو له( چل ساڵ خه‌بات) دا باسی ده‌کا. گرنگی په‌یدا بوون و تێکۆشانی کۆمه‌ڵه‌ی ژ.ک له وه‌دا بوو که کوردستانی بیر ده‌کرده‌وه و تێکۆشانی خۆی له چوار چێوه‌ی کوردستانی ئێراندا قه‌تیس نه‌کردبوو.

«بۆ وتو وێژ له باره‌ی ئاوات و ئاره‌زووی هاو به‌ش، هه‌ر وه‌ها بۆ لێکۆڵینه‌وه‌ی بارو دوخ و ئه‌حواڵی دوا رۆژی کورد، له گه‌ڵ ئه‌ندامانی حیزبی هیوا) له مانگی مارسی ١٩٤٤ کۆمه‌ڵه‌ی ژ.ک حه‌مه‌ده‌مینی شه‌ره‌فی نارده که‌رکوک. نوێنه‌رانی ئه‌وی(واته حیزبی هیوا. ح) بریتی بوون له: ئه‌مین ره‌واندزی، عیزه‌ت عه‌بدولعه‌زیز، مسته‌فا خۆشناو، شیخ قادری سوله‌یمانی، سه‌ید عه‌بدواعه‌زیزی گه‌یلانی و ره‌فیق حیلمی. دوای چه‌ند مانگ له هه‌وه‌ڵی هاوینی ١٩٤٤ لقی سوله‌یمانی حیزبی هیوا ئیسماعیل حه‌قی شاوه‌یس و عوسمان دانشی بۆ وه‌ڵام دانه‌وه‌ی به‌رانبه‌ر و جه‌خت کردن له سه‌ر په‌یمانی نێو به‌ردا بۆ جاری دووه‌م نارده مه‌هاباد. دوای ساڵێ تیوێک هه‌مزه عه‌بدوللا و وردی له عیراق، قه‌دری به‌گی نه‌وه‌ی جه‌میل پاشای دیار به‌کر له سوریا و قازی مه‌لا وه‌هاب له تورکیا بۆ چاو پێکه‌وتنی ڕێبه‌رانی کورد و باس و گۆرینه‌وه‌ی بیرو را له باره‌ی سنوره‌کانی ناوچه‌ی خود موختار هاتنه مه‌هاباد. له مانگی ئوتی ١٩٤٤ وتو وێژی نهائیی له باره‌ی مه‌سه‌له‌ی یه‌کێتی کوردستانی گه‌وره له چیای (دالانپه‌ر) که له وێ سنووره‌کانی ئێران و عیراق و تورکیا یه‌ک ده‌گرنه‌وه ئه‌نجام درا.نوێنه‌رانی کوردی هه‌ر سێک وڵات بۆ ئیمزای

پەیمانی دۆستایەتی و پشتیوانی لە یەکتر لە وێ ئامادە بوون. پەیمانی ناو براو بە پەیمانی سێ سنوور) ناسراوە. نوێنەری کوردەکانی ئێران کە لە لایەن کۆمەڵەی ژێکافەوە ناردرا بوو، **قاسمی قادری** بوو. لە عیراق **شێخ عوبیدوڵڵای** زێبێوێ هاتبوو. نوێنەری کوردەکانی تورکیا **قازی مەلا وەهاب** بوو. لەم کاتە رەسمیە دا ناسینی کوردستانێکی جوغرافیاییش پێویست بوو.لە هەموو جێ بڵاویان کرد بۆوە کە نەخشەی کوردستان لە بەریتانیاوە ناردراوە. بەڵام لە راستیدا لە لایەن ( کۆمەڵەی کوردەکانی بێروتەوە) ناردرا بوو کە ئەو دەم هەڵسوڕێنەرانی ئەسڵی ئەو کۆمەڵەیە بنە ماڵەی بەدر خان) بوون.»(٢٤)

ئەم باسە **زینتار سلوپی** لە کتێبی خۆیدا بە ناوی ( دۆزا کوردستان ) کە بە زمانی تورکی بڵاو کراوەتەوە هێناویەتی.: مانگی ئوتی ١٩٤٤ لە چیای (دالانپەر) نوێنەری بزووتنەوەی کورد لە هەر سێ بەشی کوردستان کۆ دەبنەوە. لەم کۆ بوونەوەیەدا **قازی مەلا وەهاب** لە لایەن کوردەکانی تورکیا، **شێخ عوبیدوڵڵای** زێبێوێ لە لایەن کوردەکانی عیراقەوە و **قاسمی قادری** لە لایەن کۆمەڵەی ژێکافەوە بەشداری دەکەن. لەم کۆ بوونەوەیەدا پەیمانێک دەبەستن کە بە ناوی پەیمانی (سێ سنوور) ناسراوە. بە گوێرەی ئەو پەیمانە کوردەکان بە گیان و ماڵ یارمەتی یەکتر دەکەن»(٢٥)

**حەسەن ئەرفەعیش** کە سەرۆکی پێشووی ستادی ئەرتەشی ئێران بوو لە کتێبی خۆیدا بە ناوی (کوردەکان و لێکۆڵینەوەی مێژوویی و سیاسی) باسی ئەم کۆ بوونەوەیە دەکاو دەنووسێ:« بە چاو پێکەوتنی سەمبولیکی کوردەکانی ئێران و عیراق و تورکیا و سوریا لە شوێنێک کە سنوری سێ وڵات دەگەنەوە یەک پێک هێنانی کوردستانی گەورە نەخشەی کێشرا. ئەم چاو پێکەوتنە بە ناوی پەیمانی ( سێ سنوور) ناسراوە»

**کۆمەڵەی ژ.ک کە** ( داماڵینی زنجیری دیلی و ژێر دەستی لە ئەستۆی نەتەوەی کورد و پێکهێنانی کوردستانێکی گەورە و رێکو پێکی لەم کوردستانە

لەت و کوتەی ئێستای) بە ستراتیژی و ئامانجی نیهائیی خۆی دانا بوو، جگە لە پێکهێنانی کۆ بوونەوەی سێ سنوور ، لە گەڵ شۆڕشی بارزانیش بە سەرۆکایەتی **مەلا مستەفای** ئەمر پێوەندی دەگرێ و ئەم نامەیەی خوارەوە بۆ سەرۆک بارزانی دەنێرێ و لە گەڵ پیرۆز بایی و راگەیاندنی پشتیوانی ئەم پرسیارانەی خوارەوەش ئاراستەی **مەلا مستەفا** دەکا.

« **بۆ جەنابی زەعیمی ئازادی مەلا مستەفا بارزانی**

بە ناوی هەیئەتی کۆمەڵەی ژ.ک ... لە پاش زانینی دەنگو باسی شۆڕشی موقەدەسی ئێوە ئەم موخابەرە ... هیوامان وایە بە تەفصیل وەلامان بدەنەوە:

١ - لە پێش هەموو شتێک تەبریکی زەعیم و لەشکری ئازادی کوردستان دەکەین کە زاڵ بوە بە سەر دوژمندا.

٢ - بۆ ئەوەی کە ئێمە ئەو عاطیفە جوانەی کە بەرامبەر ئێوەمان هەیە و شوعوری برایەتی. کوردایەتی، یەکەتی یارمەتیەکی عەمەلی و فیعلی بێ وابە ئەم مەعلوماتەی خوارەوە بزانی، چونکە خۆمان تەقدیری مەوقیفی ئەمە دەکەین بەرامبەر بە مەسئولییەت سیاسەتی دول.

٣ - بواعثی ثورەی ئیوە چیە ئایا ئیدیعای ئازادی کوردستانی عیراق دەکەن وە یا خود هەمو کوردستانی گیتی وە ضیمنەن کوردستانی تورکیا.

٤ - مەوقیفی ئیوە بەرامبەر سیاسەتی ئەجنەبی لە عیراق دا چیەو ئەگەر هاتو لە طەرەف ئەم سیاسەتە تەهدید وە یا خود ئیقناع کران ثەورە رادەوەستێن وە یا خود دەوام دەکەن.

٥ - رەئی ئیمە ئەوەیە کە ثەورەی موقەدەسی ئیوە ناوێکی عومومی وەر بگری یەعنی ئیدیعای ئازاد کردنی هەمو کوردستان بکەن وە بۆ ئەمە دەبێ هەمو کوردی گیتی بە مەشوەرەت تەعاونتان لە گەڵ بکا و لە ژێر قیادەی ئیوە لەشکرێکی کوردی لە هەمو کوردی گیتی تنظیم بکری بۆ ئەوەش دەبێ ئامادە کەن لە عقدی مونتەمەرێک لە حالی حاضر لە ئیوەو هەیئەتی ئیستیشارەی ئیوە

و هەیئەتی ئیستیشارەی ئێمە تنظیم بکری و جیگا و زەمان تەعیین بکری بو ئەم موئتەمەرە چ لە ئەرزی عیراق و چ لە ئەرزی کوردستانی ئیران لەم موئتەمەرە هەمو مطالبی کورد بە شکلی پەیمانیکی میللی تەعیین دەکری وە لە طرف هەمومان ئیمزا دەکری وە لەم موئتەمەرەدا میزانی عەسکەری تەعیین دەکری و واجباتی هەمو لایەک لە ئەورەی میللی تەعیین دەکری.

٦ - پیویستە مەوقیفی حەربی خوتان لە گەڵ مەوقیفی حەربی دوژمن بومان موفەصەلەن وە بە دیققەت تەعیین بفەرمون لە گەڵ مەوقیفی عەشایری کوردی عیراق بەرامبەر ئیوە.

٧ - بۆ ئازاد بونی کوردستان دەبی سیاسەتی یەک لە دولی موعەظەمە لە گەڵمان بی بە رەئی ئیمە ئەم دەولەتە دەولەتی شورەویە. رای ئیوە بەم خصوصە چیە. چونکو نابی علی الحیاد بین لە گەڵ هەمو دەولەتان.

٨ - لە هەموی موهیمتر پیویستە بە صورەتیکی موستەعجەل ئیجتیهادی خوتان بەیان بکەن بە خصوصی رای ئینگلیس بەرامبەر ئەورەی ئیوە و گفتوگویان لە گەڵ ئیوە چیە چونکی ئیمە ئەزانین بە تەحقیق نابی ئینگلیس لەم ئەورەیە بی دەخل بی.

٩ - ئیوە زەعیمیکی ئازادی پەرستن هیچ نەبی موکافەحەی زولم ئەکەن بو عەشرەتی خوتان وە کوردی ئیران بە روحی برایەتی کوردایەتی زور ئیشتیاقی هەیە بو موفەق بونی ئیوە بە هەر چی نەوعیک بیی. وە ئامادەیە بو یارمەتی ئیوە بە گویرەی موسامەحەی زروفی سیاسی مەملەکەتمان وە کە ئەم سوئالانە ئەکەین مەقصودمان ئەوەیە کە تەئمینی یارمەتیەکی زور گەورە بو ئیوە بکەین و حەرەکەتی موبارەکی ئیوە بکەینە حەرەکەتی میللی عمومی تا کو لە تاریخ دا ئەم فەخرە بو ئیوە تەسجیل بکری. لە لایەن هەیئەتی شورای شاری آ-خ »

ئەم نامەیەم سالی ١٩٦٦ لە گۆڤاری (دراساتی کردیە) بلاوکراوەی ئەنستیتوی کورد لە پاریس ژمارە ٢- ١٩٨٥ وەرگرتبوو لە کتیبی (کۆماری دیموکراتی

کوردستان یا خود موختاری) دا بلاو کرد بۆوه. ئەو دەم چەند دێڕی سەرە تاییم بۆ نه خوێنرا بۆوه. به ڕێنوس و ڕێزمانێکی فره سەره تایی نووسرا بوو که هیچ وه ڕێزمانی کوردی موکریان و ڕێنووسی ئەو دەمی (نیشتمانیش) نەدەچوو. باش بوو دەقی نامەکه له کتێبی ـ حکومەتی کوردستان) نووسینی **نوشیروان مستەفا ئەمین** دا به ساخکردنەوەی ڕێنووسەکەوه بلاو کرا بۆوه. ئەم جاره به کەلک وەر گرتن له نووسینەکەی کاک **نوشیروان** کەمو کوریەکانم پر کردونەوه. مەسەلەیەکی ئەمجاره سەرنجی ڕاکێشاوم ئەوەیه لار بوونەوەی نووسەرانی نامەکەیه به لای سۆڤێت دا و شکانی سیاسەتی بێ لایەنیه له نێوان ڕووس و ئینگلیز دا که له گۆڤاری ( نیشتمان) دا ڕەنگی داوەتەوه .

**کۆمەڵەی ژ.ک** به مەبەستی ڕاگەیاندنی ئاشکرای بەرنامه و ئامانجەکانی ئەم یاد داشتەی خوارەوەی دابوو به **خەلیلی ئەدهمی** وەزیری ڕاوێژ کاری حکومەتی تاران له کاتی هاتنی بۆ مەهاباد. یاد داشتەکه کورت کراوەتەوه.:

« ١ - له لایەن حکومەتی ئێرانەوه زمانی کوردی به ڕەسمی دابنرێ بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان که ژمارەی دانیشتوانی ٣ میلیون پتره.

٢ - زمانی کوردی بیێ به زمانی خوێندن و به ڕێوه بەریەتی و دادگەری له کوردستان.

٣ - فەرمان بەران له هەموو کوردستانا کورد بن

٤ - ئەو باجه (مالیات)ی له کوردستان کۆ دەکرێتەوه ئەبێ بۆ کوردستان بەکار بهێنرێتەوه بۆ دروستکردنی خەسته خانه و قوتابخانه و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان نەک بۆ ڕازاندنەوەی تاران.

٥ - ئەبێ ئەم داخوازانه له پارلمانا باس بکرێن و قانونێک دەر بارەیان دابنرێت تا کورد دلنیا بێ.

٦ - ئەمه داخوازی ئێستا مانن. بەلام کۆمەڵەکەمان ژ.ک بروای تەواوی هەیه بەوه که (هەتی دوا ڕۆژ دانان) تعیین سرنوشت مافێکی ئەساسی سروشتی‌یه بۆ

هەموو نەتەوەیەک. لە بەر ئەوە پێویستە دوای کۆتایی شەڕی جیهانگیری دووەم لەم لایەنەوە گفتگۆ بکرێ، وە هیچ گومانی تیا نیە کە کورد خۆی دوا ڕۆژی خۆی دا ئەنێ.

٧ - کۆمەڵە ئەم یاد داشتە بلاو ئەکاتەوە و نەتەوەی کورد کە چارە نووسی خۆی دانا حکومەتی ئێران ئەوسا بە دراوسیەکی باش و بە وەزن دائەنێ.»(٢٦)

وەک لە نێوەرۆکی ئەم یاد داشتە دەر دەکەوێ **کۆمەڵەی ژ.ک** ئەم داخوازانەی وەک ستراتیژی فۆناخی کاتی سەر دەمی شەڕ هێناوەتە گۆڕێ و مافی دانانی چارە نووسی بۆ دوای برانەوەی شەڕی دووەمی جیهانی هێشتۆتەوە.

## گۆپینی شەکر و قەند

لە گەڵ پەرە گرتنی **کۆمەڵەی** ژ.ک حکومەتی کۆنە پەرستی ئێرانیش لە کوردستان چالاکی خۆی توند تر دەکرد. حکومەتی ئێران لە چەند لاوە هە وڵی دەدا کە دەست بخاتە نێو بزووتنەوەی کورد و لە بنەوە هەڵۆڵی بکات. لە لایەک دەستی گەیاند بوە هێندێ سەرۆک عەشیرەتی نۆکەر سیفەت و چڵکاو خۆر و لە لایەکی تریش بە بلاو کردنەوەی گۆپینی شەکر و قەند دەیویست خەڵک بۆ لای خۆ ڕاکێشێ. بەڵام لەو ڕێگایەشەوە هەر هومێدی بە ئاغاوەت و دەرەبەگان بوو. کۆپێن کە دەبوایە بدرێ بە خەڵک، دەیاندا بە خاوەن مڵک و ئاغاکان. دەرەبەگی کورد کە بۆ شەکر و قەند سەر شانی خۆی دەپچری، تەواوی شەق و شەپانکاری ژاندارمی حکومەتی عەجەمی لە بیر خۆ برد بۆوە. پێناسی مردو وزیندووی خەڵکی گوندی کۆ دەکردەوەو و چیا و خڕو دۆڵی بە ناو گوند دەنووسی و گۆپینی پێ وەر دەگرت.

شاعیر و نووسەرانی نیشتمانپەروەر کە لە دەوری **کۆمەڵەی** ژ.ک کۆ ببوونەوە بەنووسینی شیعر و پەخشان کردەوەی دزێوی سەردار عەشیرەت و دەرە بەگی کوردیان لە قاو دەدا و ڕیسوایان دەکردن. لەم بوارەدا چەند نووسراوەی **ماموستا هەژاری** ڕەحمەتی بە ناوی ( دمە تەقەی پایز و باپیر) و شیعری

**مامۆستا هێمن** کە دەیگوت :

**« لە شەرم و شوورەیی مردم، بە خۆم من چۆن بڵێم کوردم**
**کە ئاغا ئابڕوی بردم ، ئەمن دەیڵێم و بێباکم »** ( بڕوانە تاریک و روون دیوانی شاعیری میللی کورد هێمن .)

یا شیعری **کا حەمەدی سەروکانی ( کاپیتان قادری)** بە ناوی کوردە هەستە) کە دەیگوت :

**« گەر چی مێژو وتو دەنووسن میللەتی کوردی رەشید . من دەڵێم کەمتر لە جونە خان و ئاغا بێ دوژ»** ( بڕوانە کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری )

بێ جێ نابێ کە هەر لەم بوارە دا دمە تەقەیەکی دوو کەسی بلاو بکەینەوە کە لە گۆڤاری (نیشتمان)ی ژمارە ٦ بلاو کەرەوەی بیری **کۆمەڵەی ژ.ک** دا چاپکراوە.

**پایز – باپیر لە کوێ بوی؟ « چو بوومە شاری »**
**پایز – دەنگ و باس چبوو لە ناو بازاری**
**باپیر – دەڵێن روسەکان هێجگار لە پێشن**
**بەم زوانە کلکی هیتلەر دەکێشن**
**سوپای هەشتەمیش لەو لا ئازایە**
**خەریکی گرتنی ئیتالیایە**
**پایز – ئەدی ئاغامان خەریکی چیە**
**لە مێژە ئاگام لە حالی نیە**
**باپیر – ئەمن چو زانم هیچ تا سەلمێنی**
**خەریکە دیسان قەندی بستێنێ**
**پایز – جا قەندی بۆ چی دەدەنێ کاکە**
**خو ئاغا نەیبو قەت بو وان چاکە**

باپیر - قەندی دەدخەنی دەبەستن دەستی
هەتا کو نەکا بیری سەر بەستی
بایز - لە باتی قەندی چی دەدا قیمەت
باپیر - شەرەف و ناموس ویجدان و غیرەت
بایز - دەک یا خوا جەرگی بی پارە پارە
شەرەف دەفروشی بە پول و پارە
هەلا هەلا بی کەم دەولەمەندە
چی ئیحتیاجی بە پول و قەندە
باپیر - مەگەر نەت بیستوە بایزە روت ئەتو
گەشک رەقترە تا پتر بی دو
بایز - بە خیر نەیەوە نەفامی بی هوش
ئەم دی قەت پیت بی خەبەریکی خوش»

لە کەش و هەوایەکی ئاوا ئالۆز و پر لە گیرو گرفت، بو بە هیز کردنی تەشکیلات و پتەو کردنی دەسەلات و پرستیژی خوی لە سیاسەتی ناوەکی و دەرەکی. کومەڵە بریاری دا کە شەخسیەتی ناسراوی کورد **قازی محەممەد** داوەت بکا بیتە نیو کومەڵە. و ئەرکی خوی لە بردنە پیشی سیاسەتی کومەڵە و رزگاری نەتەوەو نیشتمان لە ریزی کومەڵەدا بە جیٰ بگەیینیٰ. دیارە ئەم بریارەش هەروا لە خورەو بیٰ هز نەبوو. **قازی محەممەد** جگە لە ناسراوی بنە ماڵەیی و هەلکەوتی کومەلایەتی، بو خوی کەسایەتیەکی ناسراوی زانستی و سیاسی و کولتوری کوردستان بوو. وەک باب و باپیرانی هەمیشە لە نیو روحانی و زانایانی ناوچەدا جیگای ریز و بایەخ بوو. قازی لە پاریزگاری مافی کوردان و بە تایبەت فەقیر و هەژاران بە ناو بانگ بوو. یارمەتی لیقەوماوانی دەدا، لە سەر دەمی دیکتاتوری رەزا شاش دا هەودای کارو باری سیاسی و کولتوری و کومەلایەتی مەهابادی بەدەست بوو. بو پەرە پیدانی کولتور و خویندەواری کوردی هەولیکی

زۆری دەدا. دوای تێکچوونی حکومەتی پەهلەوی هێندێ عەشیرەت و ئاغا رووتە ویستوویانە لە مەهاباد ئاژاوە بنێنەوە. قازی لە رێکخستن و چەکدار کردن و ئامادە کردنی خەڵکدا بۆ بەر گری و پاراستنی ئەمنیەت و ئاسایشی خەڵک دەورێکی گرنگی هەبوە. ئەم خەسڵەت و ئاکارە جوان و جوامێرانە وای کردبوو کە **قازی محەممەد** نەک هەر لە مەهاباد بەڵکوو لە سەرانسەری کوردستان بە کەسایەتیەکی رێز دار و مەزن و قیدا کار بناسرێت. قازی لە مانگی ئوکتوبری ١٩٤٤ داوەتی کۆمەڵە قبوڵ دەکات و دەبێتە ئەندامی ژ.ک.

چوونی **قازی محەممەد** بۆ نێو کۆمەڵە لە هەموو بارێکەوە بوو بە هۆی پێشکەوتن و بە هێز بوونی زیاتری ئەم رێکخراوەیە.

**کۆمەڵەی ژ.ک** بە گوێرەی بارودوخی کۆمەلایەتی و کولتووری ئەو سای کوردستان لە بواری سیاسی و زمان و کۆمەلایەتی و کولتووری‌یەوە هەنگاوی گرنگی هاویشتن.« **کۆمەڵەی ژ.ک** بریاری داوە بۆ رووناک کردنەوەی بیری نەتەوەی کورد و دۆزینەوەی هۆی چارەرەشی ودواکەوتنی ئەم میللەتە بەستە زمانەو بێ دەسەلاتە لە هیچ فیدا کاریەک روو وەر نەگێرێت»(٢٧)

لە بواری سیاسیەوە کۆمەڵە ویستوویە لە نێوان دوو هێزی داگیر کەری ئێراندا، خۆ بە لایەکەوە نە بەستێتەوەو لەم رێگایەوە پێشی بوختان و تاوانبار کردنی کومو نیستی و بولشەویکی بگرێت.( بروانە گۆڤاری نیشتمان ژمارە ٢ ) ئەگەر لە لایەک بەریتانیای مەزن بە ئالاٰ هەڵگری ئازادی هەموو گەلان و هەر وەها گەلی کوردیش دەناسێنێ) کە بۆتە جێگای رەخنەی دوکتور **عەبدولرەحمان قاسملو** لە گۆڤاری نیشتماندا زۆر جاریش بە شیعر و پەخشان تاریفی لینین و ستالین و شۆرشی ئوکتوبر کراوە. بە رای من ئەوە سیاسەتێکی ژیرانە بوە. هێزی سیاسی کوردی کە لەم سەر دەمەدا داوا کاری سەر بە خۆیی و یەکگرتنەوەی کوردستانی گەورە بوو بێت، نە دەبوایە خۆ بە یەکێ لە زلهێزەکانەوە ببەستێتەوە. بە تایبەت کە ئەو دەم ئینگلیز و ئەمریکا لە ئێراندا دەوری گرنگیان هەبوو. قازی محەممەد

ویستوویەتی لە گەڵ ئەوانیش پێوەندی بگرێ و سەرنجیان بۆ مەسەلەی کورد رابکێشێت.

لە بواری کۆمەڵایەتیەوە **کۆمەڵەی ژ.ک** بایەخێکی زۆری بە یەکیتی کۆمەلانی خەڵک دەدا. سەر کۆنەی دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتانی کردوە کە واز لە دوو بەرەکی و خۆ خۆری و نۆکەری بێگانە بێنن.« ئەی ئاغاو سەردار عەشیرەتە خۆشە ویستەکانی کورد! تۆزێ ورد ببنەوە، بزانن ئەو دراوەی دوژمن ئەتانداتێ بۆ چیە؟ بۆ بەختیاری و رزگاری ئێوەیە؟ نا . ئێوە دەبێ بزانن ئەمانەی ئیمرۆ بە بار دراوتان لە ناودا بلاو دەکەنەوە وە کوو ئێوە بێ مێشک نین و پارە بە فیرۆ نادەن. ئەوان دەزانن ئەم دراوە ئەبێتە مایەی دواکەوتنی سەر بە خۆیی کوردستان... ئەی ئاغاوەت و سەردار عەشیرەتەکانی کورد! ئێوە بن و خودا ئەم تەماعە کە بە یەقینی رۆژێک ئەبێتە هۆی ماڵ ویرانی خۆتان، فریدەن تا سەر بە خۆیی کوردستان وەدوا نەکەوێت. » (٢٨)

لە بواری زمان و ئەدەب و کولتورەوە ژ.ک هەنگاوی گرنگی هاویشتوون. جگە لە گۆڤاری نیشتمان چەند نامیلکە و کتێبی چاپکردوون. هەموو جورە شیعر و پەخشانێکی شاعیر و نووسەرانی بلاو کردۆتەوە. دیارە نووسینەکانی ئەو دەم لە ژێر تەئسیری نووسینی کوردستانی خوارو دابوە.

یەکێ لە هەنگاوە هەرە گرنگ و پیرۆزە کانی **کۆمەڵەی ژ.ک** نومایشی دایکی نیشتمان بوو. نومایشی دایکی نیشتمان بە ئیبتیکار و دەست پێشخەری **کۆمەڵەی ژ.ک و بەشداری لاوانی کورد** هاتە سەر شانۆ . ئەوەش هەنگاوێکی کوتو پر نەبوو. لە گەڵ پەرە گرتنی چالاکی و تێکۆشان و بەر بلاوبی تەشکیلاتی، کۆمەڵە دەبویست لە تێکۆشانی نهێنی بێتە دەر و وەک رێکخراوێکی جەماوەری گلوب و باشگایەکی هەبێ و خەڵک بە ئاشکرا رووی تێ بکاو لێی کۆ بنەوە. « لەم کاتەدا VOKS (رێکخراوی نێو نەتەوەیی تەبلیغاتی شورەوی) ئەنجومەنی پێوەندییەکانی کولتوری ئێران - شورەوی لە

تاران دادەمەزراند. ڕێبەرانی کۆمەڵەی ژ.ک داوایان لە کار بەدەستانی شورەوی کرد کە لە مەهابادیش شتێکی ئەوتۆ دابمەزرێنن. ڕووسەکان موافقەتیان کرد. ئەویش نەک بە ناوی ( ئەنجومەنی پێوەندییەکانی کولتوری ئێران - شورەوی ) بەڵکوو بە ناوی ( ئەنجومەنی پێوەندییەکانی کولتوری کوردستان - شورەوی ). یانەی ئەم ئەنجومەنە زۆر زوو پڕ بوو لە خەڵک . لە مانگی ئەپریلی ١٩٤٥ ڕێ ورەسم و ئاهەنگی کردنەوەی ئەنجومەن بە ڕێوە چوو. کۆمەڵە بە ئاشکرا هاتە مەیدان. کونسولیشورەوی لە ورمێ و سەرۆکی VOKS لە ئازەربایجان میوانی شانازی ئەم ئاهەنگە بوون. کوردەکان بە ناردنی ١٠ سندوق سیغار لە توتنی کوردی بۆ پاریزەرانی لینینگراد ڕەسمی هەقناسی خۆیان بە جێ گەیاند. بەشی سەرنج ڕاکێش و بەر چاوی ئەم بەر نامەیە( ئۆپێرا) یەک بوو کە لە ویدا ژنێک بە ناوی(دایکی نیشتمان) نیشان دەدرا کە لە لایەن سێ کەسی لات و سەر سەری، واتە عیراق و ئێران و تورکیا دەست درێژی بۆ کراوە. ئاخرەکەی کورە ئازاو بە غیرەتەکان لە چنگ ئەم بێ شەرمانەیان دەهێنا دەرێ. خەڵک کە لە گەڵ ئەم جۆرە نومایشە شارەزاییان نەبوو، بە توندی دەهاروژان. بە جۆرێک تەنانەت کۆنە دوژمنەکانیش لە کاتێکا دەگریان و یەکتریان لە باوەش دەگرت سوێندیان دەخوارد کە تۆڵە دەستێننەوە.»(٢٩)

ئەم نومایشە کە هەوەڵین تیاترۆی سەرکەوتووی کورد بوو، لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٤٥ هاتە سەر شانۆ وماوەیەکی زۆر لە شارە ئازادەکانی کوردستان نیشاندرا و لە هەموو شوێنێ لە لایەن کۆمەلانی خەڵکەوە بە گەرمی پێشوازی لێکرا. نومایشی (دایکی نیشتمان) ژێر دەستی و داگیرکراویی کوردستانی نیشاندەدا. پەیمانی شومی سەعدئابادی دینا بەر چاوان، ئاخرەکەی ڕۆڵەکانی کورد رادەپەرین و بە زەبری شمشیر زنجیری کویلەتی و دیلییان لە دەست و قاچی دایکی نیشتمان دادەماڵی و ئازادیان دەکرد. خەڵک بە جارێ دەهاتە جۆش و هەستی تۆڵە لە مێشک و ناخی خەڵکدا شەپۆلی دەدا.

کاتێ خوا لێخۆشبوو **عەبدوللای ئەهری** بەو دەنگە خۆش و سیحراویەی ئەم شیعرەی دەخوێندەوە:

**« لە ڕۆژنامەی موددیری کەچمەداری چەرخی شەفتوری**
**ئەنوسێ ڕۆژی کوردی کەوتە ئەوجی بورجی بێ نوری»**
**« لە بەر بێ فیکر و ئیقدامی ڕەئیسانی عەشایر بوو**
**کە ڕۆژن بۆتە زولماتی شەوی تاریکی دەیجوری**
**هەموو میللەت گەیشتنە مەنزڵی مەقصود و خۆشنودی**
**فەقەت کوردن بە جێ ماون بە مەحرومی و مەهجوری**
**برا بیری چرایێکی بکەن تاریکە شەو دادێ**
**قیامێکی بکەن تا فرسەتە بیکەین بە جەمهوری»**

لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٥ هێندێ ڕووداو هاتنە پێش بوون بە هۆی ئەوە کە بزووتنەوەو چالاکی بگاتە پلەیەک ڕێگای گەڕانەوەی نەبێ. لە مانگی مارسی ئەو ساڵە دا لە لایەن لاوانی کوردەوە ئوپێرایەک هاتە سەر شانۆ کە لە باری چۆنیەتی و تەئسیری لە سەر خەڵک بێ وێنە بوو. ناوی ئوپێراکە ( دایکی نیشتمان) و بە زمانی کوردی پەیامێکی ناسیونالیستی بوو.«دایکی نیشتمان» لە مەترسیدا و دەستەکانی زنجیر کرا بوون. تەواوی بینەرانی ئەم ئوپێرایە لە گەڵ دەنگی خەفەتباری شین و گریانی ڕۆڵەکانی دایکی نیشتمان کە لە پشتی پەردەوە دەبیسرا دەگریان و ئەسرینیان دەرشت . لە ئاخریدا کاتێ هەموو بینەران بە دەر برینی هەست و کوڵ و کۆ چەپڵەیان لێدەدا، دایکی نیشتمان بە یارمەتی ڕۆڵەکانی ئازاد دەبوو. بۆ هەوەڵین جار لە ناوچەی کوردستان لە ڕێگای ئەم (ئۆپێرایەوە) بیری قوڵ و توندی ناسیونالیستی وەخەبەر دەهات. بە ڕاستی نومایشنامەیەکی خەمهێنەر بوو..» (٣.)

**ئارچیباڵد ڕۆزوڵت** کە لە سەر دەمی کۆماری کوردستاندا چۆتە مەهاباد و چاوی بە **قازی محەممەد** کەوتو، ئەویش لە بارەی نومایشنامەی دایکی

نیشتمانەوە نووسیویەتی و دەڵێ:« لە ئەپریلی ساڵی ١٩٤٥ سازمانی تەبلیغاتی شورەوی واتا ( خانەی وکس) لە ڕێ و ڕەسمێکدا ئەنجومەنی فەرهەنگی شورەوی - کوردستانی لە مەهاباد دامەزراند. یەکی لە بەرنامەکانی سەرەکی ئەم ئاهەنگە نومایشێکی ناسیونالیستی کوردی بوو. مەسەلەی ئەسڵی ئەم نومایشە بریتی بوو لە دەست درێژی سێ عونصری چەپەڵ و خەراب - واتە ئێران و عیراق و تورکیا بۆ سەر زەمینی کوردستان و ئاخرەکەشی رزگاری دایکی نیشتمان لە لایەن کورەکانیەوە. تەماشاچیەکان کە ئەو دەم لە گەڵ تیاترو نومایش ئاشنا نەبوون، بە قوڵی کەوتبوونە ژێر تەئسیر و دوژمنانی کۆن بە ئەسرین وشتن سەریان هاویشتبوە سەر شانی یەکتر و سوێندیان دەخوارد کە تۆڵەی کوردستان بستێننەوە.»(٣١)

دامەزرانی ( ئەنجومەنی پێوەندیەکانی کولتوری کوردستان - شورەوی ) هەر لەو کاتەشدا ئیعتیراف بوو بە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد. ئەنجمەن بوو بە شوێنی کۆبوونەوەی شاعیر و نووسەران و جێگاتی پەرە پێدانی زمان و ئەدەب و کولتوری کوردی. بە دوای نومایشی دایکی نیشتماندا بە ئیبتیکاری ئەنجومەن میر میرێن ساز کرا کە یەکێ لە داب و نەریتەکانی کۆنی کوردەواریە. میر میرێنی مەهاباد باری سیاسی بە خۆوە گرت. بۆ کۆ کردنەوەی یارمەتی و پیتاک بۆ پێکهێنانی هێزی چەکداری کوردستان بە باشی کەلکێ لێ وەر گیرا.

« لەو ماوەیەدا کە ئەم نومایشنامەیە بە قوڵی کاری دەکردە سەر خەڵک، دابێکی دیکەی عەجایبی خەڵکی مەهاباد خۆی تواندو توانی بە شێوەی بەر چاو کار بکاتە سەر خەڵک و شەقڵی نەتەوەیی خۆی نیشان بدات. ئەو دەم دابێکی وا هەبوو ئەگەر کەسێک توانیبای ماوەیەکی درێژ خۆ بگرێ و پێ نەکەنێ، دەیانکردە (میر) یا (شازادە). ئەو دەم کڵاو ویەرگی تایبەتی لە بەر دەکرد و هەر فەرمانێکی دابای بێ ئەم لاولا ئیجرا دەکرا. ساڵی ١٩٤٥ دەستور و فەرمانی میر بە تایبەت لە بارەی کۆ کردنەوەی هێزی چەکدار لە مێژووی ناسیونالیزمی کورد دا نرخێکی تایبەتی وەدەست هێنا.» (٣٢)

## پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم

١ - خاطرات فردوست بەرگی یەکەم ، ١٣٧٠، ل ٨٦

٢ - خاطرات سیاسی دکتر کریم سنجابی ١٣٦٨ ، ل ٤٨

٣ - هەمان سەر چاوە ل ٥٥

٤ - عبدالقادر دباغی - راپەرینی کۆمەڵەی ژ.ک ، ١٣٦١ ، ل ٢٩

٥ - د.قاسملو - چل ساڵ خەبات لە پێناو ئازادی - ١٩٨٥ ل ١٨

٦ - کەریمی حسامی - کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری - ١٩٨٦ ، ل ٣٩

٧ - درک کینان - کردها و کردستان، وەرگێرانی ابراهیم یونسی ، ١٣٧٢ ، ل ١١٨

٨ - ئیگلتون - کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان، وەرگێرانی سەید محەمەدی سەمەدی ١٩٦٣، ل ١٩٣

٩ - مەسعود محمد - حاجی قادری کۆیی، بە شی سێیەم ، ١٩٧٦، ل ٢٥

١٠ - کەریمی حسامی - کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری ، ١٩٨٦، ل ٤١

١١ - مەسعود محمد - حاجی قادری کۆیی، بەشی یەکەم ، ١٩٧٢ ، ل ١٣

١٢ - د. قاسملو - چل ساڵ خەبات لە پێناو ئازادی ، ١٩٨٥ ، ل ٧ و ٣٨

١٣ - هەمان سەر چاوە ، ل ١٩ - ١٨

١٤ - ئارچیبالد روزولت - شوق آموختن ، وەرگێرانی صهبا سعیدی ، ١٣٧١ ، ل ٣١٥

١٥ - د. قاسملو - چل ساڵ خەبات ... ١٩٨٥ ، ل ٣٢

١٦- ئیگلتون - کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان ، وەر گێرانی س.م. سەمەدی ، ١٩٦٣ ، ل ٧١ - ٧٠

١٧- لازاریێڤ - بزوتنەوەی کورد لە سەر دەمی هەرە تازە دا، موسکو ، ١٩٨٧ ، ل ١٧٨

١٨- فاریزاڤ - بزوتنەوەی میللی کوردەکان لە ئێران ١٩٤١ - ١٩٤٥ ، موسکو ، ١٩٥٣ ، ل ١٢٥

١٩- ئن.ئی.ژیگالینا - بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردەکان لە ئێران ، موسکو ،١٩٨٨ ، ل ١١٩ -١١٨

٢٠- لازاریێڤ- مەسەلەی میللی لە ولاتانی ئێزیک وناوەراست ، موسکو ، ١٩٧٠، ل ١٦٢

٢١ - لازاریێڤ - بزوتنەوەی کورد لە سەردەمی هەرە تازەدا ، موسکو ، ١٩٨٧ ، ل ١٧٧

٢٢ - عمر فاروقي - نگاهي به تاريخ و فرهنگ كردستان ، ١٣٦٢ ، ل ٥١
٢٣ - گۆڤاری نیشتمان - ژمارە ١ ، ساڵی یەکەم ، پوشپەری ١٣٢٢ - جولای ١٩٤٣
٢٤ - ئیگلتون - کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان ، وەرگێرانی س.م.سەمەدی ، ١٩٦٣ ، ل ٧٢ - ٧٣
٢٥ - زنتار سلوبی - دوزا کوردستان ، تورکی ، ١٩٦٩ ، ل ١٧٩
٢٦ - گۆڤاری رۆژی نوێ - ژمارە ١ ، بەفرانباری ١٩٦١
٢٧ - گۆڤاری نیشتمان - ژمارە ١ - جولای ١٩٤٣ ، ل ٣
٢٨ - گۆڤاری نیشتمان - ژمارە ١ ل ٥
٢٩ - درک کینان - کوردەکانی کوردستان - وەرگێرانی براییم یونسی ، ١٣٧٢ ، ل ١٨١ - ١٨٠
٣٠ - ئیگلتون - کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان ، وەرگێرانی س.م. سەمەدی، ١٩٦٣، ل ٧٨
٣١ - ئارچیبالد روزولت - شوق آموختن ، فارسی ، ١٣٧١ ، ل ٣٢٨
٣٢ - ئیگلتون - کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان ، وەر گێرانی س.م. سەمەدی ، ١٣٧١ ، ل ٨٠ - ٧٩

## بەشی شەشەم:

# حیزبی دێموکراتی کوردستان

هێندێ کەس وەها لە دەمار گیری و ئایینی کەسایەتی و فەرد پەرستیدا نوقم بوون و بە جۆرێک تووشی لاسایی کردنەوەو گوێ ڕایەڵی کوێر کوێرانە بوون، ئیتر ناتوانن چاو بکەنەوە، بیر بکەنەوە، بە وردی لە مەسەلەکان بکۆڵنەوە، ڕوو داوەکان بە شێوەی بابەتی و زانستی شی بکەنەوە، کارەساتەکان هەڵسەنگێنن و بە سەر هاتەکان لێک بدەنەوە و لەم ڕێگایەوە پێشی دووپاتە بوونەوەی هەڵە و ڕووداوە داخدارەکان بگرن.

لەو کاتەدا کە **کۆمەڵەی ژ.ک** بە تەواوی لە تێکۆشانی نهێنی هەبوە دەر و لە سەرانسەری ناوەندو سەرووی کوردستان و لە ناوچەی کرماشان و تەنانەت لە سولەیمانیش لق و پۆپی بڵاو ببوونەوە، بە یاننامەیەک لە شاری مەهاباد بە ئیمزای ۷۲ کەس دامەزرانی حیزبی دێموکراتی ڕاگەیاند و خود موختاری و دانانی ئەنجومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی زەمانی مەشروتەی بە دروشمی حیزب دانا. تەرکیبی ئەم ۷۲ کەسە بەم جۆرە بوو: خاوەن مڵک ۲٤ کەس، سەرۆک عەشیرەت ۱٦ کەس، بازاڕی ۱۸ کەس، خوێندەوارو ڕوناکبیر ۱۰ کەس، پیاوی ئایینی واتە مەلا ٤ کەس. هیچ کەس لە ئەندامانی ڕێبەرایەتی **کۆمەڵەی ژ.ک** ئیمزایان بەم بەیاننامەیەوە نەبوو. ئەمەش دەقی بەیاننامەکەیە کە ساڵی ۱۹۸٦ لە کتێبی ( کۆماری دێموکراتی کوردستان یا خود موختاری) دا بڵاوم کردۆتەوە.

# بسمیلاهی رەحمان و رەحیم

## هاو نیشتمانان برایان

ئاگری شەری دووهەمی جیهانی کە لە لایەن وەژیر پی خرانی دیموکراسی وە بە دەستی دوژمنانی ئازادی دەست پیٚ کرا بوو بە یاسکی بە هیزی ولاتەکانی هاو پەیمان کوژاندراوە.جیهانی دیموکراتی سەرکەوت وە جیهانی فاشیزم کە ئەیویست نەتەوەکان و گەلەکانی جیهان بخاتە ژیر ئەسارەتی مستیک ری گر و خوین خور بە تەواوی نابوت بوو. هەر چلونیک کە چاوەروان دەکرا ریگەی ئازادی بو نەتەوە و گەلانی جیهان ئاوالە کراوە.

ئەمرو تەواوی گەلانی جیهان ئەیانەوی لەم ریگایەی کە ئاوالە کراوەتەوە سود وەربگرن. ئەوان ئەیانەوی لەم وادانەی کە لە پاکتی میژویی ئاتلانتیک دا دراوە سود وەر بگرن. ئەوان ئەیانەوی کارو باری خویان بە ئارزوی خویان بە جی بگەیێن.

ئیمە کوردەکان کە لە ئیران ئەژین بە دریژایی چەندین سال وچەندین سەدە لە پیناوی مافی نەتەوایەتی و هاو جیگایی خوماندا خەباتمان کردوە و لەم ریگەیەدا قوربانیەکی زورمان داوە. بەلام حاکمە دیکتاتورەکانی ئیران هیچ کاتیک بو بیستنی پیویستیەکانی ئیمە ئامادە نەبون وە تەنانەت نەیانهیشتوە لەو مافانە کە بە گویرەی قانونی ئەساسی دراوە بە ئەیالات و ویلایاتەکان سود وەر بگرین. ئەوان بە هوی گوللە و بومبا و توپ و گرتن و تەبعید و کوشتن و یەخسیر کردن وەلامی ئیمەیان داوەتەوە. بە تایبەتی لە سەر دەمی دیکتاتوری بیست سالەی رەزاخان دا ئیمە بو لە بەر کردنی جل و بەرگی نەتەوایەتی کوردیش ئازاد نەبوین. ئەوان بە هوی نوکە ئیزە بە هوی ئەفسەرە دز و ریگر و خائینەکان تەواوی مەوجودیەتی ئیمەیان ژیان و ناموسی ئیمەیان خستبوە ژیر پی. ئەوان بو نابوت

کردنی نەسلی ئیمە لە هیچ چەشنە کارەساتیکی درندانە و بی شەرمانە نەپرینگاونەوە. ئاخر ئیمەش ئادەمیزادین. ئیمەش میژوو زمان، ریو وشوین و دابی تایبەتی خومان هەیە وە ئەمانەمان خوش ئەوی.بو چی ئەبی مافی ئیمە پی شیل بکریت؟ بو چی ناهیلن کوردستان ببیتە ولاتیکی خودموختار و لە ریگەی ئەنجومەنی ویلایەتیەوە کە لە قانونی ئەساسی دا دیاری کراوە کاروبار بە ریوە ببردریت؟

هاو نیشتمانانی خوشە ویست. پیویستە ئەمەش بزانین کە هەق نادریت بەلکو دەستندریت. بو ئەوەی هەقی خومان. دەسەلاتی نەتەوایەتی وهاو جیگایی خومان وە دەست بهینین ئەبی خەبات بکەین. بو ئەم خەباتە یەکیتی و یەککرتن پیویستە. بو ئەمەش تەشکیلات و دەستەی پیشرەوپیویستە. دامەزران و دەست بە کار بوونی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد بو ئەم ئامانجەیە.

ئیوە هاو نیشتمانانی خوشە ویست. ئەبی چاو وگویی خو ئاوالە بکەنەوە. لە دەوری حیزبی خوتان وەخر بن وە بو وەدەست هینانی مافی قانونی و نەتەوایەتی خوتان فیدا کاری بکەن. حیزبی دیموکراتی کوردستان سەروکە و ریگە نیشاندەری ئیوەیە. بە تەنیا لە ژیر ئالای ئەم حیزبە دا نەتەوەی کورد لە خەتەری تیدا چون نەجاتی ئەبیت. وە موجودیت و ناموس و پیویستیەکانی نەتەوایەتی ئەو پاریزگاری لی ئەکریت. بە تەنیا بە هوی ئەم حیزبە گەلی کورد ئەتوانی لە نیو سنوری دەولەتی ئیراندا خود موختاری خوی وەدەست بخات.

هاو نیشتمانانی خوشە ویست. ئیمە جیا لە مافی قانونی و ئیسانی خومان شتیکی ترمان ناوی. شوعاری ئیمە لەو بەندانەی ژیرەوە دا بە کورتی نیشان دراوە. ئەم شوعارانە بخویننەوە وە لە هەمو پیاویکی کوردی حالی بکەن.

**ئەمانە شوعارەکانی ئیمەن :**

١ - نەتەوەی کورد لە داخلی ئیران دا بو هەلسوڕانی کاروباری مەحەللی خوی سەر بە خو وئازاد بیت. وە لە سنوری دەولەتی ئیراندا نەتەوەی کورد خود

موختاری خوی بخاتە دەست خوی.

٢ - مافی خویندنی بە زمانی زگماکی خوی هەبیت وە تەواوی کارو باری دائیرەکان بە هوی زمانی کوردی بە ریوەبیردرێت

٣ - لە سەر ئەساسی قانونی ئەساسی ئەنجومەنی ویلایەتی کوردستان بە زوویی هەلبژیردریت بە تەواوی کار وباری کومەلایەتی و دەولەتی رابگا و چاوەدیریان بە سەردا بکات.

٤ - کار بە دەستانی دەولەت بە بیٚ قسە دەبی لە خەلکی مەحەللی بن.

٥ - ئەبیٚ لە سەر ئەساسی قانونیکی گشتیدا لە نیوان لادیی و خاون ملکاندا پیک هاتنیک پیک بهیندریت وە دواروژی هەر دوک لا دابین بکریت.

٦ - حیزبی دیموکراتی کوردستان تی ئەکوشیت کە لە خەبات دا بە تایبەتی لە گەل نەتەوەی ئازەربایجان وە گەلەکانی تری کە لە ئازربایجان ئەژین لە ئاسوریەکان و لە ئەرمەنیەکان و هتد یەکیەتی و برایەتیەکی تەواو پیک بینیت.

٧ - حیزبی دیموکراتی کوردستان بە ئامانجی بەرەو پیش بردنی کشت و کال و بازرگانی کوردستان و پەرە پیداتی کارو باری فرهنگ و تەندروستی وە باشتر کردنی باری ئابوری و مەعنەوی گەلی کورد دەست ئەکات بە سود وەر گرتن لە سامانەکانی سروشتی وە کانگاکانی‌کوردستان وە لەم ریگەیەوە تی ئەکوشیت.

٨ - ئیمە ئەمانەوی بە تەواوی گەلەکانی ئیران هەلی تیکوشین بە ئازادی بدریت بو بەختەوەری وە پیش کەوتنی نیشتمانی خویان. بژی کوردستانی خود موختار ودیموکراتیک»( ئەم بەیاننامەیە تاریخی روژ و مانگ و سالی پیوە نیە.*

---

*تیبینی: ئەو بەیاننامەیە سالی ١٩٦٨ شاد رەوان دوکتور رەحیمی قازی بە خەتی خوی نووسیبوویەوەو بوی نارد بووم. لە داوینی بەیاننامەکە نووسیبووی: کاکە ئەم ئاگاداریە ئیمزای قازی و سەرزکەکانی تری کومەلەی ژ.ک ی پیوە نیە. لە سەر لاپەرەیەک بە فارسی و بە کوردی چاپ کرابوو، من لە باری ماناوە دەستکاریم نەکردوە. بە دوای بەیاننامەکەدا بلاو



بوونەوەی ئەم بەیاننامەیە وگۆرینی ناوی **کۆمەڵەی ژ.ک** بە حیزبی دیموکراتی کوردستان پێویستی بە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی زیاتر هەیە. تا ئێستاش حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢٤-١٦ی ئوتی ١٩٤٥ بە رۆژی دامەزرانی خۆی دەزانێ و یادی دەکاتەوە . لە کاتێکا ئەم رۆژە رۆژی دامەزرانی کۆمەڵەی ژێکافە و دەبێتە ساڵی ١٣٢١ - ١٩٤٢. وەک لە بەڵگە نامەکانی بەر دەست دەر دەکەوێ، گۆرینی ناوی **کۆمەڵەی ژ.ک** بە حیزبی دێموکرات بێ ئەوەی رێکخراوەکانی دەستکاری بکرێن، دەگەرێتەوە بۆ دوای سەفەری دوەمی نوێنەرانی کورد بە سەرۆکایەتی قازی محەممەد بۆ باکۆ لە سیپتامبری ساڵی ١٩٤٥ کە ئەو دەم هێشتا کۆمەڵەی ژ.ک لە تێکۆشاندا بوو ناویشی نە گۆرا بوو.. دوای گەرانەوەی قازی و هاورێیانی و پاش دامەزرانی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان لە ٣ی سیپتامبری ئەو ساڵەدا، ناوی **کۆمەڵەی ژ.ک** دەکرێ بە حیزبی دێموکرات و کومەڵە فت دەکرێ و رێکخراو و ئەندامانی **کۆمەڵەی ژ.ک** بە شێوەی ئەوتۆمات دەبن بە رێکخراو وئەندامی حیزبی دێموکرات.*

---

نامەیەکی دیکەی بۆ نارد بووم و نووسیبووی: کاکە ئەوانەی ئەو بەیاننامەیان ئیمزا کردوە ٧٢ کەس بوون، نەک ٦١ . من بۆ کەلک وەر گرتن بۆ نووسین و کار وباری رۆژنامەی کوردستان ئەو بەیاننامەو هێندێ بەڵگەو نووسراوەی دیکەم برد بوونەوە بەغدا و نوسخەیەکم لە بەیاننامەکە نوسیەوەو لە سۆفیا هێشتمەوە. کاتێ ویستم لە کتێبی کۆماری کوردستاندا وەک سەر چاوە خەتی کاک رەحیمی قازی بلاو بکەمەوە. دیتم دەستخەتەکەی دوکتور رەحیمی نەماوەو لە بەغدا سەری تێدا چوە. هەر بۆیەش لە ( کۆماری دێموکراتی کوردستان یا خود موختاری) دا ئاماژە بە سەر چاوە کەی نەکراوە. ئەگینا سەر چاوەی ئەم بەیاننامەیەی دامەزرانی حیزبی دێموکرات دەستخەتی دوکتور رەحیمی قازی بە بۆ منی ناردبوو

* ساڵی ١٩٨١ لە چیا بووین و کاک جەلیلی گادانی وەک بەر پرسی تەشکیلاتی حیزبی دێموکرات بلاتکێتێکی ئامادە کرد بوو کە ئەندامان پری کەنەوە لە کەیەوە بوون بە

بۆ ئەوەی گومان لە وەدا نەمێنێ کە حیزبی دیموکرات ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢٤ - ئاوگوستی ١٩٤٥ دانەمەزراوە، دەقی نووسراوەی ژمارە یەکی گۆڤاری ( کوردستان ) بلاو کەرەوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان- سەرماوەزی ١٣٢٤ دێنینەوە هەر چەندە ئەم دەقە لە کتێبی نوشیروان مستەفا شدا( حکومەتی کوردستان)بلاو کراوەتەوە.

دەبێ بێژین کاک نوشیروان ماڵی ئاوەدان بێ لوتفی کردوە هەم لە رۆژنامەی کوردستان بەڵگەی حاشا لێ نە کراوی بۆ دۆزیوینەوەو هەم وریای کردووینەوە کە قوڵتر لە رووداوەکانی نیشتمانی خۆمان بکۆڵینەوە. کاک نوشیروان دەنووسی :« ئەگەر چی یەکەمین بەیاننامەی خۆ ئاساندنی حیزب بە خەڵک و دانانی یەکەمین مەرامنامە و هەوەڵ کونگرەی لە سەرە تای مانگی خەزەلوەر دا بوە. کە چی حیزب هەموو ساڵی بو یادی دامەزراندنی خوی لە روژی ٢٥ی گەلاوێژدا ئاهەنگ ئەگیری. هوی ئەمەش ئەگەریتەوە بۆ ئەوەی کە ح.د.ک خوی بە درێژەی کومەڵەی ژ.ک دا ئەنی و ژ.کیش وەکو خوی لە روژ ژمیرەکانیدا نوسیویەتی لە ٢٥ی گەلاوێژدا دامەزرا بوو.» دوکتور قاسملو لە کتێبی (چل ساڵ خەبات)دا دەنووسی:« حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ٢٥ی گەلاوێژی ساڵی١٣٢٤ لە شاری مەهاباد دامەزرا و بەر نامەی خۆی بلاو کردەوە.» کتێبەکەشی هەر بە بۆنەی چلەمین ساڵی دامەزرانی حیزب نووسیوە . لە کاتێکا لە رۆژ ژمێرەکانی کۆمەڵەدا ٢٥ی گەلاوێژ بە رۆژی جێژنی سەر ساڵی دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.ک ناو براوە.

---

ئەندامی حیزب. من نوسیبورم ساڵی ١٩٤٢. مەلا عەوڵای حەیاگی و کاک جەلیل دەیانگوت حیزب ساڵی ١٩٤٥ دامەزراوە چۆن تۆ پێش دامەزران ئەندامی حیزب بووی. بۆم قانیع نەدەکران کە حیزبی دیموکرات درێژە پێدەری کۆمەڵەی ژێکافە و ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ک یەکسەر دەبوونە ئەندامی حیزبی دیموکراتیش. لەوە سەیر تر ئەوە بوو کە پاش ٣٨ساڵ تازە دەیانپرسی لە کەیەوە ئەندامی حیزبی.خۆشتر ئەوە بوو بلانکێتیان بۆ سکرتێری حیزبیش هێنا بوو کەوەلام بداتەوە لە کەیەوە ئەندامی حیزبە!!

بەلای منەوە ساخکردنەوەی ئەم مەسەلەیە پێویستی بە شیکردنەوەی زیاتر هەیە. لە کاتێکا کە رۆژ ژمێری کۆمەڵە ٢٥ی گەلاوێژ بە چێژنی سەر ساڵی دامەزرانی خۆی دادەنێ، نووسەرانی تری بێگانەو خزبی هەم ئیگلتون و هەم دوکتور قاسملو ١٦ی سێپتامبری ١٩٤٢ بە رۆژی دامەزرانی کۆمەڵە دادەنێن. یەکێ لە هۆیەکانی شێواوی مێژووی کورد ئەوە یە کە رووداوە مێژووییەکان پێکەوە نەلکاون و هەر روداو بزوتنەوە و راپەرینێکی کورد کە دوایی هاتوە، لە مێژووی سەرانسەری جیا کراوەتەوە ئەوەی تازە هاتوە رابردووی مێژوو و خەباتی نەتەوەکەی لەبیر کردوە و خۆی لە رووداوی رابردووی نەتەوەکەی جیا کردۆتەوە. ئەگەر وا نەبایە دەبوایە ئێستا ئێمە لە کوردستانی ئێران ٥١ ساڵەی حیزبی دێموکراتمان یاد کرد بایەوە .ئەگەر کورد مێژووی خۆی پچڕ چڕ نەکردبایە ئێستا ئاڵای کۆماری کوردستان دەبوایە لە هەموو بەشەکانی کوردستان بە سومبل و رەمزی میللەتی کورد ناسرا باو پەسند کرابایە. چونکە بە راستی لە مێژووی دووردرێژی نەتەوەی کورددا، هەوەڵجارە ئاڵایێکی کورد بە رەسمی و بە بەشداری نوێنەرانی هەموو بەشەکانی کوردستان هەڵکراوەو بۆتە ئاڵای کۆماری کوردستان .

با ئەم مەسەلەیە پتر روون کەینەوە. لە ژمارە ١ی «گۆڤاری کوردستان بڵاو کەرەوەی بیری حیزبی دێموکراتی کوردستان» دا کە لە دیسامبری ١٩٤٥ دەرچوە وتارێک لە ژێر ناوی (پەیامی من بە میللەتی کورد) دامەزرانی حیزبی دێموکرات رادەگەیەنێ و دەنووسێ:« تشکیل حزبی مقدسی دیموکراسی و خود موختاری کوردستان بە هەمو اهالی رشید و جانبازی کوردستان تبریک عرض دەکەم...»

پاشان گۆڤاری کوردستان لە لاپەری ١١دا لە ژێر سەر دێری( حیزبی دیموکراتی کوردستان )دەنووسێ:

« لە دوای ئەوە لە هەوەلی مانگی خەزەل وەر(آبان)ی ١٣٢٤( واتە دەبێتە ٢٣ی ئوکتۆبری ١٩٤٥ د. ) حزبی دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد داندراو بەیان

نامەی خوی بلاو کردەوە لە رۆژی ۱۳۲٤/۸/۲ هەوەل کونگرەی خوی کە تیکەل بو لە سەرانو و نوینەرانی کوردان بە ترتیبی ژیرو:

۱ - ماکوو آرارات : آغای عمر خانی جلالی. آغای شیخ حسن.آغایشیخ کی. آغای حسن‌آغای دلایی.آغای عبداللەآغای ملان.آغای فخری.

۲ - سوما،برادوست، دشت، مەر گەوەر: آغای عمر خانی شریفی. آغای‌طاهر خانی سمکو. آغای عباس‌آغای ننک. آغای قویطاس‌آغای مەمەدی.آغای حاجی وەقان. آغای شیرو. آغای عبدی. آغای حسن تیلو. آغایتمر خان. آغای مراد. آغای نورکو. آغای زبید. آغای عزو. آغای حسن‌هنارە. جنابی آغای حاجی سید عبدالله افندی.

۳ - شنو: آغای موسی خانی زەرزا. آغای قرنی‌آغای زەرزا. آغای میرزا سعید. آغای قاضی محمد. آغای کاک حمزە.

٤ - سندوس: آغای احمدی کا خضری. آغای قاسم‌آغای پیروتی. آغای محمدامین‌آغای پیروتی.

٥ - لاهیجان: آغای عبداللەآغای قادری. آغای کاک مامندی قادری. آغای کاک حسین محمدی. آغای پیروت‌آغای امیر عشایری. آغای محمد امین‌آغای پیروتی.

٦ - پیران: آغای محمد امین‌آغا. آغای قرنی آغا.

۷ -میاندواو: آغای محمد حسین خانی سیفی قاضی

۸ بوکان: آغای عبدالرحمن شرفکندی. آغای رشید علیزادە

۹ - منگور: آغای ابراهیم‌آغای ادهم. آغای مام حسن. آغای کاک سلیمان. آغای کاک حمزە. آغای میناغا.

و باقی برایانی کورد تشکیل داو لە لایەن سەران و رەوشن فکرانی حزبەوە نوتقی زور چاک دایر کرا لەم کونگرە دا هەمو لکەکانی حیزبی دیموکراسی کوردستان تصویب کرا و نوینەری تایبەتیان بو داندرا. هەر یەک لە جی‌ی خویان

دامەزران و دە ستیان بە کارکرد و هەژار هونەری جوانی کوردستان ئەم شعرانەی خوارەوەی کە باسی دیموکراتی دەکا خویندەوە.» (٢)

بە دوای کونگرەدا مەرامنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ٢٢مادەدا بەم شیوەیە بلاو کرایەوە :

## « بیسمیلاهی رەحمان و رەحیم

### مەرامنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

### فەسل: یەکەم.

١ - نیوی حیزبەکەمان حیزبی دیموکراتی کوردستانە.

٢ - بناغەی حیزبەکەمان لە سەر ئەمانەی ژیرەوە داندراوە: حەقیقەت، عەدالەت، تەمەددون.

تەواوی نیزامنامە و قانونەکانی حیزب لە پاش تەسدیق کران لە کونگرە بە جی ئەگەیەندریت.

٣ - قەلەم و گولە گەنم بە نیشانەی حیزب قوبول کراوە.

### فەسلی دووەم

٤ - لە سەر دەمی ئیستادا ئامانجی هەرە گەورەی حیزب بریتیە لە مە کە لە نیو سنووری دەولەتی ئیراندا پاریزگاری لە مافە کانی گەلی کورد بکات. وە بو پەرە پیدانی ئەم مافانە ریو وشوینی خود موختاری دابمەزرینیت. لە تەواوی ئەو ئەیالەت و ویلایەتانەی کە بە دریژایی میژوو کوردی لی دەژیت و زەحمەتیان تیدا کیشاوە، هەر وەها لە مەلبەندی کوردستان ئەبی لە سەر ئەساسی دیموکراسی سودی کومەلانی گەل لە بەرچاو بگیردریت.ئەبی بە لە بەرچاو گرتنی جیاوازی نەتەوایەتیو قەومیەت و مەزهەب حقوقی بەرانبەریان پی بدریت بو هەلبژاردنی نوینەر بو مەجلیسی شورای میللی.

٥ - ئامانجی حیزب بری‌یە لە پەرە پیدانی دیموکراسی وە لە سەر ئەساسی ئەمە

بۆ بەختەوەری بەشەریەت تێ ئەکوشیت.

٦ - حیزب لە گەل دەولەتی ناوەندی هیچ دوژمنایەتی و ناکوکیەکی نیە وە بە تەنیا ئەیەوێ لە ریگەی ئاشتی‌یەوە بۆ دامەزراندن و پەرە پێدانی فەرهەنگ و تەندروستی و کشت و کالی گەلی کورد کە لە ئەنجامی دەسەلاتی بەد فەری ئیستعماردا وە پاش کەوتوە تێ بکۆشیت وە بۆ ئەمەش داوای مافی خود موختاری نەتەوایەتی ئەکات.

## فسلی سێهەم

٧ - تەواوی مالیات و داهات بە گوێرەی پێداویست وەکو دەگریت وە لە سەر ئەساسی حیسابی بودجە تەنزیم ئەکرێ و دابەش ئەکریت.

٨ - حکومەتی میللی لە یەکەمین هەنگاوەوە دەست ئەکات بە ئاوەدان کردنی ولات وە پەرە پێدانی تەشکیلاتەکانی ئابوری و سیاسی وە لە بەر ئەمە ناتوانیت زیاتر لە سەدی ٣ی مالیاتی وەکو کراو بە حکومەتی ناوەندی بدات.

٩ - ئەبێ تەواوی مەعمورەکانی کیشوەری و سیاسی و تەشکیلاتەکانی کشت و کالی لە کوردان بێ. حکومەتی نەتەوایەتی هەر کاتێ بە پێویستی بزانیت ئەتوانێ مشاورینی دەرەوە بانگ بکا. تەواوی کارو باری کۆمەلایەتی و دەولەتی و عەدلیە ئەبێ بە زمانی کوردی بنووسرێ وە بە رێوە ببردرێت.

١٠ - حیزب بۆ پەرە پێدانی کشت و کال تێ ئەکۆشیت ماشینی نوێی کشت و کال بکریت. حیزب تێ ئەکۆشیت ئەو داهاتەی کە لادێیەکان وە دەستی ئەخەن بە باشی بفرۆشریت.

١١ - حیزب تێ ئەکۆشیت بۆ ئاوەدان کردن و خاوێن راگرتنی دێ‌یەکان وە تەواوی ئەو کۆسپانەی کە بۆ ;زیع کردنی لادێیەکان لە دێیەکرا بۆ دێیێکی تر هەیە لە نیوان لا ئەبات.

١٢ - حیزب بە بێ لە بەر چاو گرتنی جیاوازی نەتەوایەتی و قەومیەت و مەزهەب لە ژیانی سیاسی و ئابوری و فەرهەنگی و تەندروستی تەواوی ئەو

زەحمەت کێشانەی کە لە کوردستان ئەژین‌پارێزگاری ئەکات.

١٣ - بە ئاماجی پەرە پێدانی عیلم و شارستانەتی لە نێو خەلکی کوردستاندا خوێندنی ئیبتیدایی و ناوەجی ئەبێتە ئیجباری وە لە تەواوی قوتابخانەکان ئەبێ خوێندن بە زمانی کوردی بێت.

١٤ - بە ئاماجی بەرەو ژوور بردنی رادەی خوێندەواری و ژیانی شارستانەتی گەل گەلێک کانگای زانستی و کتێبخانە و قەرائەتخانە و کلوب و تیاتر و مەیدانی وەرزشی دائەمەزرێت

١٥ - تەواوی ئەو مەعمورە کوردانەی کە لە ئەیالەت و یلایەتەکانی تر لە ئیدارەکان و لەشکر دا کار ئەکەن ئەبێ بۆ کوردستان بگێردرێنەوە.

١٦ - حکومەتی میللی بە لە بەر چاو گرتنی ئازادیی خۆی لە گەلْ دەولەتەکانی تر وە تۆبەی یەکەم دا لە گەلْ دەولەتی مەزنی‌شورەوی پێوەندی فەرهەنگی و ئابوری رائەگرێت.

١٧ - حکومەتی مەحەللی کورد لە تەواوی ئەو کونفرانسە بەینەللەلیانەی کە بۆ ژیانی بەشەریەت دائەمەزرێن بە گوێرەی نفوسی خۆی تەواوی حقوقەکانی خۆی داوا ئەکات.

١٨ - حکومەتی خود موختاری کوردستان ئەبێ ئیختیاری ئەمەی هەبێت کە ئیمتیازی کانگاکانی رەعەمەلْ هێندراو و رەعەمەلْ نە هێندراوی خۆی لە کوردستان بە هەر کەسێکی بیەوێ بیدات.

١٩ - حکومەتی میللی بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی خەلْکی کوردستان لە رێگەیەکی هەرزان و بێ دەردی سەرە وە بەر بەرەکانیەکی بە تین بە بێنچەوانەی سەلەم خۆر و گران جان و موحتەکیران بە رێوە ئەبات.

٢٠ - حکومەتی میللی ئابوری کوردستان پەرە پێ ئەدات و لە تەواوی شارەکان سەنعات دا ئەمەزرێنێت. ئەبێ دەستی بەدفەری ئیستعمار لە سەر سەروەتی تەبیعی ئێمە ببردرێت. بۆ خۆمان ئەبێ لەو سەروەتە سود وەر بگرین.

وە لە عەینی کات دا بە قازانجی بەشەریەت بگەیێنین.

٢١ - ئەبێ لە تەواوی کارو باری سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی‌دا ژنانیش وەک پیاوان خاوەنی حقوقی بەرانبەر بن.

٢٢ - مافی کەمایەتیە نەتەوایەتیەکان کە لە کوردستان ئەژین (ئازربایجانی، ئەرمەنی، ئاسووری) بە تەواوی لە بەرچاو بگیرێت.

حیزبی دیموکراتی کوردستان ئازەری ١٣٢٤» (٣)

## کۆمەڵەی ژ.ک بۆ تێکدرا ؟

وەڵام‌دانەوەی بابەتی ئەم(بۆ)یە رەنگە تا رادەیەک دژوار بێ. تا ئێستا هیچ یەک لە نووسەر و مێژوو نووسانی کورد لە وانەی لە سەر بزوتنەوەی ساڵەکانی١٩٤٢ -١٩٤٦ ی کوردستانی ئێران نووسیویانە، نە هاتوون لەم مەسەلەیە بکۆڵنەوە و بە گوێرەی بەڵگەو فاکتی مێژوویی پەردە لە سەر ئەم لاپەرە شاراوەیە لا بدەن و هۆیەکانی تێکدانی کۆمەڵە روون کەنەوە. چەند نووسەری بێگانە بە کورتی قوژبنێکی هۆی وەلا نانی کۆمەڵەی ژێکافیان باس کردوە.

دوکتور **عبدالرحمانی قاسملو** لە کورتە مێژووی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران( چل ساڵ خەبات لە پێناو ئازادیدا) بە سەر **کۆمەڵەی** ژ.ک دا هاتۆتە خوارو دەنووسێ:

« بەڵام **کۆمەڵەی** ژ.ک کە لە لایەکەوە رێکخراوێکی **ناسیونالیست** و لە لایەکی دیکەوە رێکخراوێکی داخراو و نهێنی بوو کە رووی لە کۆمەڵانی بەرینی خەڵکی کوردستان نەدەکرد، وەڵامدەری وەزعی تازەی کوردستانی ئێران نەبوو. پەرە ئەستاندنی بێ وێنەی جوڵانەوەی کوردستانی ئێران کە دیارە پێوەندێکی ئورگانیکی لە گەڵ هەموو جوڵانەوەی ئێران هەبوو کە بە شێوەی نە دیتراو پەرەی گرتبوو نیازی بە رێکخراوێکی یەکگرتوو، دیموکرات و ئاواڵە بۆ کۆمەڵانی خەڵک

لە گەڵ بەرنامەیەکی روون و رێک و پێک هەبوو. بۆیە لە ماوەی بەینی ١٣٢٢ کە کۆمەڵە دەستی بە بڵاو کردنەوەی بیرو باوەری خۆی لە گۆڤاری «نیشتمان» دا کرد تاساڵی ١٣٢٤ بەرە بەرە دەر کەوت کە کۆمەڵەی ژ.ک ئیدی ئەو رێکخراوە نیە کە بتوانێ جوڵانەوەی رۆژ بە رۆژ پەرە گرتووی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی ئێران رێبەری بکا. تەنانەت تەرکیبی ئەو کەسانەش کە لە کۆبوونەوەی بانەمەری ١٣٢٢بە رێوە بەری کۆمەڵەیان هەڵبژارد بوو، یان بۆ بە رێوە بەری کۆمەڵە هەڵبژێردرا بوون بە شێوەیەک بوو کە رێگای نەدەدا ئەو روانینە بەرینەیان هەبێ کە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی‌ئێران لە گەڵ جوڵانەوەی هەموو گەلانی ئێران لێک گرێ بدەن‌و هەر لەو کاتەشدا بە هەڵسەنگاندنی هەل و مەرجی راستەقینەی وڵاتەکە بەرنامە و دروشم بۆ رێکخراوی خۆیان دابنێن. هەموو ئەوانە لە لایەکەوە و لە لایەکی دیکەوە جێگیر بوونی ئازادیە دیموکراتیەکان لە ئێران و چوونە پێشی جوڵانەوەی گشتی لە سەرانسەری ئێراندا، هەر وەها تێک شکانی ئەڵمانی هیتلەری و سەر کەوتنی خەباتی گەلان بۆ سەر فاشیزمدا زەمینەی بۆ ئەوە ئامادە کرد کە حیزبێکی پێشەنگ و وەڵام دەری رۆژ کاری نوێ بۆ یەکەم جار لە مێژووی نەتەوەی گەلی کورد دا بۆ جێ بە جێ کردنی ئامانجە لە مێژینەکانی پێک بێ. حیزبێکی ئەو تۆ هەم پێویستیەکی مێژوویی بوو و هەم زەمینەی دامەزرانی ئامادە ببوو.» (٤)

: نووسراوەکەی بەرێز دوکتور قاسملو بێ ئەوەی لە نرخی زەحمەت و کارەکەی ئەو کەم بکرێتەوە بۆ پێداچوونەوەیەکی بابەتیانە دەبێ:

یەکەم: دوکتور قاسملو دەنووسێ : کۆمەڵەی ژ.ک رێکخراوێکی ناسیونالیست بوو» باشە . بەڵام لەو سەرو بەندەو لە کەش و هەوای ئەو دەمی ئێران و جیهاندا، لە کوردستانێکی دوا کەوتووی نە خوێندەواری سەر کوتکراوی بەر دەستی حکومەتی رەزا شادا، کە زمان و ئەدەب و داب و نەریتی کوردایەتی کوێر کرا بۆوە، خەڵک دەهات زمانی خۆی لە بیر بچێتەوە و لە بیریان دەبردەوە و

بە دەردی کوردستانی تورکیایان دەبرد. کوردستان لە بواری نیزامی و ئابووری و سیاسی وکولتوری‌یە وە پێوەندی کولونیالیستی بە سەردا زاڵبوو، تا لە بارو دۆخێکی ئاوا دا، ئەگەر رێکخراوێکی ناسیونالیستی نەبایە لە چ رێگایەکەوە دەیتوانی هەستی نەتەوایەتی‌و هومێد بە کەسایەتی کورد لە ناخی کۆمەلانی خەڵکدا بهارزژێنی و بۆ مەیدانی خەبات هانیان بدا؟

خۆ ئەگەر بە چاوێکی بابەتیانە و بە نەترسی لەوە کە پێمان بڵێن (ناسیونالیست) سەیری کەش و هەوای سەرو بەندی شەری یەکەمی دنیا گر و دوای شەریش بکەین، هەر توانای ناسیونالیستی بوو لە ژێر ناوی (دێموکراسی‌و ئازادیە دێموکراتیەکاندا) تێکۆشانی گەلانی بە رێوە دەبرد. لە یەکێتی سۆڤێتی سۆسیالیستی فیلمی پێتری کەبیریان ساز دەکرد و بە خەڵکیان تیشان دەداو بە تینی ناسیونالیزم ئارتەشی هیتلەریان تێک دەشکاند. لە هەل و مەرجی ئەو دەمی جیهاندا کە مەنشوری (ئاتلانتیک)یش بلاو کرا بۆوە، تەنیا رێکخراوێکی ناسیونالیستی واتە ( پاتریوتیستی) دەیتوانی کۆمەلانی خەڵک بۆ وەدەستهێنانی مافی زەوتکراو هان بدات. کۆمەڵەی ژ.ک بە هەق ناوی خۆی نابوو« کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد».

ناسیونالیزمی کۆمەڵەی ژ.ک کە دەیویست کۆتی ژێر دەستی لە ملی گەلی کورد دابرنێ و دژی شۆڤینیزمی مەزنیخوازی داگیرکەر خەباتی دەکرد، ئەو پەری دێموکراسی و پێشکەوتنخوازی بوو. ئەو گەلانەی دوای شەری دووەمی دنیاگردژی کۆلونیالیزم بۆ ئازادی خەباتیان کردوە، هەموویان بە رێبازی ناسیونالیستی واتەنیشتمانپەروەریدا سەربە خۆییان وەدەست هێناوە.

ئەحمەد سوکارنو کە بە تێکۆشەرێکی دژی ئیستعمار و بە نیشتمانپەروەرێکی مەزن ناسراوە و هەر ئەو هەڵوێستە دژی ئیستعماریەشی بوو بە هۆی ئەوە کە سی.ا.ئ.ی ئەمریکا لە ناوی بەرێت، دەڵێ: « ناسیونالیزم بۆ ئێمە گەلانی ئاسیا و ئەفریقا ئارمانێکی گەنج و پێشکەوتنخوازانە و سەر چاوەی تێکۆشانی

ئینەیە» (٥)

جەواهیر لەعل نەهرۆ دەیگوت:« دوا ڕۆژی هیند دەبێ لە ڕێگای پێوەندی ناسیونالیزم و نوێخوازیەوە دیاری بکرێت. ناسیونالیزمی تازە هەڵگەڕانەوەیە دژی ئیمپریالیزمی بێگانە و کۆنە پەرستی.» (٦)

ژاک ڕایا مالجارا ڕێبەری بزوتنەوەی نەتەوایەتی مالاگاش دەیگوت:« ئەوان بوون بە ناسیونالیست، چونکە دەیانویست دەسەلاتی میللی وەدەست بێنن. چونکە بۆ وەدەستهێنانی پێداویستیەکانی میللەت تێدەکۆشان» (٧)

دیارە لە باس و هەڵسەنگاندنی ناسیونالیزمدا پێویستە نیشتمانپەروەری نەتەوەی ژێردەست و تێکۆشەر بۆ وەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتی ودەسەلاتی نەتەوەیی لە گەڵ ناسیونالیزمی میللەتی بالا دەستی داگیر کەر کە دەیەوێ گەلانی تر بخاتە ژێر دەست و نابوتیان بکات فەرق دابنرێ.

لێنین دەیگوت:« وەخەبەر هاتن و وریا بوونەوەی کۆمەلانی خەڵک لە ژێرمل کەچی و داهێزانی دەرەبەگی و خەباتی ئەوان دژی ستەمی نەتەوایەتی و لە پێناو دەسەلاتی نەتەوەیی وگەلیدا پێشکەوتو خوازانەیە.» (٨)

بە لای منەوە ڕەخنە گرتن لە ناسیونالیزمی کۆمەڵەی ژ.ک ناتوانێ لە گەڵ بۆچوونی زانستیش یەک بگرێتەوە. چونکە ڕێبازی کۆمەڵەی ژ.ک ڕەنگدانەوەی زوڵم و ستەمی حکومەتی شۆڤێنیستی ئێران و وەڵام دەری قۆناخی ژیانەوە و گەشە کردنی هەستی نەتەوایەتی گەلی کورد بوو لەم بەشەی نیشتماندا.

دووەم: بە ڕێز دوکتور قاسملو دەنووسێ:« کۆمەڵەی ژ.ک ڕێکخراوێکی داخراو ونهێنی بوو کە ڕووی لە کۆمەلانی بەرینی خەڵکی کوردستان نە دەکرد. وەڵامدەری وەزعی تازەی کوردستان نەبوو..... بەرە بەرە دەر کەوت کە کۆمەڵەی ژ.ک ئیدی ئەو ڕێکخراوە نیە کە بتوانێ جولانەوەی ڕۆژ بە ڕۆژ پەرە گرتووی کۆمەلانی خەڵکی کوردستان ڕێبەری بکا.» (٩)

لام وایە هیچ ڕێکخراوەیەک نەیتوانیوە وەک کۆمەڵەی ژ.ک لە هەل و

مەرجی ئەو کاتی کوردستاندا ئاوا هەستی نەتەوایەتی خەڵک بهاروژینێ و کۆمەڵانی خەڵک، شاعیر و نووسەران لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە. ئەم (پەرە ئەستاندنە بیێ وێنەی کە دوکتور قاسملو دانی پیدا ناوە) لە سەر دەمی کۆمەڵەی ژ.ک و لە ژێر رێبەرایەتی ئەو رێکخراوەیەدا پێک هاتوە.. ( لەم بوارەدا لە لاپەرەکانی پێشوودا پتر باسکراوە.) کۆمەڵەی ژ.ک نەک هەر لە کوردستانی ئێران بەڵکوو لە گەڵ بەشەکانی دیکەی کوردستانی گەورەش پێوەندی گرتوە. دامەزرانی لقی کۆمەڵە لە سولەیمانی و تێکۆشانی لە کرماشان و کردنەوەی ئەنجومەنی کولتوری کوردستان- شوروی کە لاپەرەکانی پێشوودا باسکراوە، نیشانیدەدا کە کۆمەڵ ئەوەندەش (داخراو ونهێنی) نە بوە وەک دوکتور باسی دەکات.

سێیەم:بە رێز دوکتور قاسملوله بارەی تەرکیبی رێبەرایەتی کۆمەڵە ی ژ.ک دەنووسێ:« تەرکیبی ئەو کەسانەش کە لە کۆبوونەوەی بانە مەری ١٣٢٢ بە رێوە بەری کۆمەڵەیان هەڵبژارد بوو یان بۆ بەرێوە بەری کۆمەڵ هەڵبژێرا بوون بە شێوەیەک بوو کە رێگای ئەدەدا ئەو روانینە بەرینەیان هەبێ کە خەبات گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە گەڵ حولاّنەوەی هەموو گەلانی ئێران لێک گرێ بدەن...»

خۆ ئەگەر لەروانگەی زانستیشەوە سەیری تەرکیبی رێبەرایەتی کۆمەڵەی ژ.ک و حیزبی دیموکراتی کوردستان بکەین رێبەرایەتی کۆمەڵەی ژ.ک پێشکەوتو خوازانەترو رادیکاڵتردێتە بەرچاو، چونکە روناکبیر و وردە بورژوازی شار کۆمەڵەیان بە رێوە دەبرد. بە لاّم رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات جگە لە شەخسی قازی محەممەد کە لە کۆمەڵەشدا هەر ئەندام بوو، بەشی هەرە زۆری لە سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەک وخان و ئاغا پێک هاتبوو لە دوایەشدا هەر لە ترسی ئەو ( لێک گرێدانەی جولاّنەوەی کوردستانی ئێران لە گەڵ جولاّنەوەی هەموو گەلانی ئێران) پشتیان دە حیزب و جولاّنەوە کرد و بە تەنیایان هێشتەوە.

به رای من هۆی بنەرەتی وەلاناتی کۆمەڵەی ژ.ک ئەوانە نەبوون کە دوکتور قاسملو باسیان دەکات. بەڵکور دەست تێوەردانی نەزانانەی مەئموورەکانی ئازەربایجانیشورەوی بوو لە کار وباری کوردستانی ئێراندا و کوردەکانیان هێنا سەر ئەو رایە کە بە لاسا کردنەوەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان حیزبی دیموکراتی کوردستان دابمەزرێنن. ئەوانهەر ئەو هەڵەو خەتایەیان درو پات کردەوە کە لە رەوەندی راپەرینی میرزا کوچکخان و شورشی جەنگەڵدا توشی هاتبوون و شورشی جەنگەڵیان تووشی شکان و ئاشبەتاڵ کرد.

فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان کە لە نووسراوەکەی دوکتور قاسملودا بە «بەشێکی بزووتنەوەی دیموکراتی سەرانسەری ئێران» ناو دەبری، گەلێک لە کۆمەڵەی ژ.ک ناسیونالیستتر و بەر چاو تەنگتر بوە و تەنانەت هەستی مەزنیخوازی خۆشی بە سەر کوردستاندا نە شاردۆتەوە. ئەوەش لە رەوەندی چالاکی و کردەوەو پەیماننامەکانی لە گەڵ کۆماری کوردستان و حکومەتی ئێراندا بە روونی بەر چاو دەکەوی.

## سەفەری دووەمی دەستەی نوێنەرانی کورد بۆ باکۆ

رووداوەکان لە سەرانسەری ئێران و بە تایبەت لە کوردستان و ئازەربایجان بە خێرایی و بە تیژی دەهاتن و تێپەڕ دەبوون. شەری دووەمی جیهانی لە مانگی مای ١٩٤٥ بە گرتنی بیرلین و تێک شکانی فاشیزم و تەسلیم بوونی بێ قەیدو شەرتی ئەرتەشی ئەڵمان کۆتایی هاتبوو. بە گوێرەی مادەی ی پەیمانی سێ قۆڵی ٢٩ ی ژانویەی ١٩٤٢ی نێوان ئێران و بەریتانیا و شورەوی دەبوایە شەش مانگ دوای تەواو بوونی شەر ولاتانی هاو پەیمان هێزەکانی خۆیان لە ئێران بەرنە دەری. رووسەکان خەریکبوون لەم ماوەیەدا شوێنەوارێک لە کوردستان و ئازەربایجان لە

دوای خۆیان به جێ بێڵن.

ڕۆژی ٣ی مانگی سیپتامبری ١٩٤٥- ١٢ی خەرمانانی ١٣٢٤ له تەورێز فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان دادەمەزرێت و یەکەمین بەیاننامەی خۆی به زمانی فارسی و ئازەربایجانی بڵاو دەکاتەوە. دروشمەکانی هەوەڵین به یاننامەی فیرقه بەم جۆرەی خوارەوەن. « کورت کراونەوە.

« ١ - له گەڵ پاراستنی سەر به خۆیی و تەواوییەتی ئێران پێویسته ئازادی داخلی و خودموختاری بدرێ به خەڵکی ئازەربایجان به لەبەر چاو گرتنی قانونی عادلانەی وڵات چاره نووسی خۆی دیاری بکات.

٢ - بۆ ڕاپەڕینی ئەم کارانه پێویسته ئەنجومەنەکانی ئەیالەتی و ویلایەتی پێک بێن.

٣ - له ئازربایجان خوێندن تا کلاسی سێیەم به زمانی ئازربایجانی بێت. له کلاسی سێیەم هەوراز فارسیشی له گەڵ بخوێنرێت.

٤ - فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بۆ پەرە پێدانی پیشه سازی و نەهێشتنی بێکاری تێدەکۆشێ.

٥ - فیرقه پەره پێدانی بازرگانی به یەکێ له مەسەله گرنگەکانی جیددی دەزانێ. بۆ پەیدا کردنی بازار و ڕێگای ترانزیت هەنگاوی جیددی هەڵدێنێ.

٦ - فیرقه بۆ ئاوەدانکردنەوەی شارەکانی ئازه ربایجان تێدەکۆشێ.

٧ - دامەزرێنەرانی فیبرقه دەزانن که بەرهەمی هونەری سەروەت و ئابوری وڵات جوتیارەکانن که وا بۆ دابینکردنی پێداویستی وەرزێران هەنگاوی بنەرەتی داوێژێ. به تایبەت دانانی سنوری دیاریکراو له نێوان خاوەن مڵک و جوتیاراندا و پێشگری له ماڵیاتی غەیره قانونی. فیرقه تێدەکۆشێ ئەم مەسەلەیه جۆرێک چاره سەر بکات که هەم جوتیار ڕازی بن و هەم خاوەن مڵکیش له دوا ڕۆژی خۆیان دڵنیا بن. مڵکی خالیسه(دەوڵەتی) و ئەم دەرەبەگانەی ڕایان کردوه دەدرێ به جوتیاران.

٩ - له قانونی هەڵبژاردندا زوڵمێکی زۆر له ئازربایجان کراوه. تەنیا ۲۰ کورسی دراوه به نوێنەرانی ئازەربایجان. فیرقه تێدەکۆشێ به گوێرەی حەشیمەتی ئازربایجان نوێنەر هەڵبژێرێ و هەڵبژاردن دەبێ ئازاد بێ.

۱۰ - فیرقه دژی بەرتیل خۆری و دزی و خەراپەی نێو ئیدارەکانی دەوڵەتی به توندی خەبات دەکا.

۱۱ - فیرقه تێدەکۆشێ زیاتر له نیوەی ماڵیاتی ئازەربایجان بۆ ئازەربایجان خەرج بکرێ.

۱۲ - فیرقه لایەنگری دۆستایەتییه له گەڵ هەموو دەوڵەتانی دێموکرات به تایبەت له گەڵ هاو پەیمانان.

ئەوەیه ئامانجی بنەرەتی دامەزرێنەرانی فیرقەی دێموکرات. هیوا دارین هەموو ئازەربایجانیێکی وڵات پارێز له نێو ئازەربایجان یا له دەرەوه بۆ گەیشتن بەم ئامانجه پیرۆزانه یارمەتیمان بکا.

بژی ئازەربایجانی دێموکراتیک

بژی ئێرانی ئازاد و سەر به خۆ

بژی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان ئاڵا هەڵگری ئازادی ئێران و ئازەربایجان» (۱۰)

دوای ئەوەی که قازی محەممەد بوو به ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک، به کردەوه زیاتر له پێشوو وەک یەکەم شەخسیەتی کۆمەڵی کوردەواری به لێهاتوویی کارو باری وڵاتی گرته دەست. دیاره شەخسیەت و نفوزی قازی محەممەد له بەر چاوی ئەفسەر و کاربەدەستە سیاسیەکانی شورەوی شاراوه نەبوو، به تایبەت که ئێستا ببووه ئەندامی یەکەمین ڕێکخراوەی سیاسی کوردستان و دەوری سەرەکیشی هەبوو.

« له مانگی سێپتامبری ۱۹٤٥ کاپیتان ئەماز عەلیێوف دێته مەهاباد و قازی و ڕێبەرانی دیکەی کورد بۆ تەورێز داوەت دەکا. لەوێوه بەرەو باکۆ دەکەونه

ری. له باکۆ پێیان گوترا که پێشنیاری خۆیان سەبارەت به دوارۆژی ناوچه بنووسن تا بدرێت به دەستی جەعفەر باغرۆف سەرەک وەزیری ئازەربایجانیشورەوی . ئەوانیش هەر وەک چاوه روان دەکرا پێشنیاری دامەزراتی دەوڵەتی سەر به خۆی کوردیان کرد به یارمەتیشورەوی . له دانیشتنی ڕێبەرانی کورد له گەڵ باغرۆف ، ناو براو به ڕێبەرانی کوردی گوت: هەر چەنده شورەوی لایەنگری سەر به خۆیی هەموو نەتەوەیەکی جیاوازه، بەڵام ئێوه ئێستا دەبێ له پێناو دامەزرانی دەوڵەتێکی خود موختاری دیموکراتیک که هەموو ئازەربایجان بگرێتەوه هاو کاری بکەن.. باغرۆف به سەر حیزبی توده و کۆمەڵەی ژ.ک دا هاته خوار و پشتیوانیشورەوی له حیزبی تازه دامەزراوی ئازەربایجان ڕاگەیاند. جەختی له کوردەکان کرد که ئەگەر به شێوەی تاکتیکیش بێ جارێ ڕەگەڵ ئەو حیزبه بکەون و له ڕاپەڕینی گشتیدا بەشداری بکەن.

قازی محەممەد له وەڵامی باغرۆف دا ، له سەر ئیدیعای خود موختاری کوردەکان پێی داگرت. باغرۆف بەڵێنی دا له خود موختاری کوردەکان پشتیوانی بکات. هەر وەها سەبارەت به داخوازی قازی محەممەد بۆ وەر گرتنی یارمەتی نیزامی وەڵامی ئەرێنی دایەوه. له سەر پشتیوانی له دامەزرانی حیزبێکی دیموکراتی کوردستان ڕێک کەوتن.»(١١)

لەم سەفەرەدا قازی محەممەد خۆی هاو سەفەرەکانی هەڵبژارد بوو که بریت بوون له:« قاسماغای ئیلخانیزاده حەمه حوسێنخانی سەیفی قازی، کاک عەوڵای قادری جەڵدیان، کاک هەمزەی نەلوسی، نوری بەگی بەگزاده، قازی خضری شنۆیه، میرزا مەناقی کەریمی، میرزا عەلی ریحانی.»

ئیگلتونیش به نۆرەی خۆی باسی ئەم سەفەرەی کردوه که وا کورت کراوەکەی دێنینەوه.:

« له باکۆ به دەسته گوڵ پێشوازیان له میوانان کرد. ڕۆژی دوایی بۆ باس و

وتو ویژ لە بارەی گەلاڵە و چەند پێشنیار کە دەدرا بوون بە باغروڤ سەرەک وەزیری ئازەربایجانی شورەوی کۆ بوونەوە. لە پێشدا قاسمی ئیلخانیزادە دیاری کرا بوو کە بیشنیار و ئارەزووی دێرینەی خەڵکی کورد سەبارەت بە پێکهێنانی کوردستانێکی ئازاد بە باشترین شێوە بێننە سەر کاغەز. پێش‌چاو پێکەوتنی باغروڤ ئەم کارە کرا بوو.

باغروڤ کۆبوونەوەی کردەوە و گوتی: بیرو باوەری یەکێتی سۆڤیەتی لە بارەی مەسەلەی میللی بەم جورەیە کە خەڵکێکی زمان و کولتوری تایبەتی خۆی هەبێ، بێگومان دەبێ لە هەموو مافێکی نەتەوەیی کەلک وەرگرێت. دەبێ رێگای بدەن کولتوری خۆی زیندوو بکاتەوە و پەرە پێبدا. دەبێ لە دیاریکردنی چارە نووسی خۆیدا ئازاد و موختار بێ. ئیرانیش وڵاتێکی فرە نەتەوەیە. نەتەوە جۆر بە جۆرەکان و زمانە جیاوازەکان:(کوردی، تورکی، عەرەبی، گیلەکی، و...) لە ویدا دەژین. بخوازن یا نە خوازن هەر یەک لەوانە رۆژێک دەبێ بە گشت مافی رەوای خۆیان بگەن. لەم پێوەندیە دا تێکۆشانی تورکەکانی ئازەربایجانی هەوەڵین ئالاَ هەڵگرن. هەر بۆیەش پێویست نیە کوردەکان زۆر پەلە بکەن. جگە لەوە سەر کەوتنی خەڵکی کورد لە گەڵ سەر کەوتنی کوردەکانی عیراق و تورکیا پێوەندی راستەو خۆی هەیە. سەرزەمینی ئازادی کوردی هەموو ناوچەکان لە پێش چاومانە.
من ئێوە دڵنیا دەکەم کە هەر کاتێ ئازەربایجان خود موختار بوو، ئازادی و رزگاری ئێوەشی تێدا دەبێ.

بۆ قازی محەممەد ئەمە هەوەڵین جار نەبوو کە مەسەلەی کوردەکانیان لە گەڵ مەسەلەی خود موختاری ئازەربایجان تێکەڵ دەکرد. لە وەڵامدا قازی گوتی:« خەڵکی کوردیش وەک خەڵکی ئازەربایجان بۆ وەدەست هێنانی مافی سروشتی خۆیان تێدە کۆشن.» باغروڤ ئەوەندەی لە توانایدا هەبوو پشتیوانی لە مەسەلەی ئازەربایجان کرد و بەڵێنیشی دا بە کوردەکان و دەیگوت : تا زەمانێک یەکێتی سۆڤیەتی هەیە ئازادی و رزگاری خەڵکی کورد دەستە بەرە.

قازی لە بەرانبەر ئەو هەموو هەستەی خانە خوێندا گوتی: نەتەوەیەکی ستەمدیدەو ژێر دەست هەر دەستێکی یارمەتی بۆ درێژ بکرێت، نەک هەر دەیگوشێ، بەڵکوو ماچیشی دەکات.*

پاشان باغرۆف قامکی لە سەر نوختەی سیاسی داناو گوتی : کۆمەڵەی ژ.ک بەم تەشکیلاتەوە هەرگیز ناتوانێ فایدەیەکی هەبێ. ئەمڕۆ تەواوی دەرگاکان بۆ لای دیموکراسی دەکرێنەوە. ئێوە تەماشای ئەمریکاو بەریتانیاو شورەوی بکەن. بزووتنەوەی خەڵکی کورد تەنیا لە ژێر ئاڵای حیزبێکی دیموکرات دا دەتوانێ پێش بکەوێ و دوا ڕۆژێکی هەبێ.

باغرۆف باش لە مەسەلەکە تێگەیشتبوو. بە جەختەوە گوتی : لە چەند نۆرەدا چەکی پێویست لە : تانک، تۆپ، موسەلسەل، تفەنگ و... بۆ مەهاباد دەنێردرێ. لە گەڵ ئەوان یارمەتیەکی بەر چاوی ئابووریش دێت. زانکۆی ئەفسەری باکۆ هەموو کوردە داخوازەکان وەر دەگرێ. رادەسپێرمە پیشەوەری کە ٨. کەس لە کوردە داواکارەکان لە زانکۆی ئەفسەری تەورێز( کە بەم زوانە دەکرێتەوە) وەربگرێ. دەزگایەکی ماشێنی چاپیش زۆر زوو بۆ بڵاو کردنەوەی چاپەمەنی کوردی بۆ مەهاباد دەنێردرێ.

نوێنەرانی کورد بەرنامەی سەفەرەکەیان وابوو کە بچن سەری تفلیس بدەن. بەڵام خەبەریان پێدان کە بارزایەکان گەیشتوونە کێلە شین و ئاوای دیوی ئێران

---

* پاش ٩ ساڵ بە قەولی واسیلی نیکیتین مەسعود محەممەد جلی پارێزەری عدلیە و لاوی کورد و نوێنەری پارلمانی بەغدا ئاوا وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە:« ئەگەر دەوڵەتی شورەوی پێشنیار بە کوردەکانی عیراق بکا کە ئامادەیە لە کادری کۆمارەکانی یەکێتی شورەوی‌دا کوردستانێکی گەورە پێک بێنێ، هەڵوێستی کوردەکانی ئاو براو چۆن دەبێ؟» وەڵام دانەوە بەم پرسیارە زۆر دژوارە. بەڵام ئاشکرایە کە ئێمە دەستی یاری و پشتیواتی هیچ دەوڵەتێک بۆ پێک هێنانی کوردستانێکی گەورە ڕەت ناکەینەوە» بڕوانە نیویورک تایمز ٧ی ژوئیەی ١٩٥٤. واسیلی نیکیتین، کورد وکوردستان، وەرگێرانی محەممەدی قازی،١٣٦٦، ل ٤٣٧

دەبن. سەفەرەکەیان پەک خست و گەرانەوە. »ئیگلتون دەنووسی:«یەکێ لەو کەسانەی لەم سەفەرە دوو دڵ بوو، پیاوی ناسراوی عێلی دێبۆکری بۆکان، **قاسماغای ئیلخانیزادە** بوو. ناو براو داوەتی **ژەنراڵ ئەتا کشی نوڤی** بۆیە قبوڵ کرد بوو کە بەڵکوو ئەم کارە ببێتە هۆی هەڵکەوتی کوردەکان و بۆ کورد سودی هەبێ. لە وێ تێگەیشتبوو کە ئامانجی **باغرۆڤ** ئەوەیە ناوچەکە لە ئیران جیا کاتەوەو بیلکێنێ بە سۆڤیتەوە، ئەوەی زەحمەت بە خەیاڵی دابێ مافی کوردە. **قاسماغا** چاوی بە **کاک حەمزەی** نەلۆسێنیش کەوت و ئەویشی لە گومان و دوو دڵی خۆیدا کردە شەریک. کاتێ لە باکۆ گەرایەوە لە جیاتی ئەوەی لەم کەش و هەوایەدا بچێتەوە مەهاباد و شوێنێ بۆ خۆی وەگیر خات، چەند حەوتوو لە تەوریز مایەوە. لە وێش خەڵکێکی زۆری وەک خۆی دوو دڵ کرد. ئاخرەکەی کردەوەی ئەو بوو بە هۆی ئەوە کە سەرۆکەکانی تری دێبۆکری لە گەڵ ( **ژەنراڵ هومایون**) فەرماندەی ئەرتەشی ئیران لە بەشی کۆماری کوردستان پێوەندی بگرن. ئەو دەم کەسانێکی زۆر لە مەهابادلە **قاسماغا** وەشک کەوتبوون.»(١٢)

بەڵگە و رەوەندی رووداوەکان پتر وەک ئەوە دەچن کە حیزبی دێموکراتی کوردستان دوای گەرانەوەی سەفەری دووەمی نوێنەرانی کورد بۆ باکۆ و دیتنی سەرۆک وەزیری ئازەربایجانی شورەو ی، **جەعفەر باغرۆڤ** دامەزرا بێت. « قازی لە کۆبوونەوەیەکدا بە لێنەکانی یەکێتی سۆڤیتی بۆ رێبەرانی **کۆمەڵەی ژ.ک** باسکردو

دداوای لێکردن کە هەر وەک **باغرۆڤ** ویستوویەتی ناوی **کۆمەڵەی** ژ.ک بە حیزبی دێموکراتی کوردستان بگۆردرێ و لە ژێر ئاڵای دێموکراسیدا تێکۆشانی ئاشکرا دەست پێ بکا. هەر چۆنێک بێ حیزب ڕێکخراوەکانی خۆی نە گۆری و ڕێبازی مارکسیستی نەگرتە بەر. قازی لە شوێنی خۆیدا وەک تاقە دەسەلاتداری حیزب مایەوە. حیزب بەرنامەی ٧ مادەیی خۆی لە بارەی گەیشتن بە خود موختاری - نەک سەر بەخۆیی - بلاو کردەوە.»(١٣)

ئیگلتۆنیش لە گەڵ بلاو کردنەوەی بەر نامەی ٧ مادەیی حیزبی تازە باسی دامەزرانی حیزبی دیموکرات دەکا و دەتووسێ :« کەم کەم بۆ پیادە کردنی رێنوێنی جەعفەر باغرۆف سەبارەت بە گۆرینی کۆمەڵەی ژ.ک بە حیزبی دیموکراتی کوردستان هەنگاو داڕێژرا. تا کارەکان هەمور ساز بوون بیست رۆژی خایاند. لە مانگی سپتامبری ساڵی ١٩٤٥ هاشمێتۆف کونسولی رووس لە ورمێ دەفتەری ئاوەندی پێوەندی‌یەکانی کولتوری لە مەهاباد پێکهێنا. کۆمەڵەی ژ.ک تا ئەو دەم کار و تەشکیلاتی نهێنی بوو. بۆ کۆبوونەوەو دانیشتن لە گەڵ خەڵک جێگای نەبوو. رۆژێک لە رۆژەکانی مانگی نوامبری ١٩٤٥ سەرۆکی شەست عێل و پیاوە تێو بەدەرەوەکانی شار لە لایەن قازی محەممەدەوە داوەت کران کە لەم دەفتەرەدا ئامادە بن. بەر پرسانی رووس لە ئاوچە بە پێچەوانەی راسپاردەی دەوڵەتی خۆیان لەم کۆبوونەوەیە دوور کەوتبوونەوە و بە رێوە بردنیان دابوە دەست خودی کوردەکان. قسەکانی قازی وەک هەمیشە ئارام و ئاقڵانە و زۆر بە ژیربێژی دەست پێکرا. دوا رۆژ بینی و توانایی لە هەمور وشەکانیدا دیار بوو. باسی سەفەری باکۆی کرد. راسپاردەکانی باغرۆفی لە بارەی کۆمەڵەی ژێکافەوە باسکرد و گوتی پێویستە ناوی کۆمەڵە بگۆردرێت و زیاتر لەوە کارەکان بە نهێنی نەبن و هەمور کارەکان لە سەر نەزمی دیموکراسی بە رێوە بچن. قازی ئەوەشی لێ زیاد کرد کە برایانی رووس یارمەتی پێویست بە حیزبی تازە دەکەن. لە ئاخریدا گوتی : داخوا کەس پرسیارێکی هەیە؟

داخوا روونکردنەوەو شیکردنەوەی پتر پێویستە؟ لە وەڵامدا گوتیان نا. بریاری پێویست درا. لەم دانیشتنەدا باسی چۆنیەتی حکومەتی دوارۆژی کوردستانی خود موختار نەکرا.»(١٤)*

* – وادیارە ئیگلتون لێرەدا بە سەهو چوە و یا خەرابیان بۆ گێراوەتەوە. چونکە بە گوێرەی هەمور سەر چاوەکانی تر هەر وەک لە لاپەرەکانی پێشوو دا باسکراوە ، ئەنجومەنی

له تێڕوانینی بەڵگەو ڕووداوەکان ئەم بۆ چوونە پتر بە هێز دەبێ کە حیزبی دێموکرات دوای سەفەری دووەمی نوێنەرانی کورد بۆ باکۆ ودوای « ڕێنوێنی جەعفەر باغرۆف» دامەزرا بێ. ئەگەر تەماشای بەر نامەی حیزبی دیموکرات بکەین بۆ مان دەر دەکەوێ کە بە کەمێک دەست لێدان و جێگۆڕکێی وشەکان، جورە کوپیەکی بەرنامەی١٢ مادەیی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجانمان دێتە دەست کە لە ٣ی سیپتامبری ١٩٤٥ دا بلاو کراوەتەوە. واتە کەمێک پێش سەفەری نوێنەرانی کورد بۆ باکۆ.

## هاتنی بارزانیەکان بۆ کوردستانی ئێران

مەسەلەی شۆڕشی بارزان و حیزبی هیوا و بە شداری ئەفسەرانی ئازادیخواز لە شۆڕشی بارزاندا و سیاسەتی حکومەتی عیراق و بومبارانی بارزان لە لایەن فرۆکەکانی ئینگلیزەوە لە زۆربەی نووسراوەی کورد و بێگانەدا باسی کراوە و دوور پاتە کردنەوەیان لێرەدا چ زانیاری زیاتر نادەن بە خوێنەری کورد. بەڵام ئەگەر بە وردی بڕوانینە سەر جەمی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، ڕاپەڕین و شۆڕش لە هەر یەک لە بەشەکانی کوردستان، زۆر یا کەم تەئسیریان کردۆتە سەر ڕەوتی کولتوری و کۆمەڵایەتی بە شەکانی دیکە.

ڕاکردنی مەلا مستەفای ئەمر لە سولەیمانیەوە بۆ بارزان ساڵی ١٩٤٣ و هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش ناکرێ هیچ تەئسیری لە ڕووداوەکانی کوردستانی ئێران وەر نەگرتبێ. لە ١٩٤١ وە حکومەتی پاشایەتی ئێران دەسەلاتی بە سەر



پێوەندی‌یەکانی فەرهەنگی کوردستان- شوڕەوی لە مانگی مارسی ١٩٤٥ لە مەهاباد کراوەتەوە. ئەو کۆبوونەوەی و عەشیرەتانیش کە ئیگلتون باسی دەکا، لە مانگی نوامبر نەبوە و لە ١٣٢٤/٨/٢ - ٢٤/ئوکتوبری ١٩٤٥ دا پێک هاتوە و بە هەوەڵێن کۆنگرەی حیزبی دێموکراتیش دەژمێر درێ کە بە دوای ئەو دا مەرامنامەی حیزبیش بلاو کراوەتەوە.

کوردستاندا نامێنێ. لە ساڵی ١٩٤٢ لە کوردستانی ئێران کۆمەڵەی ژ.ک دادەمەزرێ و بە چەشنی هەراو بیر و هەستی نەتەوایەتی بڵاو دەکاتەوە. مەلا مستەفا بە لێکدانەوەیەکی ورد و تێڕوانینانە دەگاتە ئەم بیرو رایە کە مانەوەی لە سولەیمانی و لە ژێر چاوە دێری پۆلیسی عیراقدا بێ کەڵکە. لەم دەرفەتە کە بەشێکی نیشتمانەکەی ئازادە، پێویستە کەڵک وەر گرێ و بگەڕێتەوە بارزان. بۆ گەڕانەوەش ڕێگای ڕۆژ هەڵاتی کوردستان ڕەچاو دەکا و دێتە گوندی کولیچی ماڵی کاک مامەندی قادری ناوچەی لاجانی مامەشان و ناوچەی شنۆیە کە لە گەڵ ناوچەی بارزان و زێباریان هاو سنوورە.

ڕۆژی ١١ی ئوکتۆبری ١٩٤٥ نیزیکەی چەند هەزار کەسی بارزانی و عەشیرەتی دیکەی ئەو دیو بە ماڵ و خێزانەوە بە سەرۆکایەتی بارزانی نەمر مەلا مستەفا، لە ڕێگای کێلە شین و سنوورەکانی ڕۆژ ئاوای شنۆ گەیشتنە بەشی ڕۆژهەلاتی کوردستان. کۆمەلانی خەڵکی ناوچەی شنۆ و سندوس و لاجان بە دڵێکی ئاواڵەو فراوان و هەر لەو کاتەشدا خەمبار و خەفەتاوی پێشوازیان لێکردن.

لە شاری شنۆ کومیتەیەکی یارمەتی و فریا گوزاری لە پیاو ماقوڵانی شنۆ ولاجان بە سەرۆکایەتی مام وسێتی سۆفیانێ دامەزرا. لە نەغەدا کومیتەیەک بە سەرۆکایەتی حاجی مەلا خالیدی دەربەندی کومیتەیەک دامەزرا بۆ ڕاپەڕاندنی پێداویستە سەرە تایبەکانی ژیانی لێقەوماوانی بارزان دەست بە کار بوون و وردە وردە بە ڕاو تەگبیری بەر پرسەکانیان لە گوندەکانی شنۆ و لاجان و سندوس تا ڕادەیەک شوێن و جێگایان بۆ ئامادە کرا.

مەلا مستەفا یەکسەر نە چوە مەهاباد. یا لە لایەن مەهابادەوە داوەت نەکرا. لە کاتێکا کۆمەڵەی ژ.ک پێشتر نامەی بۆ نارد بوو، پێوەندی لە گەڵ گرتبوو. ئێستا دەکرێ بیر لە وە بکرێتەوە کە بۆ چی هەر دوای هاتنیان بۆ شنۆ لە لایەن حیزبی دێموکراتەوە داوەت نەکرا و پێشوازی لێ نەکراو ئەم داوەت و پێشوازیە

رەسمیە بۆ مانگی رەشەمەی ١٣٢٤ وەدوا خرا.

م ئارچیبالد روزولت کە لە ساڵەکانی بزوتنەوەی کوردستان و ئازەربایجان ژ وابەستەی نیزامی باڵیوز خانەی ئەمریکا لە تاران و کار ناسی مەسەلەی ئێران و مەعموری ناسین و شارەزایی ئەم ناوچانە بوە کە هێزەکانی رووسی تیدا جێگیر بوون و پێشتر لە بەغدا بوەو بە قسەی خۆی «گرنگی مەسەلەی کوردەکان - نا ئارامترین خەڵکی ناوچە لە وڵاتدا - سەرنجی راکێشاوەو چەند جار چۆتە کوردستان و لە گەڵ چەند کەسایەتی کورد لە بەغدا بۆتە ئاشنا و لە کتێبەکەشیدا چەند لاپەرەی لە سەر شۆرشی بارزان و شەخسی مەلا مستەفا و سیاسەتی چەپەلی ئینگلیز سەبارەت بە کورد و شکانی لەشکری عیراق و ئازایەتی عەشیرەتی بارزان و خەیانەتی عەشیرەتەکانی تری کورد و چوونی بارزانیەکان بۆ کوردستانی ئێران- نووسیوە. ساڵی ١٩٤٦یش چۆتە مەهاباد و چاوی بە پێشەوا قازی محەممەد کەوتوە دەنووسێ:

« رۆژی ٧ی ئوکتوبر هێزەکانی حکومەتی عیراق بارزانیان گرت. مەلا مستەفا لە گەڵ کەلێک لە هاو کاران و هاو خەیاتی بەکار و لێهاتوو بە خاو خێزانەوە سنووریان بەزاند و هاتنە خاکی ئێران. لە ئێران ژەنراڵێکی شورەوی بە ناوی (لیوبوف) بە مەلا مستەفای گوت لە مەهاباد خۆی بە قازی محەممەد بناسێنێ و کەسەکانیشی بخاتە ژێر دەستی قازی. بەم کارە تێکۆشانی کوردەکانی عیراق بۆ ماوەیەک راوەستا و ناوەندی تێکۆشان بۆ ئێران گوێزرایەوە» پاشان لە بارەی سەفەری قازی محەممەدەوە بۆ باکۆ دەنووسێ: :» قازی دوای گەرانەوەی لە باکۆ دەستبە جێ لە گەڵ مەسەلەی مەلا مستەفا بەرەو روو بوو کە کاتی نەبوونی ئەو لە وڵات هاتبوە خاکی ئێران. لە هەوەڵین دانیشتنی چاو پێکەوتنی قازی محەممەد و مەلا مستەفا لە مەهاباد ئەو دوو پیاوە لە سەر پێویستی سەقامگرتویی بارزانی و هاو کاریی شەر کەرانی ئەم تایفەیە لە گەڵ هێزە چەکدارەکانی قازی محەممەد رێک کەوتن» (١٥)

با بزانین کاک مەسعود بارزانی لە بارەی هاتنی بارزانیەکان بۆ رۆژ هەلاتی کوردستان دەڵێ چی ؟

« لە سەر بنەمای پێوەندی لە گەڵ رێبەرانی بزووتنەوەی کوردی لە کوردستانی ئێران و بەر پرسەکانی شورەوی. بارزانی پاش موافقەتی شێخ ئەحمەد لە گەڵ هاورێیانی لە کومیتەی ئازادی بریاری دا روو بکاتە کوردستانی ئێران بە لە بەر چاو گرتنی هەل و مەرجی تازەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لە وێندەری و بە مەبەستی پاراستنی ئەو هێزە خاوەن ئەزموونە کە یارمەتی بە پتەو کردنی بارو دۆخی تازە دەکا لە کوردستانی ئێران. وەک لە بارزانیم بیستوە. راستەو خۆ پێوەندی لە گەڵ بەر پرسانی شورەوی گیراوە.چەند کەس لە باوەر پێکراوەکانی بۆ ئەو مەبەستە چوونە ئێران. هەر وەها هێندێ لە ئەفسەرانی شورەوی هاتوونە لای سەید عبدوڵا ئەفەندی گەیلانی و شێخ عوبیدولای زێبوێ بۆ دابینکردنی ئەم پێوەندییانە دەورێکی بەر چاویان هەبوە. ی.

پاشان کاک مەسعود دەنووسی: شۆرشی بارزان ١٩٤٥-١٩٤٣ بە هاتنی بارزانیەکان بۆ کوردستانی ئێران ١١/١٠/١٩٤٥ لە رێگای کێلە شین و مەرگەوەر(دالأمپەر)ەوە، شوێنێ سێ گوچکەی سنوری نێوان تورکیا و عیراق و ئێران. فرۆکەکانی عیراقی وبەریتانیش تا دوا نوختەی سنور وازیان لە بۆمباران و راونانیان نە هێنا. هاتنی بارزانیەکان بۆ ئێران لە لایەن براکانیانەوە بە گەرمی پێشوازیان لێکراو یارمەتی پێویستیان پێشکێش کرا. هەر وەها وەک لەم بەڵگەیەدا دەر دەکەوێ شەهید قازی محەممەد ئەمری بە رێکخراوەکانی حیزب کرد کە هەموو یارمەتیەکی پێویستیان پێشکێش بکرێ.*

---

*ئەم بەڵگەیە لە کتێبی کاک مەسعود بارزانیدا بلاو کراوەتەوە: (لێرە هێنراوەتە سەر رێنووسی کوردی تازە)

حیزبی دێموکراتی کوردستان. -- کومیتەی مەحەللی - لکی شنۆ

ئەرمایشی برای خۆشەویست ئاغای حوسێنی فرۆهر



دوای سەقامگرتوویی وەزع شورەویەکان داوایان لە بارزانی کرد کە لە بەر ئیعتیرازوگوشاری حکومەتگەلی عیراق و بەریتانیا ماوەیەک لە بەر چاوان خۆ بزر کا. بارزانی لە گەڵ هێندێ چەکدار چوە ناوچەی سەردەشت و تا ئاخری ساڵی ١٩٤٥ لە میراوێ دانیشت. بە بۆنەی راگەیاندنی هەوەڵین کۆماری کوردستان لە مەهاباد داوەت کرا کە لەم جێژنە مێژوویە دا بەشداری بکا.» (١٦)

٨١٧ -عەینی فەرمایشی برای خۆشەویست ئاغای حوسێنی فرۆهر بە تەواوی ئاغاپاتی دێهاتی شنۆ ئیبلاغ دەکرێ. پێویستە ئەمری موبارەکی حەزرەتی پێشەوای موعەزەم بە کەماڵی روو خۆشی ئەنجام بدرێ. سەدری کومیتەی مەحەللی شنۆ. قازی خزری.

رۆژنامەی کوردستانیش لە ژمارەکانی ٢١و٢٣و٢٦ی مانگی ١٢ی ١٣٢٤ دا بە درێژی ریپورتاژی رێو و رەسمی هاتنی سەرۆک بارزانی بۆ مەهاباد و پێشوازی لێکردنی لە مانگی رەشەمەی ١٣٢٤ دا بلاو کردۆتەوە.

حیزبی دێموکرات و حکومەتی میللی کوردستان بە گوێرەی تواناو دەرەتان لە هەموو بارێکەوە بە دڵێکی فراوانەوە بۆ یارمەتی برا بارزانیەکان و هەموو کوردەکانی ئەودیو کە هاتبوونە رۆژ هەڵاتی کوردستان هەنگاویان هاویشتوە. ئەم یەک دوو بەڵگانە گۆشەیەکی یارمەتی بەو برایانە نیشان دەدا:

« ژمارە ٢٥٤ - ٢٥/١/٧ - حزبی دێموکراتی کوردستان - مەهاباد - کومیتەی مەرکەزی

---

بەوەسیلەی سیمی ئەغەدە، جەنابی قازی سەدری کومیتەی شنۆ. لە سەر ئەمری رەئیسی جەمهوری کوردستان، بە تەواوی ئەو ئاغایانەی کە ماڵی بارزانیانیان لە کنە خەبەر بدەن کە نسبەت بەوانە لە هەموو بارێکەوە، تفاق، نان و... موساعەدەو کۆمەگیان بکەن و نەیەڵن ئەو چەند رۆژەی کە لە کن مە ماون ضیقەت ببینن. وە هەر ئاغایەکی خود داری کرد بە مەرکەزی بناسێنن. حوسێنی فرۆهر.

## کومیتەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عیراق

لە جوابی نوسراوەی ژمارە ۲ی برواری ۲۵/۱۱/۹ پێویستە لێمان مەعلوم بفەرمووتەوە ئەو برا بارزانیانە لە شنۆ عیدەیان چەندە و تا ئەورۆ لە لایەن ئەهالی شنۆ چەندیان گەنم وەرگرتوە هەر چی زووتر بنووسن تا ئیقدامی پێویست لە بارەیاندا ئەنجام بدرێت. کومیتەی مەرکەزی حیزبی دیموکراتی کوردستان.

ئەم دوو بەڵگەی خوارەوەش هەڵوێستی حیزب و حکومەتی کوردستان سەبارەت بە برایانی کوردستانی خواروو نیشان دەدەن نمرە ۱۸٤ - ۲٤/۱۱/۱۳

- حیزبی دیموکراتی کوردستان - مەهاباد

برای بەرێز و خوشەویستی نیشتمان ئاغای حمزە عبدالله.

هەروەڵ سەر بەرزیتان لە یەزدان داوا کارین‌و ئومێدمان هەیە لەوەی بەو لاوە لە بن سێبەری سەعادەتدا ژیانێکی ئەبەدیو بێ‌.نووسراوەی ئێوە گەیشت. زۆر پێ خوشحاڵ بووین. لە جوابیدا ئەوە عەینی فەرمایشاتی ریاسەتی موعەزەمی جەمهوری کوردستان لە ژێرەوە دەنووسرێتەوە؟

«دەورەی وەی تەواو بوو کە چیدی کورد موحاکەمەی غیابی بکرین و مەحکوم بن بە ئیعدام. وەختی وەی هاتوە کورد قەدەم هەڵبێنێ و دوژمنانی خویان موحاکەمەی حزووری بکەن. هومێدم هەیە دەست بدەینە دەستی یەگ زوورتر ئەوە عەمەلی بکری. - کومیتەی مەرکەزی حیزبی دیموکراتی کوردستان.»

ئەم نامەیەش دراوە بە ( سەعید محەمەد ) ناوێک. ( وا بزانم ماموستا هەمزە عەبدولایە.

«بۆ هەموو کومیتەو مە ئمورینی سەر رێگاو مەسئولینی حکومەتی میللی کوردستان.

بە وەسیلەی ئەم نووسراوە پێو رادەگەیەندرێت کە هەڵگری ئەم دەستورە ( سعید محمد)نار لە تەرەف دەوڵەتێرا مەجازە هەموو جێیەکی بە سەر بەستی بێت و بچێت. تکایە کە لە تەرەف هیچ کەسێکی را مضایەقە و موخالەفەتی هاتو

ئەم نامەیەش دراوە بە ( **سەعید محەمەد** ) ناوێک. ( وا بزانم مامۆستا **هەمزە عەبدوڵایە**.

«بۆ هەموو کومیتەو مه ئمورینی سەر ڕێگاو مەسئولینی حکومەتی میللی کوردستان.

بە وەسیلەی ئەم نووسراوە پێو ڕادەگەیەندرێت کە هەڵگری ئەم دەستورە ( **سعید محمد**)ناو لە تەرەف دەوڵەتیڕا مەجازە هەموو جێیەکی بە سەر بەستی بێت و بچێت. تکایە کە لە تەرەف هیچ کەسێکی را مضایەقە و موخالەفەتی هاتو چۆی وی بە هیچ جۆرێک نەکرێت. **وەهابی پلوریان**. **معاونی کومیتەی** مەرکەزی حیزبی دیموکراتی کوردستان.»

پەرە گرتنی بزووتنەوەی دیموکراتی وهاتنی بارزانیەکان بۆ کوردستانی ئێران حکومەتی تارانی تەنگە تاو کرد بوو. وەزارەتی دەرەوەی ئێران ڕۆژی ٢٦ی ابانی١٣٢٤ - ١٧ی نوامبری ١٩٤٥ ئەم یاد داشتەی خوارەوەی دا بە باڵیۆزی سۆڤێت لە تاران :

« ١ - هێندێ لە سەرۆکانی کوردی ئوستانی ئازەربایجان و مەهاباد بە هاندانی ئەو کەسانەی کە دژی تەواویەتی ئەرزی ئێرانن، دەستیان کردوە بە تێکۆشان و خەریکی کۆ کردنەوەی چەک و جبە خانەن و خۆیان بۆ ئەنجامدانی مەبەستەکەیان ئامادە دەکەن.

٢ - سەرۆکە کوردەکانی ناو براو بۆ بردنە پێشی ئامانجی خۆیان و ئاژاوە نانەوە لە ڕێگای چاپەمەنیەوە بیری کوردە ئاشتیخوازەکان دەشێوێنن و لە کوردستان ئاژاوە چیەتی پەرە پێدەدەن. بۆ ئەو مەبەستە ماشینی چاپ و کاغەزیان لە سۆڤێتەوە بۆ دێت.

٣ - چەند کەس لە سەرۆکانی کوردی مەهاباد بە بێ پاسپورت بۆ پێشبردنی کارو باری خۆیان دەچنە باکۆ و دەگەڕێنەوە.

٤ - بارزانی لە عیراق ڕایکردوە و هاتۆتە ئێران و لە کوردستان دانیشتوە. لە

بەر ئەوەی چەکدارن بێگومان دەیانەوێ لە گەڵ خەڵکی گێرە شێوێن نەزمی بەشی ڕۆژ ئاوای ئوستانی چوار و ناوچەی مەهاباد بشێوێنن.»

باڵیوز خانەی شورەوی لە تاران ٢٦ی نوامبری ١٩٤٥ بە ژمارەی ٦٢٥ بەم چەند دێرەی خوارەوە وەلامی یاد داشتی وەزارەتی دەرەوەی ئێرانی دابۆوە.:« مەسەلەی یارمەتی کار بە دەستانی شورەوی سەبارەت بە تێکۆشانی سیاسی کوردەکانی ئەم ناوچەیە بە تەواوی بێ بناخەو دوور لە راستیە. بە تایبەت کار بە دەستانی شورەوی لە گەڵ تێکشانی سیاسی کوردەکانی ئەم ناوچەیە هیچ پێوەندیکیان نیە. هاتنی مستەفا بارزانیش بۆ ئێران هیچ پێوەندیکی بە یەکیتی شورەوی یەوە نیە .»(١٧)

گزڤاری زاریا وەستۆک (ZARIYA VOCTOCK) چاپی تفلیس لە ژمارە ٢ی دیسامبری ١٩٤٥دا، لە ژێر سەر دێری « لە بارەی بار ودۆخی سەرووی ئێران» دەنووسێ:« وەک هەواڵدەرەکەمان روونی کردۆتەوە وەزارەتی دەرەوەی ئێران پێش چەند ڕۆژ یاد داشتێکی داوە بە باڵیوزی شورەوی لە تاران. لە یاد داشتەکەدا چەند دەستەی لە ڕێبەرانی عەشیرەتە کوردەکان وەبیر هێناوەتەوە کە بوونەتە هۆی ئاژاوە نانەوە لە کوردستانی ئێراندا.یاد داشتەکە لە سەر ئەوە پێدادەگرێ کە ئەو کەسانە لە پشتیوانی شورەوی کەلک وەر دەگرن و بە هاو کاری کاربەدەستانی شورەوی توانیویانە کەل و پەلی پێداویستیان لە ناوچەی سەروو بۆ ناوەند و ناوچەکانی خوارووی ئێران بگوێزنەوە. لە یاد داشتەکەدا لێ پرسراوانی شورەوی سەبارەت بەو چالاکیانە تاوانبار کراون و هەر وەها تاوانی ئەوەش خراوەتە ئەستۆی شورەوی کە پۆستی سنووری نێوان سنوری ئێران و تورکیا نەماون»

گزڤاری ناو براو دەنووسێ :« باڵیوز خانەی شورەوی لە وەلامی وەزارەتی دەرەوەی ئێراندا گوتوویە : بە شێوەی گشتی هیچ بەڵگەیەکی ئەساسی لە بارەی چالاکی ڕێبەرانی سیاسی و عەشیرەتە کوردەکان بەر چاو ناکەوێ. ڕووداوەکانی

ناوچەی سەرووی ئیران کە پێوەندی‌یان بە تێکۆشانی‌حیزبە سیاسییەکانەوە هەبە لە ژێر تەئسیری نێو خۆی ئیراندا روو دەدەن. نوێنەران و کار بەدەستانی نیزامی شورەوی بە هیچ جۆرێک دەستیان نە خستۆتەوە نێو کارو باری سیاسی و ژیانی نێو خۆی ناوچەکانی سەرووی ئیران. لە بەر ئەوە حکومەتی شورەوی بە جیددی تەقەلای ئیران بۆ ئەوە کە بەر پرسیەتی بخاتە سەر ئەستۆی شورەوی رەت دەکاتەوە. کار بەدەستانی نیزامی شورەوی بە هیچ جور دەستیان لەم روو داوانەدا نیە.»

## کۆنگرەی میللی ئازەربایجان

ئاور دانەوە لە رووداوەکانی ئەو دەمی ئازەربایجان با بە کورتیش بێ تا رادەیەک خوێنەرانی بە رێزی کورد لە سەر بردەی بە سەر هات و رووداوەکانی سالآنی ١٩٤٦-١٩٤٥ی ئەم ولآتە ئاگادار دەکات.بە تایبەت کە ئەم دوو بزوتنەوەیە - ئازەربایجان و کوردستان- پێوەندی راستەو خۆیان پێکەوە هەبوە و کاریان کردۆتە سەر گەشەکردن و سیس بوونی یەکتر.لە نووسراوەی نووسەرانی کوردیشدا کەمتر باسی روو داوەکانی ئازەربایجان کراوە. **دوکتور قاسملوو** لە چەند دێردا باسی ئازەربایجانی کردوە و بەلاٚم بە هەلە رۆژی دامەزرانی فیرقەی دیموکراتی بە ٣ی شهریور- ٢٥ی ئاوگوستی ١٩٤٥ ناو بردوە. لە کاتێکا وەک لە لاپەرەکانی پێشوودا باسکرا، فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان ١٢ی شهریوەر(خەرمانان)١٣٢٤ - ٣ی سێپتامبری ١٩٤٥ دامەزراوە.

فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان دوای دامەزران و بلاٚو کردنەوەی ١٢ مادەیی لە رۆژەکانی ٢٩-٣٠ مانگی خەزەلوەر-ابانی١٣٢٤( ٢٠ی نوامبری ١٩٤٥ لە سالۆنی شێرو خورشیدی تەورێز بە بەشداری ٧٠٠ نوێنەر کۆنگرەی میللی خۆی پێک هێنا و لە چوارەمین دانیشتنی خۆیدا ویست وداخوازەکانی‌خۆی بە تێکرایی

دەنگ پەسند کرد و لە بەیاننامەیەکدا بۆ ئاگاداری حکومەتی ناوەندی ئێران بڵاوی کردەوە(مەبەستەکان کورت کراونەوە.)

١ - خەڵکی ئازەربایجان خاوەنی میللیەت، زمان داب و رەسم و شتە تایبەتیەکانی خۆیەتی. ئەم تایبەتیان مافی ئەوەی دەداتێ کە بە لە بەر چاو گرتنی سەر بە خۆیی‌و تەواویەتی ئێران و بە گوێرەی بە یاننامەی ئاتلانتیک وەک تەواوی نەتەوەکانی جیهان بە ئازادی چارە نووسی خۆی دیاری بکات.

٢ - کۆنگرە بە لە بەر چاو گرتنی ئەوەی کە خەڵکی ئازەربایجان لە گەڵ ئەیالات و ویلایاتی دیکەی ئێران پێوەندی سیاسی، ئابوری و مەدەنی هەیە داخوازی رەوای بریتی‌یە لە خود موختاری‌میللی و رازی نیە ئەنجامی ئەم داخوازیانە لە سەر بناخەی زیانگەیاندن بە سنورەکانی ئێران‌ولەتیبوونی ئەو دابریژرێن.

٣ - خەڵکی ئازەربایجان لایەنگری دیموکراسیە.وەک تەواوی ئوستانەکان نوێنەر بۆ مەجلیسی شورای میللی دەنێرێ و لە دانی باجی عادلانەشدا بەشداری دەکات.

٤ - خەڵکی ئازەربایجان بە ئاشکرا رادەگەیەنێ کە وەک گشت میللەتی دنیا لە گەڵ پاراستنی سەر بە خۆیی و تەواویەتی ئێران بۆ بە رێوە بردنی کار وباری نێو خۆ مافی دامەزرانی حکومەتی میللی هەیە.

٥ - خەڵکی ئازەربایجان لە پێناو ئازادی و دیموکراسیدا قوربانی زۆری داوە، دەیەوێ لە سەر بناخەی دیموکراسی حکومەتی خود موختاری دابمەزرێنێ. دەیەوێ مەجلیسی میللی هەڵبژێرێ حکومەتی میللی و داخیلی خۆی لە نێو نوێنەرانی ئەو مەجلیسە هەڵبژێرێ.

٦ - خەڵکی ئازەربایجان لە ئیدارەی دەوڵەتی و لە هەموو مەدرەسەکان زمانی ئازربایجانی بە کار دێنێ.

٧ - کۆنگرەی میللی ئازەربایجان کە لە ..٧ نوێنەر پێک هاتوە خۆی بە

مەجلیسی مونەسسان دادەنێ و بۆ بەرێوە بردنی کارو باری نێو خۆی ئازەربایجان هەیئەتێکی میللی ٣٩ کەسی هەڵدەبژێرێ.»(١٨)

بۆ بەشداری لەم کۆنگرەیە بە قەولی(بلاو کراوەی دوازدەهەمی شهریور) کوردەکانیش‌داوەت کرابوون. لە رەوەندی کۆبوونەوەی کۆنگرەو لە وتاری نوێنەراندا نموونەی خوارەوەش باسی کورد کراوە:

« کوردەکان نوێنەرێکیان بۆ ئێمە ناردوە. بە داخەوە لە بەر بەفر و سەرما نەخۆش بوەو لە خەستە خانە کەوتوە. ئاغای نوبەری پەیامی کوردەکان بە کۆنگرە دەگەیەنێ.

ئاغای نوبەری: ئاغای حاجی مستەفای داودی لە لایەن کوردانەوە بە نوێنەر بۆ کۆنگرەی ئێمە ناردراوە. یەڵێن بە ئێمە دەدا کە هەر دەقیقەیەکی پێویست بێ و روو داوێک بۆ ئازەربایجان بێتە پێش، ئێمە بۆ یارمەتی ئامادەین.(چەپڵە لێدان)

لەم کاتەدا ئاغای داودی نوێنەری کوردەکان دێتە کۆ بوونەوە.(چەپڵە لێدان) ئاغای داودی داوای کرد کە بە زمانی خۆی قسان بکات. ئاغای پیشەوەری گوتی:« زۆرمان پێخۆشە، فەرموویە زمانی دایکیی خۆتان قسە بکە. داودی دەستی‌پێکرد.(چەپڵە لێدان)

ئاغای نوبەری: قسەکانی ئاغای داودی وەردەگێرم. لە پێشدا خۆ و هاورێکەی میرزا مەنافی کەریمی ناساند و لێی زیاد دەکاو دەڵێ:« ئێمە ئێرانین. رازی بە لەتبوونی ئێران نین. ئێمە لە ژێر گوشار و زوڵمی مەعمورەکانی دەوڵەتی ناچار بووین بۆ ئازادی میللەتمان فیرقەی دیموکراتی کوردستان و فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان پێک بێنین‌و ئەم دوو فیرقەیە بۆ هاوکاری هەمیشە هاو بیر دەبن.»

پاشان ئاغای پیشەوەری وەڵامی پیرۆز بایی خەڵکی کوردی داوەو گوتی :«کوردەکان خێزانێکن لە ئازەربایجان. ناتوانن دوو بەرەکیمان بخەنە نێو. سلاوی من بە ئاغای قازی محەمەد و خەڵکی کورد بگەیێنن.»(١٩)

به دوای تەواو بوونی کۆنگرە و هەڵبژاردنی مەجلیسی موئەسسان‌دا لە ئازەربایجان روو داوەکان خێرا دەچوونە پێش. لە هەموو شارو ناوچەکان دەست پێکرا بە چەکدار کردنی خەڵک و پێک هێنانی تەشکیلاتی فیدایی و دامەزرانی ئەرتەشی میللی هەر بە ناوی تەشکیلاتی فیدایی. بۆ پێکهێنانی مەجلیسی میللی - واتە پارلمان- هەڵبژاردنی گشتی دەستپێکرا.

ئێمە کارمان بە وردە کاری تێکۆشان و چالاکی فیرقە نەداوە. بەڵام بە چەشنی گشتی گەشت و گوزارێک بە نێو رووداوەکانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجاندا رەنگە بێ سود نەبێت.

رۆژی ١٢ی سەرماوەز(آذر)ی ١٣٢٤ - دوازدەی دیسامبری ١٩٤٥- مەجلیسی میللی ئازەربایجان دەستی بە کار کرد. دوای هەڵبژاردنی هەیئەتی رەئیسە ئاغای **شە بستەری** بە سەرۆکی پارلمان و ئاغای **پیشەوەری** بە سەرۆک وەزیر هەڵبژێر دران. پاشان سەرۆک وەزیر ئەندامانی حکومەتی میللی بە مەجلیس ناساند و پەرنامەی حکومەتی میللی لە ٢٠ مادەدا پێشکێش بە مەجلیس کرد.

بۆ ئێمە ناوی وەزیرەکانی حکومەتی میللی ئازەربایجان رەنگە زۆر پێویست نەبێ. بەڵام شارەزایی لە بەر نامەی حکومەتی میللی ئازەربایجان با بە کورتیش بێ دوور لە فایدە نیە. بۆیە کورتە و سەر خەتی مادەکانی بەرنامەی ناو براو بەم شێوەیە پێشکێش دەکرێت.

## بەرنامەی حکومەتی میللی ئازە ربایجان:

کابینەی میللی ئازەربایجان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئارەزووی دیرینەی خەڵکی ئازەربایجان کە هەر خود موختاری میللی‌یە و بۆ نەهێشتنی پێداویستی میللی خەڵکی ئازەربایجان و پاڵ پێوەنان بۆ رێگای پێشکەوتن و پێگەیشتن ئەم

ئەرکانەی خواردوە وەک ئامانجی نیزیک لە بەرنامەی خۆیدا دەگونجینیٚ:

١- دامەزراندنی دەوڵەتی میللی، زیان نەگەیاندن بە تەواویەت و سەر بە خۆیی ئیران، وتو ویژ لە گەڵ حکومەتی ئیران لە سەر ناکۆکیەکان.

٢ - هەڵبژاردنی ئەنجومە نگەلی ویلایەتی بە زوویی

٣ - دانانی ئەنجومەنی شار بۆ ئاوەدانی شار بە شیوەی دیموکراتی

٤ - هەڵبژاردنی کەسانی ئازادیخواز بۆ فەرماندارو بەخشدار و پیشگری لە کردەوەی زاڵمانە

٥ - پاک کردنەوەی ئیدارەکانی پۆلیس و ژاندارمەری

٦ - رێکخستنی سیاسەتی گشتی داهات وخەرج بۆ پیشکەوتنی وڵات

٧ - پیک هینانی قشونی میللی بۆ پاراستنی موختاریەتی میللی و مەجلیس ودەوڵەتی میللی

٨ - بە رەسمی کردنی زمانی میللی لە مەدرەسەکان، خوێندنی بە خۆرایی و بە ئیجباری، دانانی زانستگای میللی

٩ - گرنکی پیدان بە بازرگانی و ئابوری و سازکردنەوەی کارخانەکان و کرینی فابریکەی تازە

١٠ - چاک کردن و پەرە پیدانی پۆست و تیلگراف و تەلەفون

١١ - بۆ نەهیشتنی ناکۆکی نیوان ئاغاو رەعیەت بە مەرجی رازی بوونی هەر تک لایان، دانانی لایحەی قانونییو چارە سەر کردن و نە هیشتنی مەسەلەی ئەغاو رەعیەت .

١٢ - دابەشکردنی زەویەکانی خالیسەی دەوڵەتی و راکردوەکانی دژی حکومەتی میللی بە سەر وەرزیراندا.

١٣ - خەبات دژی بیکاری

١٤ - دانانی قانونی کارو بیمە

١٥ - دابینکردنی لەش ساخی و ناردنی دوکتور ودەرمان بۆ دیهات

١٦ - دەستکاری یاسای مەجلیسی شورای میللی بە جورێک لە گەڵ موختاریەتی میللی خەڵکی ئازەربایجان یەک بگرنەوە.

١٧ - پەسند کردنی خاوەن مڵکایەتی تایبەتی

١٨ رێز گرتن لە ئازادی مەرام و بیر وباوەر

١٩ - حکومەتی میللی ئازەربایجان تەواوی ئەو هاو نیشتمانانەی کە لە پەنا ئازەربایجانیەکاندا لە ئازەربایجان دەژین، بە تایبەت کوردەکان و ئەرمەنی و ئاسوریەکان و هیتر، لە بەرانبەر قانوندا وەک یەک حیساب دەکات

٢٠ - حکومەتی میللی ئازەربایجان حکومەتی ناوەندی بە رەسمی دەناسێ و بریارەکانی ئەو مادام لە گەڵ موختاریەتی ئازەربایجان و بریارەکانی حکومەتی میللی ناکۆکی نەبێ، ئەنجامیان دەدەین

ئەم بەرنامەیە بە تێکرایی دەنگ پەسند کرا.»(٢٠)

یادداشت کردنی ئەم چەند مەبەستە لە روو داوەکانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بۆ پێک گرتن لە گەڵ بەر نامەو مەرامنامەی حیزبی دیموکرات و کۆماری کوردستان و شارەزایی پتری خوێنەرانی بەرێزی کورد بە پێویست زانرا.

## گرتنی دلشادی رەسوڵی و زەبیحی و قاسمی قادری

لە سەرو بەندی دامەزرانی حیزبی دیموکرات و کۆنگرەی یەکەمدا دەنگ بلاو بۆوە کە سێ ئەندامی **کۆمەڵەی** ژ.ک، **دلشادی رەسوڵی و عبدالرحمن زەبیحی و قاسمی قادری** لە رێگای ورمێ گیراون. هیچ راگەیاندنێکی رەسمی لە لایەن دازگای رێبەرایەتی حیزب لەم بارەوە بلاو نەکرابەوە. تەنیا رۆژنامەی کوردستان پاش چەند مانگ لە ژمارە ٢٦ی رۆژی دووشەمۆی ٢٧ی رەشەمەی ١٣٢٤ -١٨ی مارسی ١٩٤٦ شیعرێکی هەژاری بە بۆنەی هاتنەوەی **(زەبیحی و دلشاد و قادری)** بلاو کردۆتەوە. وادیارە دەبێ زووتر ئازاد کرا بن. چونکە لە ژمارە ١٩ و ٢٠ی کوردستاندا، وەرگێراوەیەکی **زەبیحی** چاپکراوە.

بەلاّم با بزانین سەر لەشکر زەنگەنە لە بارەی گرتنی ئەم سێ کەسە چی دەنووسی:

« لە سەرەتای مانگی ئەبان(خەزەلوەر)ی ١٣٢٤خەبەر بە تیپی رەزائیەو هەنگی ژاندارمەری گەیشت کە هەیئەتێکی تەبلیغاتی لە لایەن کۆمەڵەی مەهاباد و قازی محەممەدەوە بەرەو رەزائیە دێن تا لە گەڵ سەرۆک عەشیرەتانی ناوچەی ورمێ وتو وێژ بکەن و ئەوانیش بۆ سەربزێوی هان بدەن. دەگوترا کە هێندێ بەڵگەو دوکومێنتیان پێیەو قەرارە بچنە گوندی کۆکیا ماڵی زێرۆ بەهادورێ و لە وێ چاویان بە سەرۆکانی‌کوردی رەزائیە بکەوێ.

بۆ دەست پێڕاگەیشتنی بەڵگەو دوکومێنتی ناو براو، بەر لەوەی بگەنە ماڵی زێرۆ هێندێ ژاندارمە لە مێشەکانی خواروی گوندی بالانیش لە سەر ڕێگای مەهاباد داتران کە ئەم هەیئەتە بگرن. کاتێ ماشینی هەیئەتی ناو براو دەردەکەوێ ژاندارم دەنگیان دەدەن کە راوەستن. شۆفیر گوێ ناداتێ و لە نێو ماشێنەوە تەقە لە ژاندارمە دەکەن. ژاندارمە گەمارۆیان دەدەن و ئەوانیش تەسلیم دەبن. جگە لە دوو تفەنگچی سێ کەس لە تەبلیغاتچیەکانی حیزبی کۆمەڵەی مەهاباد بەم ناوانە (عبدالرحمن زبیحی، دلشاد رسولی و قاسم قادری) لە ماشێندا دەبن.لە نێو جانتای ئەوانەدا ٨ نامە کەوتنە دەست بە زمانی کوردی‌نووسرا بوون و دەبوایە لە ڕێگانی کونسولی شورەوی لە ورمێ لە نێوان قازی محەممەد و میر جەعفەر باقرۆف سەر کۆماری ئازەربایجانی شورەوی ئالو گۆر کرا بان.

لە یەکێ لەو نامانەدا کە کرا بە کوردی، قازی محەممەد ئاماژەی بۆ سەفەری باکۆ و چاو پێکەوتنی رێبەرانی شورەوی و وتو وێژی دۆستانە لە گەڵیان کرد بوو داخی خۆی لە بەجێ نەگەیاندنی ئەم وادە و بەڵێنانە دەر بڕیبوو کە پێ درا بوون. نێوەرۆکی نامەکانی دیکە بریتی بوون لە داوای چەک و قورخانە بۆ راپەڕینی کوردان دژی دەوڵەتی ناوەندی ئێران و تەکمیل کردنی دەستگای رادیۆ و ناردنی کاغەز بۆ رۆژنامەو تەبلیغات و ساز کردنی چاپخانە و شتی تر.

گیراوەکان دەستبەجێ بۆ تاران بەرێکران و نامەکانیش بە نیستیوارێکدا کە جلکی شرانی کرد بوو بەر بۆ تاران ناردران و دران بە ستادی ئەرتەش. ئەو بەڵگانە پاشان لە شورای ئەمنیەتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بە قازانجی ئێران کەلکیان لێ وەرگیرا. (٢١)

## کوردستان دوای دامەزرانی حیزبی دیموکرات

وەک لە پێشدا باسکرا لە باکۆ بەڵێنی‌چاپخانەو چەک و تەقەمەنی بە نوێنەرانی کورد درا بوو.لە مانگی نوامبردا بۆ هەوەڵین هەنگاو ماشینی چاپ کە یەکێ لە پێداویستە گرنگەکانی کوردستان بوو گەیشتە مەهاباد و دەست کرا بە چاپ و بلاو کردنەوەی گۆڤار و رۆژنامە و کتێب‌و... دەبێ ژمارە یەکی‌گۆڤاری کوردستان « بلاو کەرەوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان» کە لە ١٥ی سەرما وەزی ١٣٢٤ - ٦ی دیسامبری ١٩٤٥ دەر چوە هەوەڵین بەرهەمی ئەو چاپخانەیە بوو بێت. بە دوای ئەوەدا حیزب بۆ دامەزرانی هێزی بەرگری هەنگاوی هاویشت و بناخەی هێزی بەرگری ناوەندی لە پێشمەرگەی داو تەڵەب دامەزراند.

فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان رۆژی ٢١ی سەرماوەز-١٢ی دیسامبری ١٩٤٥ حکومەتی میللی راگەیاند و بە گوێرەی نووسینی خۆیان(کوردەکانیش) نەک حیزبی دیموکرات بۆ بەشداری لەم ئاهەنگەدا داوەت کرابوون. بەلام لە کۆنگرەدا نوێنەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە بریتی بوون لە:« حەمە حوسێنخانی سەیفی قازی ، حاجی مستەفای داودی، مەنافی کەریمی، کەریمی ئەحمەدەین و وەهابی بلوریان» هەر وەک کوردی دانیشتووی ئازەربایجان چاو لێکران و نە لە وتاری بەشدار بوانی کۆنگرە و نە لە بەیاننامەی رەسمی حکومەتی میللی‌دا، ناوی بزوتنەوەی کورد و حیزبی

دیموکراتی کوردستان نه هاته کوڕێ. تەنیا لە مادە ١٩ی بەرنامەی حکومەت دا، مافی کورد و ئەرمەن و ئاسوری) دانیشتوانی ئازربایجان وەک یەک لە بەر چاو دەگیرێ.

« لە دوازدەی دیسامبر مەجلیسی میللی گۆماری خود موختاری ئازەربایجان بە بەشداری پێنج نوێنەری کورد لە تەورێز پێک هات. زۆر زوو بۆ ئەندامانی کورد روون بۆوە کە ڕێژیمی ئازە ربایجان دەیەوێ هەموو جورە توانا و دەسەلات لە کوردەکان داگیر بکات. کوردەکان کە وایان بینی، گەڕانەوە بۆ مەهاباد. ڕۆژی ١٧ی دیسامبر خەڵکی مەهاباد ئالای میللی ئێرانیان لە سەر بانی عەدلیە هێنا خوار وئالای کوردستانیان لە جێگای ئەو بەرز کردەوە .»(٢٢)

ئیگلتون لە بارەی هەڵکردنی ئالای کوردستانەوە دەنووسێ:« قازی محەممەد دەستەیەکی نوێنەرایەتی بە نێوی نوێنەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بۆ بەشداری لە مەجلیسی میللی ئازەربایجاندا ناردە تەورێز. لە تەورێز ئەوانیان وەک نوێنەرانی کوردستان وەر نەگرت. بەڵکو وەک نوێنەرانی بەشێکی ئازەربایجان خاوەنی مافی بەرابەر لە گەڵ بەشدارانی کۆ بوونەوە. ئەوان زوو تێگەیشتن کە لە ژێر دەسەلاتی هێزێکی تازەدا دەتوانن تەنیا شورایەکی شاریان هەبێ ئەویش زۆر کەم دەسەلاتتر لە مەجلیسی میللی ئازەربایجان . پاش سێ جار بەشداری لە کۆبوونەوەدا گەڕانەوە بۆ مەهاباد و نارەزایی و دڵگیری خۆیان لەم بارەوە ڕاگەیاند.

قازی تا ئەو کاتە لە بەرانبەر ڕاوێژ کەرانی رووسیدا کە رای کۆمەگی ئەوان بۆ دوا ڕۆژی کوردستان پێویست بوو، زۆر لە سەر هەست دەجوڵایەوە. هەر ئێمرۆ وسبەی دەکرد. بەڵام ڕۆژی ١٧ی دیسامبر هەست بە سەر دوا ڕۆژ بینی و خۆ ڕاگریدا سەر کەوت. کۆ بوونەوەی ئەندامانی حیزب بوو بە خۆ پێشاندان لە بەرانبەر ئیدارەی عەدلیەدا کە ئاخرین نیشانەی دەسەلاتی دەوڵەتی تاران بوو لە مەهاباد. خەڵک داوای دەکرد کە ئەم ئیدارەیە ئاگر تێ بەر دەن، بەڵام چونکە ئەرم

کێشەکان بە سەر بارو دۆخدا زاڵ بوون، ئەم کارە نەکرا. تەقو تۆقێکی زۆر بەرەو عاسمان کراو ئاڵای کوردستان لە سەر ئەم ئیدارەیە بەرز کرایەوە..»(٢٣)

بە رای من بریاری پێک هێنانی هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستان و هەڵکردنی ئاڵا گرنگترین و بە جێترین هەنگاوی شۆرشگێرانە بوو کە لە لایەن حیزبی دێموکراتی کوردستانەوە داوێژرا. چونکە کارەکانی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان وەک شو لێ هەڵکێشانێک دەچون کە دەیویست دەسەلاتی خۆی نیشانبدات. وا دەهاتە بەر چاو کە ئازەربایجان لە بۆ چوونی سەرانی فیرقەی دێموکرات دا، هەر ئەو ئازەربایجانی حکومەتی رەزا شاو کوردستان و کوردەکانیش بەشێکن لە خاک و رەعیەتی ئازەربایجان.

فیرقە لە دامەزراندنی تەشکیلاتی فیدابیدا بێ ئەوەی لە بارەی ئیدارە کردنی دوو شاری ورمێ و میاندواو کە نیشتگەی هاو بەشی دوو نەتەوەی کورد و تورک بوون لە گەڵ حیزبی دێموکراتی کوردستان پرس و راوێژ بکات، فەرماندەی دەستەی فیدایی بۆ ئەو دوو شارانە دیاریکرد بوو. ئاغای ئازاد وەتەن بۆ فەرماندەی ورمێ و ئاغای سەرهەنگ قوڵی سویحیش بۆ فەرماندەی میاندواو.

رۆژی ٢٣ی سەرما وەز لەشکری تەوریز تەسلیم بوو. فیرقە لە شارەکانی دیکەش دەسەلاتی نیزامی خۆی سەپاند. جا لە بارو دۆخێکی ئاوادا گوێ راگرتن بۆ فەرمایشتەکانی باغرۆف و راوێژ کەرانی تری رووسی کە رەگێکی ئازەربایجانچیەتیان لە لەشیدا دەجولا، دەبوە کارێکی نهێلیستی و خۆ گێل کردن لە پێشهاتی ئاوادا کاری شۆرشگێری نەبوو. بێگومان بریاری ئازایانەی پێشەوا بۆ ئەنجامی ئەم هەنگاوانە، واتە(داتانی هەیئەتی رەئیسەی میللی و هەڵکردنی ئاڵای پیرۆزی کوردستان) دەوری بنچینەییان هەبوە.

هەر چەند زۆر لە نووسەرانی کورد و بێگانەش لە سەر هەڵکردنی ئاڵای کوردستان نووسیویانە، بەلام سەبارەت بە گرنگی ئەم روو داوەیە کە لە مێژووی خەباتی گەلی کوردا هەوڵجار بوە رێو ورەسمێکی ئاوا بە رێوە دەچوو، دوو پاتە

کردنەوەی نووسراوەکان لام وانیە چ زیانیان هەبێ. **کاک نوشیروان** لە «حکومەتی کوردستان - کورد لە گەمەی سۆڤیەتی‌دا» بە درێژی نووسراوەی گۆڤاری کوردستانی لە بارەی هەڵکردنی ئاڵا لە مەهاباد و نەغەدەو بۆ کان هێناوەتەوە. بەڵام هەڵەیەکی لە نووسینی **کاک نوشیرواندا** بۆ راستکردنەوە دەبێ ئەوەیە کە دەنووسێ:« رۆژی ۲٦ی سەرماوەز خەڵک بە هاندانی هەندێ لە سەر کردەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستان هەڵیان کوتایە سەر «شارەوانی مەهاباد» کە دوایین نیشانەی دەسەلاتی تاران بوو، پاش تەقو تۆقێکی کەم گرتیان:» (۲٤)

لە کاتێکا هەر وەک لە لاپەرەکانی بەراییدا روونکراوەتەوە شارەوانی مەهاباد مانگی مای ۱۹٤۳ دوای وتاری **عەزیز خانی کرمانج** لە لایەن خەڵکەوە پەلامار درا و ۷ پاسەوان کوژران و هێندێکیش خۆیان شاردەوەو **عەولای مینە خالْندیش** شەهید بوو. ۲٦ی سەرماوەز شارەوانی مەهاباد دەمێک بوو لەژێر دەسەلاتی خەڵک دا بوو، **ئاغا سەید پیرەی** رەحمەتیش سەرۆکی شارەوانی بوو. هیچ مەعلوم نیە حیزبی دێموکرات بۆ چی و لە سەر چ بنەمایەک ساڵی ۱۳٦۳ رۆژی ۲٦ی سەرماوەزی ۱۳۲٤ واتە ۱۷ی دیسامبری ۱۹٤٥ - رۆژی هەڵکردنی ئاڵای کوردستانی کردۆتە رۆژی گرتنی شارەوانی مەهاباد بە رۆژی پێشمەرگەی ناو ناوە.؟

وەک دەبینین لە گۆڤاری کوردستانیش‌دا کە باسی هەڵکردنی ئاڵای کردوە، هیچ باسی پەلامار دانی شارەوانی ناکا. **کاک نوشیروان** لە باسی ئاڵا هەڵکردندا لە نەغەدە وتاری شەهید **محەمەد مەحمودی** هێناوەتەوە سەبارەت بەمە کە لە نێو هەموو ئەو کەسانەی بەم بۆنەو بە بۆنەی ئاهەنگەکانی دیکەدا وتاریان داوە، جگە لە کاپیتان قادری کە ناوی سەپان و زەحمەتکێشان دێنێ، شەهید قودسی تاقە کەس بوە رووی کردۆتە زەحمەتکێشانی کوردستان و ناوی « کرێکار و فەلاح و سەپان و پاڵەی» کوردی هێناوە، دەقی وتارەکەی بڵاو دەکەمەوە:

« گەورەکانم! ئەی گەلی بە شەرەف! خۆشە ویستان‌و راوەستاوان!

ئەی کرێکار و فەلاح و سەپان و پالەی کوردی بە نرخ!

رۆژها بە سەر شۆرشی میللی پیرۆزی کورد دا هەلات و تیری دوژمن کەللەو سنگی بەچکە شێرانی کوردی پێکا و خاکی کوردستان لاشەی جەوانانی گرتە باوەش. چیاو دۆڵ و دەشتەکانی کوردستان پڕە لە گۆرستانی دلێران و نەبەزانی‌کورد کە لە پێناوی رێگای ئازادی‌دا،لە پێناوی هەڵکردنی ئالای مقدسی کوردا گیانی پاکیان لە لاشەیان جیاواز بووە.

ئەی برای کورد! شۆرشەکانی دیار بەکر، دەرسیم، سلیمانی، ئامیدی، بارزان هەموو نیشانەی ئەو جوانمەر دییە کە بۆ ئازادی کراوە. ئەمرۆ، ئەمرۆ کە گەورە ترین وپیرۆز ترین رۆژە بۆ کورد، ئەبینن هەڵۆی بە هێزی کورد بە چنگی ئاسنینی خۆی ئەو ئالا پیرۆزە هەڵدەکا. بەڵێ ئەو ئالایە هەڵ ئەکات کە لە سەرە تای مێژووە کورد خۆی بۆ بەخت کردوە.

برایان! پیرۆز بایی خۆم پێشکەشی هەموو کوردێک‌و هەموو میللەتێکی ئازادیخواە دەکەم.

ئەی برای کورد! ئەزانی ئالای خۆشەویست چە ئامۆژگاریەکت دەکا؟ ئەڵێ بۆ کۆبوونەوەیەکی بێ جیاوازی گەورەو پچوک، ئاغاو کرێکار، قوتابی و شوان و فەلاح‌و ژن و پیلو، منداڵ و کچ، هەموو پێکەوە بە یەکدڵ بۆ یەک ئامانج تێ ئەکۆشن. هەوڵ دەدەن. دیسان دەڵێ:

رەنگی سوورم نیشانەی جەنگاوەری ونەبەزی گەلی کوردە.

رەنی سپیم دەڵێ میللەتی کوردی نەجیب گیانێکی پاک و راستی هەیە.

رەنگی سەوزم هاوار دەکا خاکی کوردستان پڕە لە دەغڵ و دان، کانگای زێرو زێو،ئەی کورد هەموو بە گیانێکی خاوێنەوە، بیرەوەریەکی پاک و راستەوە هەموو پێکەوە کەلک لە کوردستانەکەتان وەر گرن.

دیسان دەڵێ:

ئەی فەلاح، ئەی کرێکار و پاڵەی کورد، دڵت لە خۆت نەمێنێ لە سەر نیشانەی پاکی و راستی نیشانەی تەقەلاو هەولی دەسی تۆ ئەو دوو گوڵە گەنم و جزیە هەمیشە بە پێش چاوتەوە بە پێت ئەڵێت هەوڵ بدە، ئیش بکەو وڵاتت بڵێند بکەوە.

ئەی کورد دیسان ئالاکەت ئەڵێ‌و ئەمرت پێ ئەکات سەر کەوتنت و گەورەییت لە خوێندنایە، ژن و پیاو، کور و کچ بە جارێ بخوێنن چونکی خوێندن هەموو میوەیەکی خۆشی و زیندەگانی پێوەیە. کردگاریش تیشکی رۆژی خۆی بە سەر هەموو صفاتی جوانی ئینسانی‌دا بڵاو ئەکاتەوەو جوانتری ئەکا.

ئەی کورد ئێمەش بەرانبەر بە ئامۆژگاریەکانی ئەڵێین:

ئەی ئالا پەیمانت ئەدەینێ، هەموو پێکەوە بە یەکدڵ بە تەنێکی ئاسنینەوە هەوڵ بدەین ببینە سپەرت. راست بین. ئیش بکەین. بخوێنین.

ئەی کورد ئالا رەمزماتە لە دوای هەڵکردنی نرخی هێنانە خوارەوەی قوربانی کردنی هەموو میللەتی کوردە. ئیتر بژی کورد و کوردستان

بژی پێشەوای یەکێتی جەماهیری شورەوی سوسیالیستی مارشال ستالینی مەزن.

بژی هەموو میللەتێکی ئازادیخواە.»(٢٧)

دوکتور قاسملوی شەهیدیش لە بارەی ئالای کوردستانەوە دەنووسێ:« ئالای کوردستان سێ رەنگ بوو. رەنگی سوور لە سەرەوە، رەنگی سپی لە نێوە راست و رەنگی کەسک لە خوارەوە. ئارمی کوردستان لە نێوە راستێ ئالاکە دابوو بریتی بوو لە قەڵەمێک لە نێوان دوو گوڵە گەنم. قەڵەم بایەخدانی حیزبی دێموکرات و کۆماری کوردستان بە فەرهەنگ و زانستی دەنواند و گوڵە گەنیش نیشانەی بەرهەم و کار بوو. هەتاویش لە لای سەرەوەی ئارمەکە هەڵاتبوو کە سەمبولی ئازادی بوو ئەوەندەیە کە دوکتور قاسملو تووشی ئەم هەڵەیە بووە کە هەڵکردنی ئالای کوردستان دەخاتە رۆژی دووی رێبەندان لە کاتێکا ئالای

کوردستان ١٧ی مانگی دیسامبر هەڵکراوە. »(٢٨)

**کریس کۆچرا** دەنووسێ:«.... لە ١٧ی دیسامبری ١٩٤٥ لە شاری مەهاباد ئاهەنگێک دەگێردریت و خۆ پێشاندانێک بەرەو ئیدارەی داد گوستەری کە هەوەڵین و ئاخرین نیشانەی قودرەتی دەوڵەتی ناوەندی لە مەهاباد بوو بەرێوە دەبردرێ. ئاڵای سێ رەنگی کوردستان کە بریتی بوو لە رەنگی سوور و سپی و سەوزو وێنەی رۆژێک لە نێوان دوو شمشێردا کێشرا بوو لە لوتکەی خانوەکانی دەوڵەتی لە شاری مەهاباد، شنۆ، نەغەدە هەڵدەکرێ و دەلەرێتەوە . »(٢٧)

**بەهمەنی خاکبازیش** باسی هەڵکردنی ئاڵای کوردستانی کردووە و هەر ئەم هەڵەیەی **دوکتور قاسملوی** دوو پات کردۆتەوە کە دەڵێ« ئاڵای کوردستان رۆژی دووی رێبەندان هەڵکراوە.» یا دوکتور قاسملو نووسراوەکەی بەهمەنی خاکبازی وەر گرتوە بێ ئەوەی ئاماژەی بۆ بکات. نووسینەکەی بەهمەنی خاکباز راست هەر نووسراوەکەی دوکتور قاسملوە: « هەر لەو رۆژەدا ئاڵای کوردستان کە بریتی بوو لە سێ رەنگ، رەنگی سوور لە سەرەوە، سپی لە نێوە راست و سەوز لە خوارەوە. ئارمی کۆماری کوردستان لە نێوە راستی ئاڵا، قەڵەمێک لە نێوە راستی ئارم و گوڵە گەنم کە قەڵەم نیشانەی فەرهەنگ و زانست و گوڵە گەنم نیشانەی بەرهەم و کار و لە سەرەوە هەتاو کە نیشانەی ئازادی بوو هەڵکرا.» (٢٨)

**مامۆستا عەلائەددین سجادی** رەحمەتی لە بارەی ئاڵای کوردستانەوە دەنووسێ:« لە رۆژی ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٤٥دا بەیداخی حکومەتی تاران لە سەر دایرەکان هێنرایە خوارەوە لە ناو چەپڵە رێزانی مەردما بەیداخی کوردستان-ی لە شوێن دانرا و ئاڵای کوردستانی پیرۆز هەڵکرا. دروشمی ئاڵاکەش بەم جۆرە بوو:

سەرەتا پارچەیەکی سوور، پاش ئەو سپی کە بە ئەندازەی چوار ئەوەندەی سوورەکە، پاش ئەو سەوز بە ئەندازەی بەشێ لە چوار بەشی سپیەکە. لە ناوە راستی پارچە سپیەکەدا نیو کورە رۆژێک بە سەر رۆژەکەوە قەڵەمێک، لەم لاو

لای رۆژهەڵاتەوە دوو گوڵە گەنم بە رەنگی زەرد. لە سەراووردی هەموانەوە بە شکڵی چەمبەر نووسرا بوو:« دەوڵەتی جەمهوری کوردستان»(٢٩)

گرنگی زیاتری هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لەوەدایە کە برا کوردەکانی هەموو بەشەکانی کوردستانی دابەشکراو لە دانانی نەخشەی ئاڵاکەدا بەشداریان کرد بوو. لە راستیدا ئاڵای کۆماری کوردستان لە مەهاباد ئاڵای کورد و کوردستان و سەمبولیکی نەتەوەی کورد بوو کە لە مێژووی خەباتی دوور و درێژی نەتەوەی کوردا ئاوا بە رەسمی و بە بەشداری کوردی هەموو بەشەکانی کوردستان هەڵدەکرا.

« بە نیشانەی ئارمی میللی لە مانگی مای ساڵی ١٩٤٤ کۆمەڵەی ژ.ک لە گەڵ هاوپەیمانانی عیراقی ئاڵایەکی سێ رەنگیان بۆ کوردستان ساز کرد. رەنگی سەرەوەی سوور، نێوە راست سپی و خوارەوەی سەوز. واتە بۆ ساز کردنی ئەم ئاڵایە کام رنگای هاسانتر هەبوو کە ئاڵای ئێران سەرەو ژێر بکەن؟ بۆ نیشانەی میللی کوردەکان کورەی رۆژ لە نێوە راست کێشرا بوو. دوو گوڵە گەنم دەوریان گرتبوو. چیایەک و تەڵەمێکیش لە سەر ئاڵا دەبینرا.»(٣٠)

بەبۆنەی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان شاعیرانی کورد شیعری جۆر بە جۆریان هۆندۆتەوە و شادیان لە دڵی خەڵکدا بڵاو کردۆتەوە. مامۆستا هەژاری شاعیر لە پارچە شیعرێکدا دەڵێ:

« بێ ببینێ ئەو کەسەی پێی وا بوو کورد سەر ناکەوێ
کێ بوو پێی وا بوو تەمی نیکبەت لە سەرمان نارەوێ
« داری ئاڵاکەم وەکو چقڵە لە بۆ چاوی عەدو
هەر دڵێ خۆشی نەوێ، رەبی وەبەر خەنجەر کەوێ
پارچەکەی سێ رەنگی خۆی دەنوێنێ رەنگی سور دەڵێ
تا تنۆکێک خوێنی کورد مابێ دەبێ هەر سەر کەوێ
سپیەکەی مزدەی بەیانی بەختی کوردی کرد بەیان
رۆژی بەختی کوردی پەیدا بوو نەما پەردەی شەوێ

ڕەنگی سەوزی یانی دایکی نیشتمان لەو ڕۆکەوە
جوان و سەر سەوزە وەگیری کەوتەوە عومری نوێ
دوو گوڵی گەنمێ دەڵێ ئاگات لە ڕزقی خۆت بێ
خۆت کە برسی بۆ چی دوژمن پێی بڕۆی لێر و لەوێ
پێو دەڵێ نوکی قەڵەم گەر ژینی خۆشوو پێ دەوێ
غەیری من دەست ناکەوێ بۆ ڕێی تەرەقی پێ‌ڕەوێ
لاوەکان ناموسی نۆ میلیونە ئەو ئاڵایەمان
گیان بدەن بۆ حیفزی ئەو ناموسەتان لە منو کەوێ
ڕێی نەجاتمانە پەنا بۆ ئیتیحادی شورەوی
سورمەیە بۆ چاوی ئێمە خاک و خۆڵی مەسکەوێ
ڕەبی هەر کەس دوژمنی ئەو میللەتە خوێن پاکەیە
ژێو کەوی، کۆستی کەوێ، ڕەبی سەعاتێک نەسرەوێ (٣١)

شاعیری میللی کورد ماموستا هێمن بە بۆنەی هەڵکردنی ئاڵاوە ئەم شیعرەی خوارەوەی هۆندۆتەوە:

« پەرچەمی سوور و سپی و سەوزی ئەمە
شادی هێنە لاپەری دەرد و خەمە
سوورەکەی یانی ئەوی بێتە بنم
خوێنی خۆی بڕێژێ بۆ پاراستنم
سپیەکەی یانی کەسێکە ڕوو سپی
هیچ شتێک نەیکرد بێ مات و کپی
سەوزەکەی دێنێتە بەر چاوان وڵات
ئەو دەمەی فەسڵی بەهاری جوانی هات
تیشکی ڕۆژی کورد لە ژێر هەوری سیاهاتە دەر ئەنگاوتی وا
لوتکەی چیا

دوو گوڵی گەنمیشی یانی کشت و کاڵ
زۆر بکەن مشتی بکەن عەمبار و چاڵ
پێو دەڵێ باران قەڵەم، نوکی قەڵەم
زۆر لە شیر چاتر دەپارێزێ عەلەم»

**کاک عومەری فاروقی** لە باسی هەڵکردنی ئاڵای کوردستاندا دەنووسێ:« لە ١٧ی دیسامبری ساڵی ١٩٤٥ ئاڵای کۆماری کوردستان لە نێو شادی و هورای خەڵک لە سەر خانووی شارداری بەرز کرایەوە. لەو کاتەدا نووسەران و شاعیرانی کورد لە هەموو لایەکەوە روویان کرد بوە مەهاباد و لەم پێتەختە پچوک و جوانەدا کۆ ببوونەوە. **قانیع** شاعیری گەورە و شۆرشگێری کورد لە شیعرێکی جواندا لە گەڵ ئاڵای کوردستان دەدوێ و دەڵێ:« ئەی ئاڵای بەرز و سێ رەنگ! سووری تۆ نیشانەی شەهیدانە، سەوزی تۆ نیشانەی دەخڵو دانە، سپیەکەت نیشانەی ئاشتیخوازیە. رۆژەکەت روونکەرەوەی رێگای نەجاتە و گەنمەکەت یانی پشت بەستنە بە هێزی زەحمەتکێشان و قەڵەمەکەت بە مانا وەدەست هێنانی زانست و زانیاریە. هەر بلەرەوەو بمێنە ئەی ئاڵای کوردستان ئەبەدی بە تا دنیا سوردەخوا.»(٣٢)

دەقی شیعرەکەی **قانیع** لە سەر ئاڵای کوردستان بەمجورەیە:

« ئەی ئاڵای بەرزی سێ رەنگی جوان
هەر شەکاوە بیت تا ئاخر زەمان
سووریت نیشانەی شەهیدانمانە
سەوزیت نیشانەی دەخڵ و دانمانە
سپیت نیشانەی ئاشتی وڵاتە
رۆژت رووناکی رێگای نەجاتە
گەنمت یانی های! کوردە بزانە
نانی خۆت مەنێ دەستی بێگانە

قەڵەمت ماناى تا ڕۆژى مردن
تێکۆشی لە ڕێی زانین و خوێندن
ئاسەر هەر بۆی ئاڵای کوردستان
هەر پایەدار بێ تا چەرخی دەوران» (۳۳)

لەم شایی و لۆغانەی هەڵکردنی ئاڵآی کوردستاندا سروودێکی نیشتمانی لە دانانی شاعیری بەرزی کورد ماموستا هەژاری ڕەحمەتی بلاو کرایەوە. ئیگلتون دوو کۆپلەی لەم سروودەوە هێناوەتەوەو دەنووسێ: « شیعری هەوەڵی ئەم سرودە هەر وەک چاوە ڕوان دەکرا تاریف و پەسن و ڕێزێکی زۆری بۆ نیشتمان و بۆ پێشەوا قازی محەمەدی تێدا بوو. بەڵام شیعری دوایی جێگای بیر و لێ ورد بوونەوە بوو. ڕادەی مەقامخوازی و پەرهاویشتنی حکومەت و هەڵسوڕێنەرانی بە جوانی نیشان دادا.» (۳٤)

ئەمەش دەقی سرودەکەیە کە لە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ١٤-ساڵ یێکەم-٢٤ ڕێبەندان ١٣٢٤ -١٣ فیوریە ١٩٤٦ وەر گیراوە :

« نیشتمانم ڕەنگینە - بەهەشتی سەر زەمینە
خاکم وەکو ئاڵاکەم - ڕەنگ سوور و سپی و شینە
ڕەنگی سووری گوڵاڵان - بۆنی سوێسن و هەڵاڵان
کەویە بەفری لە تراڵان - سەر چاوەی ئاوی ژینە
لە سایەی پێشەوادا زۆربە ئازاوبە مەردی- دەیپارێزن ئەم خاکە بێچوە شێرانی کوردی
هارەی ئاوی هەڵدێران - فێنک و شنەکەی زەنوێران
ئاونگی سەر وەنەوشەی - دەرمانی بنەو برێران
سەر پاکی زەوی و ئاوە - گەنم کزڵەکەی داوە
هەتاویان بۆی نەماوە - ترک و عارەب و ئێران
لە سایەی پێشەوادا زۆربە ئازاو بەمەردی-دەیپارێزن ئەم

خاكە بێچوە شێرانی كوردی

ئەوتم تاری ژیانە - لە سیرت و كرماشانە

بابە گور گور دەزانێ - لە موسلیشدا هەمانە

كانگام هەیە لە زاخۆ - هەر وەك نەرتەكەی شنۆ

بۆ دوژمنان بۆتە سۆ - هەر خۆشبێ ئەو زەمانە

لەسایەی پێشەوادا زۆر بەئازاو بەمەردی-دەیپارێزن ئەم

خاكە بێچوە شێرانی كوردی

ئەوەی پێت وابە كێوە - خەرمانی زێر و زیوە

زەرنیق و جیوەی هەوشار - ئاغەلأن ساحیب تێوە

خوێندن زۆر هاسانە بۆم - دەخوێنم بە زمانی خۆم

كەشفی دەكەم بە ئاتۆم - هەر چی قازانجی پێوە

لەسایەی پێشەوادا زۆر بە ئازاو بەمەردی-دەیپارێزن ئەم

خاكە بێچوە شێرانی كوردی

كەتیرەو مازو وبەرگن - خوری و بنێشت و توتن

بۆ خۆم پەنیوی دێتم - بە هزی زانست و خوێندن

كوردە هەرچی زەوێتە - یەكجار بە بەهرەو بیتە

هەر خوێندن كێشكچیتە - لێت داگیر نەكا دوژمن

لەسایەی پێشەوادا زۆربەئازاو بە مەردی-دەیپارێزن ئەم

خاكەبێچوە شێرانی كوردی

ئەم سرودە بە راستی ببوە ویردی زمانی لاوان و لە شارو گوندی كوردستان كەم كەس هەبوو لەبەری نەكا و بە كۆر و بە كۆمەڵ نەیخوێننەوە. بە لای منەوە بە پێچەوانەی بۆ چوونی مستر ئیگلتون مەقامخوازی و پەرهاویشتن نەبوو، پشتمانی داگیركراوی كوردی 83 بەڵكوو واقعیەت و سروشتی راستەقینەی ن نیشان دەدا و هەر بۆیەش بەم جۆرە لە لایەن كۆمەڵانی خەڵكەوە پێشوازی

لێکرا،

## پەراوێزەکانی بەشی شەشەم

١ - کەریمی حسامی- کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری . ١٩٨٦ ل

٢ - گۆڤاری کوردستان-ژمارە ١ ساڵی یەکەم- ١٥ سەرماوەز ١٣٢٤ ٦ دسامبر ١٩٤٥ ل،١١-١٢

٣ - کەریمی حسامی - هەمان سەر چاوە ل

٤ - د.قاسملو-چل ساڵ خەبات لە پێناو ئازادیدا - ١٩٨٥ . ل .٢٠-٢١

٥ - ک.ن.برونتس- شۆرشەکانی رزگاریخوازی سەردەمی ئێستا - ١٩٨١ ل ١٢٣

٦ - جەواهیر لعل نهرو- نگاهی به تاریخ جهان . تاران ١٩٥٩ . ل ٦١٢

٧ - ک.ن.برونتیس- هەمان سەر چاوە ، ١٩٨١ ، ل ١٣٢

٨ - لینین- شوێنەوارە گشتیەکان، بەرگی ٢٥ روسی ل ٣٤

٩ - د.قاسملو- چل ساڵ خەبات ، ١٩٨٥، ل .٢

١٠ - دوازدهم شهریور تاریخچه نهضت دمکراتیک آزربایجان، ١٣٢٥ ل١٣-١٦

١١ - ئارچیبالد- شرق آموختن، وەرگێرانی صهبا سعیدی ١٣٧١، ل ٣٢٨

١٢- ئیگلتون-کۆماری١٩٤٦کوردستان،وەرگێرانی س.م. صمدی.١٣٦٠، ل ٨٦-٩٠و١٠٥

١٣ - درک کینان- کردها و کردستان، وەرگێرانی برایمی یونسی، ١٣٧٢، ل ١٢٢

١٤ - ئیگلتون- هەمان سەر چاوە، ل ١٠٢

١٥ - ئارچیبالد روزولت- هەمان سەر چاوە، ل ٣٠٩-٣٢١-٣٢٩

١٦ - مسعود البارزانی - البارزانی والحرکه التحرریه الکردیه ١٩٤٥-١٩٥٨ -کانون الاول ١٩٨٧ ل ٧-٨

١٧- نەجەفقلی پسیان- مرگ بود باز گشت هم بود ، ١٣٢٧، ل ٣٤-٣٢

١٨ - دوازدهم شهریور تاریخچه نهضت دمکراتیک آزربایجان، ١٣٢٥، ل ٣١-٣٠

١٩ - هەمان سەر چاوە ل ٣٨- ٤٠

٢٠ - هەمان سەر چاوە ل ٤٨- ٥٠

٢١ - سرلشکر احمد زنگنه -خاطراتی از ماموریتهای من درآزربایجان از شهریور ١٣٢٠تادیماه١٣٢٥، ل ٦١-٦٢

٢٢ - درک کینان - کردها و کردستان ، وەرگێرانی برایمی یونسی، ١٣٧٢ ل ١٢٣

## بەشی حەوتەم :

# کۆماری دیموکراتی کوردستان

«ئاواتی ناسیونالیزمی کورد واتە کوردستانێکی سەر بەخۆ لە ماوەی دیسامبری ۱۹٤٥ تا دیسامبری ۱۹٤٦ لە چوار چێوەی دەوڵەتێکی پچوک لە کوردستانی ئێراندا وەدی هات. چۆنیەتی دامەزران و پێکهاتنی کۆماری کورد، مێژووی کورت و پر لە رووداوی ئەو. هەر وەها تێکچوونی کوت و پرو لە نەکاوی، یەکێک لە بە سەر هاتە روون و ئاشکراکانی سەدەی بیستەمە لە رۆژ هەڵاتی نێوە راستدا.» (۱)

ئەوە کە لە ساڵی ۱۹٤٦دا، لە بەشێکی نیشتمانی لەتو پەتکراوی کورد، واتە رۆژ هەڵاتی کوردستان لە هەل و مەرجێکی تایبەتی ئێران و جیهاندا دەرفەت بۆ گەلی کورد هاتە پێش وروڵەکانی ژیرو نیشتمانپەوەریش ئەم دەرفەتەیان قۆزتەوە کۆمەڵەی ژ.ک یان دامەزراند وکردیان بە حیزبی دیموکرات و پاشان کۆمارێکی کوردیان پێکهێنا، لام وایە جێگای دم بە دمە و باس و گومان نیە. ئەوەی جێگای باسە و تەنانەت سەرنج راکێشیشە ئەوەیە کە لە وەتا ئەو کۆمارە ساوایە و ئەم دەوڵەتە نەتەوییە کوردییە دامەزراوە، واتە لە ساڵی ۱۹٤٦وە تا ئێستا دەزگای تەبلیغاتی رژێمی تاران و نووسەراتی شۆڤێنی نەتەوەی باڵا دەست لە ئێران و دوژمنانی ئازادی و سەر بەستی کورد لە هەندەران هەولیان داوە کە کۆماری

کوردستان و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بە جیاوازیخواز وبە سەر بەخۆ، بە تجزیە طلب و بە انفصالی لە قەڵەم بدەن.

« هێشتا لە نوڤمبەری ١٩٤٥ رۆژ نامەکانی هەندەران رایانگەیاند کە لە ئێراندا ناوچەی سەربە خۆی کوردەکان پێک هاتوە. لە واتەیە لەم نیزیکانەدا ببێتە ناوەندی راپەرینێکی گشتی. ئەم ناوەندە کەوتۆتە خوارووی گۆلی ورمیٚ لە سابلاخ کە بە مەهاباد ناو دەبرێ. ناوچەی بەر دەستی ئینگلیزەکان لە خواروو، لە سەقز دەبرێتەوە. ئۆردوی سۆڤێت لە ناوچەی سەروو جێگیر بوە. لێرە لەم « عەرزە پچوکە » یاغی و سەربزێوانی کورد لە ژێر رێبەرایەتی مەلا مستەفای بارزانیدا کۆ بوونەوە کە لە مانگی رابردوو دا بە یارمەتی هێزی هەوایی ئینگلستان لە عیراق دەر کرا. » (٢)

بەڵام با بزانین جەعفەری مەهدی نیا لە بارەی رووداوەکانی ساڵانی ١٣٢٤ - ١٣٢٥ - ١٩٤٥ -=١٩٤٦ کوردستانی رۆژ هەڵات چی دەنووسیٚ:

« رۆژگارتیٚ پەری تا ساڵی ١٣٢٤ کۆتایی هات. ئاخری زستانی ساڵی ١٣٢٤ هەرا هەرای (حیزبی کۆمەڵە ) گەیشتە ئەوپەری خۆی. قازی محەممەد خۆی بە رێبەری کوردستان راگەیاند. ئەوەی لەو کاتیدا دەبیسرا ئەوە بوو کە دوای شەهریوەری ١٣٢٠( سیپتامبری ١٩٤١ قازی محەممەد نەخشەی کوردستانی ئازادی هێنا گۆریٚ و خستیە بەر دەستی بیروڕای گشتی. سنوری کوردستانی ئازاد لە نەخشەی قازی محەممەد دا بریتی بوو لە هێندیٚ بەش لە خاکی ئێران وتورکیا و عیراق و بۆ ئەوەی قسەی نەیەتە سەر بەشێکی پچوکی خاکی شورەویش. ئەم نەخشەیە هەمیشە لە بان سەری قازی محەممەد هەڵواسرا بوو. دوای بڵاو کردنەوەی نەخشەی کوردستانی ئازاد و پێک هێنانی (حیزبی کۆمەڵە) رۆژێک لە شاری مەهاباد بەیاننامەیەک بڵاو کرایەوە کە هەر کەس خزمەتی سەر بازی کردوە لە بارەگای حیزب ئامادە بیٚ و بۆ بە چیٚ گەیاندنی ئامانجی حیزب چەک وەر بگریٚ. چەند رۆژ دوای ئەم کارەساتە ئاڵای ئێران لە سەر تەواوی

ئیدارەکانی دەوڵەتی هاتنە خوار و ئالای سێ رەنگی دیکەی بە پێچەوانەی ئالای ئێران (سوور و سپی و سەوز) کە نیشانەی گوڵە گەنم، رۆژ،و قەڵەم ی تێدا دیار بوو، بە ناوی پەرچەمی کوردستانی ئازاد لە سەر بانی ئیدارەکانی دەوڵەتیدا بەرز کرایەوە ودوای چەند رۆژ **قازی محەممەد** سەرۆکانی عەشایرو دەسەلاتدارانی ناوچەی بۆ بارەگای فەرمانداری پێشووی مەهاباد بانگ کرد و حکومەتی (کۆماری کوردستان)ی راگەیاند.»(٣)

لە دوای رووخانی کۆماریش حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ماوەیەک لە ژێر رێبەرایەتی حیزبی تودەو ماوەیەکی تر لە ژێر تەئسیری حیزب و بزووتنەوەی چەپ لە ئێران و لە ناوچەدا، سەر دەمێک لە ترسی تاوانبار کردن بە سەر بەخۆیی خواز، واتە (ئەم تاوانە مەزنەی لە لێبوردون نەهاتوو!)، قەدەرێکیش بۆ لاواندنەوەو دڵراگرتنی هێزەکانی بە رواڵەت دیموکرات ودژی ئیمپریالیستی ئێران و بەبێنێک سەبارەت بە بارو دۆخی ئالە باری رێبەرایەتی حیزب کە لە ژێر باڵی بێگانەدا حاوا بۆوە، هەوڵ و تەقەلای داوە کە وشەی خود موختاری بە کۆماری کوردستانەوە بلکێنێ و بەڵکوو لەم رێگایەوە خۆی لە ژێر باری قورسی ئەم (تاوان و بوختانە نە بەخشراوە) رزگار بکا. لە ماوەی ئەم ٥٠-٤٠ ساڵەدا رێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە راستی و بە دڵپاکی هاواریان کردوە کە ئەوە بوختانە و کۆماری کوردستان خود موختاری بوە و ئێمەش هەرخود موختاریمان دەوێ و لە هەموو ئێرانیەکیش ئێرانیترین، بەلام هیچ فایدەی نەبوە و ئەم لالانەوەو پارانەوە و راستگۆییە، دڵی رەشی شۆڤێنیزمی مەزنیخواز و دوژمنانی ئازادی نەرم نەکردوە. سەیر ئەوەیە لەم پەلامار و بوختانە نارەوایەدا هێندێ جاریالی هەرە چەپی بە رواڵەت هێزە دیموکراتیەکانی ئێرانیش بۆ لە ژێر پێنانی مافی رەوای نەتەوایەتی کورد لە گەڵ هێزە کۆنەپەرست و شۆڤێنیەکان یەکیان گرتۆتەوە.

ئەوە هیچ کە ئەم مەسەلەیە پاش ٥٠ ساڵ لە نێوان حیزبی دیموکرات و کۆنە

پەرستی ئێراندا چارە سەر نەکراوە، لە نێوان نووسەرو مێژوو نووس و سیاسەتمەدارانی کوردیشدا ساخ نەکراوەتەوە. تا ئێستا روون نەکراوەتەوە کە داخوا ئەم کۆمارە ساوایە وئەم دەسەلاتە نەتەوەییە ،کۆمارو حکومەتێکی سەر بە خۆو ئازاد بوە یا حکومەتێکی خود موختار بوە. نەک هەر ئەوە، ئەگەر راستیت گەرەکە لە وتارو نووسین و بریاری ئەوسای حیزبی دیموکرات و حکومەتی میللی و کۆماریشدا ئەم مەسەلەیە زۆر روون نەکراوەتەوە و بە گوێرەی سیاسەتی رۆژ مامڵەی لەگەڵدا کراوەو بە قەولی توشیروان مستەفا ئەمین:« پاشا گەردانی وشەی سیاسی و قانونی و بەرێوە بەرایەتیش لە ناو داو ودەزگاکانی حکومەتی کوردستان و دەسەلاتەکانیدا سەر هەڵدەدا.»(٤)

ئەم پاشا گەردانیە نەک هەر لە ناو دام و دەزگای حکومەتی کوردستان، بەڵکوو لە بۆ چوون و نووسین و لێکدانەوەی نووسەرو زاناو مێژوو نووسانی کوردیشدا بە زەقی خۆ دەنوێنێ. ئەم پاشا گەردانیەش پتر وە باری کردن بە وشە و زاراوە دەچی نەک قەناعەت و ساخبوونەوە لە سەر بابەت و جەوهەری رووداوەکان.

هێندێ لە نووسەرانی کورد(کۆماری خود موختاری کوردستان )/بە کار دێنن، بێ ئەوەی لە هیچ بەڵگەو سەنەدێکی کۆماری کوردستاندا بەر چاویان کەوتبێ کە وشەی (خود موختاری) بە کۆماری کوردستانەوە لکا بێت. ئەوان لە نێوان بەرنامەی حیزبی دیموکراتی ١٣٢٤ و کۆماری کوردستانی ١٩٤٦ و دام ودەزگای حکومەتی میللی و کیان و دەسەلاتی نەتەوییدا هیچ فەرق و جیاوازی و گۆرانکاریەک نابینن. سەیری ئەوەش ناکەن کە لە هەموو بەڵگەو نووسراوەکانی رەسمی سەر دەمی کۆماردا، رۆژی دووی رێبەندان بە رۆژی ( جێژنی سەربە خۆیی و ئیستیقلالی کوردستان) ناو براوە. هێندێ لە نووسەران (کۆماری مەهاباد) بە کار دێنن کە هەڵەیەکی سواوی رۆیشتوەو لە هیچ بەڵگەیەکی کۆماردا بەکار نەهاتوە. چونکە کۆماری کوردستان بوە نەک کۆماری مەهاباد.

برێکی تر نە نووسەران هەر وەک لە گەڵ وشەی کۆمار نێوانیان نەبێ دەزگای دەوڵەتی حکومەت لە ڕێژیم و سیستمی کۆماریی جیا ناکەنەوە و هەموو ڕووداوەکە لە چوار چێوەی حکومەت دا تەنگە بەر دەکەن کە دام و دەزگای ڕاپەراندنی کۆمارە. بە لای منەوە لە ئەدەبیاتی سیاسیدا هەموو وشەو زاراوە یەک حیسابی جیای خۆی بۆ دەکرێت.

هێندێکیتر لە نووسەران لە یەک نووسیندا زاراوی (کۆماری کوردستان، کۆماری خود موختاری کوردستان، کۆماری مەهاباد، کۆماری میللی کوردستان) تێکەڵ دەکەن و لە سەر لایەکیان ساخ نابنەوە. لە نووسراوەی هێندێ نووسەرانی دیکەدا، کۆماری دێموکراتی کوردستان بە کار دەهێنرێت کە بە لای منەوە ڕاست لە گەڵ واقعیەت ڕێک دەکەوێ. چونکە لەو بروایەدام بە ڕاستی کۆمارێکی دێموکرات بوە. دێموکراسی بە گوێرەی بارو دۆخی ئەو زەمانی و لە چاو ڕێژیمەکانی هەرێمی ڕۆژ هەلاتی نێوە ڕاست دێموکراتیترین ڕێژیمی سیاسی بوو.

ئارچیبالد ڕۆزوڵت کە چۆتە مەهاباد و چاوی بە پێشەوا قازی محەممەد کەوتوە دەنووسێ: «قازی محەممەد گوتی: تەواوی ئەو خەڵکەی لە ژێرکۆنترۆڵی دەوڵەتی مندان لە دەربڕین و نووسینی دڵخوازی خۆیان ئازادن» پاشان دەڵێ: لە کۆلان و شەقامەکانی مەهاباد بە ئاشکرا دەکرا گوێ بدەیتە ڕادیۆکانی ئەستەمبوڵ و لەندەن. بە لام لە تەورێز گوێ دان بەم ڕادیۆیانە سزای مەرگی بۆ دانرا بوو. یان لە سەر خۆیی و لیبرالیزمی قازی محەممەد و دەوڵەتەکەی بوو کە ئەو ئازادیەی دەستە بەر کرد بوو. یان دەنا بالانسی دەسەلات لە نێو عەشیرەتەکاندا بوو کە هیچ عەشیرەتێک نەیدەوێرا پێ لە بەرەی خۆی زیاتر ڕابکێشێ. سەر جەمی بەرهەم و دەستکەوتی سەرەکی ئەو ئازادیانە ئەوە بوو کە حکومەتەکەی لە ناو خەڵک لانی کەم خەڵکی مەهاباد خۆشە ویست و جێگای متمانە بوو. خەڵکێک کە زوڵم و زۆریی دەوڵەتی تاوەندیان لە سەر وەلا چوو بوو وتامی ئازادی و سەر بەستیان چێشتبوو.»(٥)

**ئیگلتونیش** سەبارەت بە دیموکراسی کۆماری کوردستان دەنووسی:« خەڵکی شار بە خەیاڵی راحەت دەیانتوانی هەموو رادیۆکانی بێگانە گوێ بدەنێ. لە کاتێکا لە ئازربایجان بە هیچ جۆر ئەم ئازادیە نەبوو. پۆلیسی نهێنی بەشێکی جیا نەکراو لە رێژیمی تەوریز بوو. کە چی لە مەهاباد شتی وا نەبوو. لە ماوەی ساڵێکدا چەند کەس لە دوژمنانی **قازی** گیران،ئەژماریان لە پەنجەی دەستان تێ نە دەپەری. **قازی** بە هیچ جۆر بڕوای بەوە نەبوو کە لە ناوچەدا ئیدارەیەک هەبێ کە خەڵکی لێ بترسێ و لە رێژیم و یا گیانی ئەو پارێزگاری بکا. هەر بۆیەش هەمیشە بە خەڵکی دەگوت: هەڵسورانی ئێوە پێویستە تێگەیشتن و شعوری سیاسی ئێوە نیشان بدا. **قازی** زۆر باش ئاگاداری مەسەلەکان بوو. دەیزانی کە ئەم حکومەتە لە ئارەزووی دێرینەی نەتەوەیەک هەڵقوڵاوە. کە وابوو بەر لە هەموو شت کار و کردەوەی دەبێ جۆرێک بێ کە بتوانێ پشتیوانی زۆربەی میللەت بۆ لای خۆ رابکێشی. ئەو دەم ئەم هێزە مەزنەی خەڵک باشتر لە هەموو ئیدارەو پۆلیسێکی نهێنی رێژیم ونەزمی مەوجود دەپارێزن.»(٦)

کە وابوو بە کار هێنانی زاراوی (کۆماری دیموکراتی کوردستان) نەک هەر بۆ چوونێکی وشک و دەمارگیری نیە، بەڵکوو راست لە شوێنی خۆیەتی. ئیتر سەر نە کەوتن و یا کەم و کوڕی هیچ لەم واقعیەتە ناگۆڕێ و بۆ کوردیش نابێتە کەسری شان کە شانازی پێوە بکا.

جا بەم حاڵە کە نووسەرانی کورد لە سەر بە کار هێنانی وشەو زاراوەی ناوی کۆماری کوردستان ساخ نەبنەوە، چۆن دەتوانن لە سەر چۆنیەتی قەوارە و کیان‌وسیستمی ئەو دامەزراوە نەتەوەییە ساخ بنەوە.؟ رەنگە ساخ کردنەوەی ئەم روو داوە گرنگەی مێژووی کورد پێویستی بە درێژە پێدانی لێکۆڵینەوە و پەیدا کردنی فاکت و بەڵگەی نادیار و بڵاو نەکراوە هەبێ کە بێگومان لە گەڵ گوزەشتی زەمان وەدەر دەکەون و دەگەنە دەستی نووسەر و مێژوو نووسان و پەردە لە سەر زۆر شتی شاراوە لا دەدرێ.

دوکتور قاسملو له کتێبی «چل ساڵ خەبات» دا بۆ پاکانە کردن لە سەر بە خۆ نەبوونی کۆماری کوردستان دەنووسێ:

« دوژمنان دوو بوختانیان بە کوماری کوردستان کردوە. یەکەم ئەوە کە ئەم کومارە دەست کردی بێگانە واتە شورەوی بوو. ورد بوونەوە لە مێژووی کورتی دامەزران و ژیانی چەند مانگەی کوردستان دەری خست کە یارمەتی شورەوی تەنیا عامیلێکی لە بار بوە، دەنا پێک هێنانی کوماری کوردستان داخوازی کومەلانی خەلک بوە و هەلسورینەریشی گەلی کورد و بە ڕێوە بەری حیزبی دیموکراتی کوردستان بوە.

بوختانی دیکەش ئەوەیە کە حیزبی دیموکرات مەبەستی لە پێک هێنانی کومارجیا کردنەوەی کوردستان بوە لە ئیران. لە هیچ یەک لە نوسراوەکان و چاپەمەنی رەسمی حیزب و قسەکانی بەریوە بەرانی ئەو کاتە باسی جیا بونەوە لە ئیران نەکراوە. بە پێچەوانە زور جار شەخسی پیشەوا قازی روونی کردوتەوە کە حیزبی دیموکرات تەنیا خود موختاری دەوی لە چوار چێوەی ئیراندا. » دوکتور قاسملو هەر لەو کاتەشدا دەنووسێ:« لە سەر دەولەتی کوماری کوردستان دەبێ بگوترێ کە ئەم ناوە یەکێک لە شانازیە گەورەکانی حیزبی دیموکراتە. چونکە یەکەم ریکخراوی سیاسیە کە لە سەر دەمی شاهەنشاهی دا ئالای جەمهوری و جەمهوریخوازی بەرز کردوتەوە.« (٧)

لێرەدایە قسەی نوشیروان مستەفا وەراست دەگەرێ و دەبێتە ( پاشا گەردانی) وشە. ئەگینا ناوی « دەوڵەتی کۆماری کوردستان » و بەرز کردنەوەی ئالای جەمهوری لە رژێمی پاشایەتیدا، لە گەڵ(خود موختاری) چۆن ڕێک دەکەوێ؟! هێندێ لە نووسەرانی کورد بە بیانووی ئەوە کە هیچ دەوڵەتێکی بێگانە کۆماری کوردستانی بە رەسمی نەناسیوە، ئیتر ئەوە کۆمارێکی سەر بەخۆ نەبوە. بەلام سەربەخۆیی دەوڵەت و حکومەتێک تەنیا نەبەستراوەتەوە بە ناسینی دەوڵەتانی دیکەوە. دەوڵەتێکی بە سەر خاک و ئاو وخەڵک و سنووری خۆیدا

دەسەلاتی هەبێ، پرۆگرام و یاساو کاروباری سیاسی وکولتووری‌و کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و سوپایی نێو خۆی بۆ خۆی بەرێوە بەری‌و حکومەتێکی دیکە ئاغایەتی بەسەردا نەکا، ئەوە دەوڵەتێکی سەر بەخۆیە. دیارە ناسینی دەوڵەتانی بێگانە بۆ پێوەندی نێو نەتەوەیی و بوونە ئەندام لە رێکخراوی دەوڵەتە یەکگرتوەکان مەرجێکی سەرەکیە، بەلام نەناسینیش وەنەبێ سەوبەخۆیی ئەم دەوڵەتە بە تەواوی نەفی بکاو سیفەتی دەوڵەتی لە بەر داماڵێ. ئەم ناسینەش تا رادەیێک پێوەندی بە کات و زەمان‌وبەردەوامی مانەوەو دەسەلاتی ئەو حکومەتەوە هەیە. دیارە هەروەک گوتراوە لەم بارەوە بیرو بۆچوونەکان لێک جیاوازن.« ..بەرای ئێمە کۆماری کوردستان لەمەهاباد دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆبوو هەر لەشێوەو هەم لەناوەرۆکدا چونکە:

١- دەوڵەتی کوردستان بە رەسمی و بە فیعلی‌وبەکردەوە لە دەوڵەتی شاهەنشایی ئێران دابرا بوو چەندین وتو وێژی رەسمیش لە نێوان دەوڵەتی ناوەندو دەوڵەتی کوردستانیش ئەنجامدرا بۆ گەرانەوەی دەوڵەتی نوێ‌و خۆهەڵوەشاندنەوەی، بەلام گفتوگۆکان نەگەیشتنە هیچ ئەنجام‌و چارەیەک.

٢- ئەو دەوڵەتە روو بەرێکی فراوانی لە کوردستاندا داگیر کرد بوو.دانیشتوانی ئەو هەرێمە راستەو خۆ کەوتبوونە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی نوێ، حکومەتی پێشەوای ئەمر بە رێک و پێکی کارەکانی حاکمیەتی خۆی رادەپەراند،دەستەیەکی راپەراندن(هەیئەتی تنفیذیە) کە وەزارەتەکەی مەهاباد بوو دەسەلاتی راپەراندنی گرتبوە ئەستۆی خۆی‌و داداگاکانیش سەر بە دەسەلاتی دادوەری بوون.

٣- کۆمەلانی خەڵکی کوردستان بەو دەوڵەتە رازی و قایل بوون‌و ملیان دەدا بۆ بریارو راسپێریەکانی سەرۆکایەتی ئەو کۆمارە، یان هەر هیچ نەبێ بەرەنگاری ئەم دەوڵەتە نەبوونەوە، نەک هەر خەڵکی کوردستانی ئێران بەڵکە کوردەکانی عیراق و تورکیاش ئەو دەوڵەتەیان بە ئارمانجی سەرەکی خەباتی خوێناوی خۆیان

دەزانیی‌و چالاکانەش بۆ پاراستنی ئەم دەوڵەتە بەشداریان لە ئورگانە جۆراو جۆرەکانی ئەم کۆمارە دەکرد. کۆمەڵە دەرەبەگێکی خائینی لێ دەر کەی زۆربەی هەرە زۆری خەڵک کۆماری کوردستانیان خۆش دەویست و ماقوڵترین پیاوو زیرەک و جوامێرترین رۆڵەکانی خۆیان کردە قوربانی ئەو دەوڵەتە.

٤ - دەوڵەتی نوێ دەستی کرد بە جێبەجێ‌کردنی ریفورمە کۆمەلایەتی و ئابوریەکان‌و وەرام دانەوەی پێداویستە سەرەکی‌و زیندوەکانی کۆمەڵانی خەڵک، ئەوە بوو زمانی کوردی لە هەموو قۆناخەکانی خوێندن‌و لە ئورگانە کار گێریەکان بوو بە زمانی رەسمی سوپای کوردستان دامەزرا، دەست کرا بە چارە کردنی کێشەی زەوی و هتد.»(٨)

رەنگە بێ جێش نەبێ کە مرۆڤ بە هەولێکی سەرە تایی بە گوێرەی توانا و بە یارمەتی هێندێ بەڵگەو نووسراوەی بەر دەستان لانی کەم ئەوە روون کاتەوە کە وشەی ( خود موختاری) لە هیچ نووسراوەیەکی رەسمی کۆماری کوردستاندا بە دوای کۆمارە وە نەلکاوە. بەلاَم وشەو زاراوی (سەربە خۆیی و ئیستیقلال و سەربەستی و ئازادی چەندی بلێی لە نووسراوەو وتاری بەر پرسان و نوێنەرانی خەڵکدا بە کار هاتوە. بۆ نمونە:

- جێژنی سەربە خۆیی و ئیستیقلالی کوردستان یا درەوشینی ئەستێرەی خۆشبەختی کوردان. - کوردستان ژمارە ١٠- ١٥ی رێبەندانی ١٣٢٤. چواری فیوریەی ١٨٤٦

- جێژنی شیرکەتی تەرەقی کوردستان - بە بۆنەی سەربە خۆیی - کوردستان ١٥ رەشەمەی ١٣٢٤ - ٦مارسی١٩٤٦

- وتاری پێشەوا رۆژی دووی رێبەندان : بە دڵێکی بە هێز پایە دارمان کردو ئیدامەمان بە فەعالیەتی خۆماندا، تا ئیستیقلال و ئازادی نەتەوەی کوردمان وەدەست هێنا.کوردستان ژمارە ١٠- ١٥ی رێبەندانی١٣٢٤- فیوریەی ١٩٤٦

جێژن لە ئیدارەی رۆژنامەی کوردستان بە بۆنەی ( سەربە خۆیی و

ناساندنی سەر کۆماری کوردستان.)

- وتاری پێشەوا لە جێژن و بانگێشتنی ئاغای جەعفەری کەریمی بە بۆنەی . سەربەخۆیی و ناساندنی پێشەوای کوردستان): « ... ئەورۆ کە ئەمە ئیستیقلالمان دەوێ پێویستە کە هەموو کارێک خۆمان جێ بە جێی بکەین. ئەوەڵێ ئیدیعای خۆمان کرد کە لە حدودی دەوڵەتی ئێراندا خود موختاریمان دەوێ یانی ئێران ئیحتیاجی ئێمە رەفع بکا و میللەت گاری بکا. دوو دەفعە لە لایەن ئازەربایجانەوە بۆ تەوریزیان بانگ کردم کە لە ئازربایجاندا گرنمان هەبێ ئەمن پێشنهادی ئەوانم قەبوڵ نە کرد چون میللەتی کورد چوار ساڵە کە خود موختارە وداوای ئیستیقلال و تێک خستنەوەی تەواوی خاکی کوردستان دەکا. زۆرم پێ گران بوو کە لەو حەقەی دەست هەڵبگیرێ و ئیحساساتی ئێوە مانیعی ئەوەی بوو کە ئێمە بە خود موختاری رازی بین چونکو کە مودەی ئەو چەند رۆژەی کە جێژن گیراوە ئیحساساتێکی ئێوە نواندوتانە وینەیەکی حەساس و کامیلەو دەبێ دنیا بزانێ کە کورد لیاقەتی ئیستیقلال و سەربەستی هەیە.» (٩)

- جێژنەکانی سەربەخۆیی و ناساندنی سەر کۆماری کوردستان لە کانگای پێشمەرگە.

- وتاری حەمەدەمینی موعینی:«.. بە ئیفتیخار و سەر بڵندی دەزانم دەو رۆژە موبارەکەدا کە جێژنی سەربەخۆیی کوردستانە..» کوردستان ١٩٤٦/٢/٢٣ - ١٣٢٤/١٢/٤

- دانانی سرودی میللی - ئەی رەقیب . ئەم سرودە کە بۆتە سرودی رەسمی نەتەوەی کورد، سرودی (خود موختاری) نە بوو. سرودی میللەتیک بوو کە لە مێژوودا بۆ هەوەڵین جار دەسەلاتی میللی دەگرتە دەست و چارە نووسی خۆی دیاری دەکرد. هەر بۆیەش بە هەق بۆتە سرودی کورد و لە هەموو بەشەکانی کوردستان لە هەموو رێو ورەسمێکی میللیدا دە خوێنرێتەوە. بە لای منەوە لە کاتی لێکۆڵینەوەو ساخکردنەوەی چۆنیەتی کیانی کۆماری کوردستان پێویستە ئەم

بابەتانە لە بەرچاو بگیرین و نە خرینە پشت گوێ. پاشا گەردانیەکەش هەر لە بەر سەونج نەدانی ئەم راستیانە دیتە گۆرێ. خۆ ئەگەر بە وردیش سەیری سەر جەمی رووداوەکان و کار و کردەوەی دام و دەزگای کۆماری کوردستان بکەین ، رەنگە تا رادەیەک بگەینە ئەم ئەنجامە کە کۆماری کوردستانی ١٩٤٦ دام و دەزگای خود موختاری نەبوو. لە فیدرالیش پتر قاچی درێژ کرد بوو. چونکە دامەزرانی خود موختاری پێویستی بە قەرار داد و یا رێک کەوتن و موافەقەتی حکومەتی ناوەندی هەیە. کۆماری کوردستان بێ ئەوەی گوێ بداتە رەزامەندی دەوڵەتی ناوەندی تاران ئالای خۆی هەڵکرد بوو، سەر بەخۆیی خۆی راگەیاند بوو.. مەسەلەیەکی دیکەش لێرەدا جێگای باسە و لام وایە لە وتاری دیکەشدا باسم کردوە، ئەویش ئەمەیە کە رێکخراوەکانی ئێستای کوردستانی ئێران لەوەدا ئازادن چۆن سیاسەتی خۆیان دیاری دەکەن و خود موختاریان دەوێ و یا کەمتر و زیاتر و یا لە پێناو خود موختاریدا چەند هەزار لاوی کورد بە کوشت دەدەن ئەوە کاری خۆیانە. بەڵام هەق نیە ئەوان مێژووی نەتەوە دەستکاری بکەن و خاڵی نەبوو وناحەزی باوینە سەر.

«ناکرێ ئەو بۆ چوونە رەت کەینەوە کە قازی محەممەد و لایەنگرانی ئاواتی کوردستانێکی گەورەیان هەبوو. ئەوان هیوا دار بوون کە مەهاباد بکەن بە ناوەندی کولتوری کوردی و جولانەوەی رزگاریخوازیی کورد و تەنانەت جێگای سوریا و سولەیمانی بگرنەوە و دەوری سەرەکی هەبێ لەو سەر دەمەدا.»(١٠)

## دووی رێبەندانی ١٩٤٦

بۆنەوەی کورتو پڕ بە سەر رووداوەکان دا نەکەوین با توزێ بۆ دوایە بگەرێینەوە. دیارە ئەوە نابێتە یادانەوە بەڵکوو گەرانەوەیە بۆ روونکردنەوەی هێندێ بابەتی پێویست. لە سەر ئەو باوەرەم هەر وەک لە کەون و کائینات دا

هەموو شت لە بزووتن و گۆڕان و هەڵدان دایە، بزووتنەوەی ١٩٤٢ی ڕۆژ هەڵاتی کوردستانیش ئاوا لە گۆڕان و هەڵدان دابوە. هەر بۆیەش ڕەوا نیە بە وشکی و بە تەنیاو یەک لایەنە بە قۆناخێک و بە دروشمێکەوە بنووسیێن. لە سەرەتاوە بە دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.ک بەرنامەی یەک گرتنەوەی کوردستانی گەورە دێتە گۆڕێ و لە گەڵ نیشتمانپەروەرانی بەشەکانی دیکەی کوردستان پێوەندی دەگیرێ و تەگبیر و ڕاوێژ دەکرێن. پاشان بارو دۆخی ڕۆژ و سیاسەتی جیهانی لە بەر چاو دەگیرێو بۆ ئەوەی لەم هەل و مەرجەدا ویست و داخوازی کورد دنیا پەسند تر بێ و ترس و دڵە کوتەش نەخاتە هەناوی کۆنە پەرستی تاران و لە ڕێگای ئاشتی و هێمنانەوە لە گەڵ حکومەتی ناوەندی کێشەکە چارە سەر بکرێ. **کۆمەڵەی ژ.ک** دەبێتە حیزبی دێموکراتی کوردستان( دیارە بە لاسا کردنەوەی ئازەربایجان) بەرنامەکەشی دەبێتە داوای خود موختاری و تەنانەت کەمتریش وەک دانانی (ئەنجومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی) یاسای پەسند کراوی مەشروتەی پێش ٥٠ ساڵ کە یەکێ لەو یاسایانەی شۆڤێنیستی سەر دەم بوو.

« قانونی ئەساسی ئێران و یاسای هەوەڵین هەڵبژاردنی پارلمان بناخەی زیندەیی و سەر پشکی بۆ فارسان دارشت. بۆ نمونە : بۆ تارانێ کە زۆربەی دانیشتوانی فارسن و دەسەلاتی فارسی لەوێدا زاڵە، لە ١٥٦ نوێنەری پارلمان ٦٠ کورسی بۆ تاران دانراوە. لە کاتێکا بۆ ئازەربایجان بە کوردستانیشەوە کە حەشیمەتی لە تاران زیاترە تەنیا ١٢ کورسی دانراوە. بۆ سنەو هەمەدان ٦ کورسی لە بەر چاو گیراوە. جگە لەوەش لە گەڵ تەواو بوونی هەڵبژاردن لە تاران پارلمان دەتوانێ دەست بە کار بکا و یاساو بریارانیش پەسند بکا بێ ئەوەی نوێنەرانی ناوچەکانی دیکە بەشدار بن. »(١١)

ڕێبەرانی حیزبی دێموکرات زۆریان هەوڵ داوە کە بە هێمنانە لە گەڵ حکومەتی ئێران ڕێک کەون. بەڵام دیکتاتور و شۆڤێنیست بە درێژایی مێژوو هەر زمانی داپلۆسین و زۆرداریان زانیوە و قەت ملیان بۆ ویستی ڕەوای خەڵک ڕانە کێشاوە.

با بزانین له بەرانبەر ویستی خود موختاری حیزبی دیموکراتی کوردستان دا **رۆژنامەی کەیهانی تاران ۲۷ی مانگی یولی ١٩٤٥** چی دەنووسی:« کوردەکان رەسەنترین ئیرانی و نیشتمانپەروەری راستە قینەی ئیرانین. رەنگە بەشیکی نە خویندەواری کورد لە واتای وشەی (سەر بە خویی) تی نەگەن. بەلام روشنبیری کورد باش دەزانن ( سەر بە خویی) چیە. لە سەر دەمی ئیمەدا کە تەنانەت میللەتانی گەورەش بو یەکیتی و پشتگرتنی یەکتر هەول دەدەن دەکری باوەر بکەین کە هیندی خەلک لە عەشیرەتی راستە قینەی ئیرانی بیانەوی لە ریشەو رەگەزی خویان جیا ببنەوە؟ ئەوان بو کوی دەچن ؟ئیستا ئەگەر ١٥ میلیون میللەتی ئیران لە بەر چاوی میللەتە گەورەکانی دنیا گەورە ترین رول یاری دەکەن، ئەوان چی یان بە سەر دیت ئەگەر بە عەشیرەتی جیاواز دابەش بکرین. تازە خیوەو بوخارا و گەنجە و تفلیس و کوردستانی تورکیا و بلوجستانی ئینگلیز بە کوی گەیشتن کە لە ئیران جیا بوونەوە؟»

حکومەتی کونە پەرستی ئیران بە هیچ جور گوی بو ویستی رەوای گەلی کورد لە کوردستانی ئیران شل نەدەکرد. حیزبی دیموکرات نەیدە توانی دەرفەتی پیش هاتور لە کیس بدات و لە بەرانبەر ئەم بەر پرسیە میژووییەدا شانی کلا بکا. رێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەم بارو دزخە ناسک و پر هەستەدا تەنانەت بە پیچەوانەی مەیلی دۆستەکانیشی هەنگاوی نازایانەو چارە نووس سازی هاویشت و هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستانی پیک هینا و بە دوای ئەودا لە میتینگیکی گەورەی شاری مەهابادا. ئاخرین شوینەواری حکومەتی تارانی کویر کردەوەو ئالای ئیران لە سەر بانی عدلیە داگیشرا خوارو ئالای کوردستان لە جیگای ئەو هەلکرا. نوختەی گوراتی سیاسەتی حیزبی دیموکرات لیرەوە دەست پیدەکات و لە گەل هەلس و کەوتی زەمان و باروذوخ بەرەو پیش دەروات.

**دوکتور قاسملو** لە گەل ئەوەشدا کە دەلی: « کوماری کوردستان داخوازی کومەلانی خەلک بوە» بەلام لە بارەی هەلکردنی ئالای کوردستانەوە بو چوونیکی

تری هەیە و دەنووسی:

« هێندێ کەس پرسیار دەکەن ئەگەر وایە لە کاتێکدا لە ئازەربایجان ناوی حکومەتی میللی‌یان لە سەر نابوو، بۆ چی لە کوردستان ئالای تایبەتیان بێجگە لە ئالای ئێران هەلکرد بوو و بە رەسمی ناوی دەولەتی کوماری کوردستانیان بە کار دەهێنا؟ رازێکی شاراوە نیەکە ئەو کاتە حیزبی دێمکرات کە تاقی کردنەوەی بە رێوە بەری دەزگای دەولەتی نەبوو لە هێندێ بارەوە چاوی لە یەکیەتی سوویەتی دەکرد و گوێی لە قسەکانی نوێنەرانی یەکیەتی سوویەتی دەگرت. بۆ وێنە بەرگی ئەفسەرانی سوپای کوردستان لاسا کردنێک بوو لە ئونیفورمی ئەفسەرانی لەشکری سوور. دروست کردنی ئالاش هەر لەم رووە بوو. یەکیەتی سوویەتی لە پازدە کومار پێک هاتوە و هەر کومارێک ئالای تایبەتی خوی هەیە و ئەمە هەر گیز نیشانەی داخوازی جیا بوونەوە لە یەکیەتی سوویەتی نیە. ئەگەر لە دوا رۆژدا ئێران ببێتە ولاتێکی فیدرالی، هەم کوماری فیدرالی مەرکەزی ئالای خوی دەبی کە ئالای هەموو ئێرانە، هەم هەر کام لە کومارە نەتەوییەکان ئالای تایبەتی خویان دەبێ» (١٢)

لێرەدا ئالۆزیەکی سەیر لە بۆ چوونی **دوکتور قاسملو** دا بەر چاو دەکەوێ. ناو براو ئەو هەموو تاریفەی لەم کتێبەدا لە حیزبی دێموکراتی کردوە، دەیکاتەوە هیچ. لە لایەک « دەستکردی بێگانە» رەت دەکاتەوە و بە « بوختانی» دەزانێ. «یارمەتی سوویەتی تەنیا بە عامیلێکی لەبار» دادەنێ. لە لایەکی تر حیزبی دێموکرات بە « بێ ئەزمون و بە گوێی رایەلی نوێنەرانی یەکیەتی سوویەتی» دادەنێ. بەرگی ئەفسەرانی سوپای کوردستان و «دروست کردنی ئالا» بە « لاسا کردنەوەی سوویت» دەزانێ. بە راستی خەلکی دیکەش هەر ئەو بوختانانەیان بە کوماری کوردستان کردوە. ئالوزیەکە لە بیر و بۆ چوونی **دوکتور قاسملوی** شەهید دا کاتێ زەقتر دەبێ کە کوماری فیدرالێ و خود موختاری دەکاتە یەک و پازدە کوماری سوویتی بە نمونە دێنێتەوە و گۆیا « هەر گیز نیشانەی داخوازی جیا

بوونەوە نەبوون لە یەکێتی سۆڤیتی.» خۆزیا دوکتور **قاسملو** مابایە و دیتبای کە دوای لاچوونی دێوە زمەی دیکتاتوری تەک هەر پازدە کۆمار جیا بوونەوە، بەڵکوو جیێ بوونەوە گەیشتە ناوچەکانی خود موختاریش. جگە لەوە خۆ مەسەلەی کوردستان و حکومەتی ئێران باسی فیدراڵی نەبوو تا بڵێین بە قسەی **دوکتور قاسملو** مافی ئاڵاّ هەڵکردنی هەبوە. حیزبی دێموکرات و کۆماری کوردستان بە قسەی **دوکتور قاسملو** لە خود موختاری زیاتر هیچی دیکەیان نەویستوە، جا چۆن لە گەڵ فیدراڵی و یا کۆمارەکانی ئەوسای سۆڤیتی بەرانبەر دەکرێن؟!!

دوای هەڵکردنی ئاڵای کوردستان سەرانسەری مانگی بەفرانبار، زستانی ساردی کوردستان ببوە بەهاری شادی و لە شار و گوندی کوردستان شایی و زەماوەند بوو. خەڵک خۆی بۆ جێژنی گەورە تر، جێژنی ئازادی و سەربە خۆیی ئامادە دەکرد. مەهاباد ببوە قیبلەی نەتەوەی کورد و لە هەموو بەشەکانی کوردستانی مەزن، رێبەر و نوێنەراتی گەلی کورد خۆیان گەیاند بوە مەهاباد و بە بەشداری لە ئاهەنگی راگەیاندنی کۆماری کوردی، پشتیوانی و هاو کاری خۆیان نیشان دەدا.

شاری مەهاباد هەر چەندە سەبارەت بە سیاسەتی جیوازی دانانی رێژیمی پەهلەوی شارێکی مودێرن و پێشکەوتوو خاوەنی هوتێل و میوانخانەی گەورە نەبوو، بەلاّم ماڵی هەموو نیشتمانپەروەرێکی مەهابادی بۆ پێشوازی و میوانداری لە میوانانی ئاهەنگی جێژنی سەر بە خۆیی ببوە میوانخانە و خەڵکی بە شەرەفی مەهاباد بە دڵێکی فراوان و بە روخساری شاد و بزەی سەر لێو خزمەتی میوانانیان دەکرد.

روو داوەکان بە خێرایی دەهاتن و تێدەپەرین. رۆژی مێژوویی نیزیک دەبۆوە. هەواڵدەری رۆژنامەکانی تاران بۆ ئاگاداری لە رووداوەکانی کوردستان دەهاتنە مەهاباد. رۆژنامەی کوردستان ۲۰/۱۰/۱۳۲٤-۱۱/۱/۱۹٤٦ گفتوگۆی جەنابی **قازی محەممەدی** لە گەڵ چەند رۆژ نامەنووسی تارانی بلاّو کردۆتەوە. لە وەلاّمی ئەم پرسیارەدا :« لە تاران دەڵێن کوردان بە رەهبەری جەنابت جوێ

بوونەوەو ئیستیقلالی کوردستانی دەوێ. ئایا راستە ؟ دەڵێ:

- خێر راست نیە، لە بەر ئەوەی کە ئێمە لە دەوڵەتی ئێران ئیجرای قانونی ئەساسیمان دەوێ‌و دەمانەوێ بە خود موختاری لە ژێر بەیداغی ئێراندا بژین ، خود موختاریشمان وەگیر کەوتوە.

پرسیار : ئێوە چەند وەختە خود موختارن ؟

وەڵام :چوار ساڵە خود موختاری داخیلیمان هەیە.

پرسیار: چلۆن خود موختاری خۆتان هەڵدەسورێنن ؟

وەڵام : لەو ولاتەی کە توانیومانە خود موختاری خۆمان دەکار بکەین دەگەڵ نوێنەرانی گەورەی میللەتی کورد کە چەندێک لە وەی پێش لە مەهاباد حازر بورن ئینتیخاباتمان کرد و هەیئەتێکی (٩) نەفەری بە نێوی هەیئەتی میللی هەڵبژێر دران و سەرۆکی ئەو هەیئەتە بە خۆمە.

خوێنەری بە رێز سەرنجی ئەوە بدات کە ئەم وتو وێژە پێش مێتینگی مزگەوتی سوور و پێش دووی رێبەندان و راگەیاندنی کۆماری کوردستانە. لەم گفتوگۆیەدا پێشەوا بەرنامەی حیزبی دیموکرات بۆ رۆژنامە نووسانی تاران روون دەکاتەوە.

رۆژی ٢٩ی بەفرانباری ١٣٢٤ - ١٩٤٦/١/١٩ لە مزگەوتی سووری مەهاباد کۆ بوونەوەیەکی گەورە بە بەشداری تەواوی سەرۆک عاشیرەت و خاوەن مڵک و بازاری و کەسانی ئایینی و زەحمەتکێشانی شارو گوند پێک هات. خەڵک چاوە رێ و گوێ قوڵاغی دەنگو باس و هەنگاوی تازە بوون. دوای کردنەوەی مێتینگ و خوێندنەوەی شیعری شاعیرانی میللی هەژار و هێمن و وتاری بەخێر هینان و سوپاس لە بەشدار بوانی کۆبوونەوە، پێشەوا قازی محەممەد چوە سەر مینبەر و دوای بە خێر هێنانی میوانان و سوپاسی خەڵکی مەهاباد بۆ میوانداری و خزمەتی برایانی خۆیان فەرمووی:

« کورد دوو سەد ساڵە بۆ وەر گرتنی ئازادی هەوڵ دەدا. لە جەنگی بەینەلمیلەلی رابردوودا کوردیان پتر لەت لەت کرد. بەشێک بە عیراق، بەشێک بە

سوریاو بەشێک بە روسیا، بەشی زۆریشیان بۆ تورکیا وئێران هێشتەوە. ئەم کارانە هەستی سەر بەستی کوردانی نە کوژاندەوە. کوردانی تورکیا و ئێران و سوریا زۆر لە پێشدا بۆ ئازادی هەڵستان. دوژمنەکانیش دەستیان کرد بە کورد کوشتن. ئەگەر کوردانی **بەدرخانی** پەرش و بڵاو کران، **بابانەکان** و **ئەردەلانەکان** واریدی مەیدانی کارزاری ئازادی کوردان بوون. **شێخ عوبیدوڵا، شێخ سەعید، سمایلاغا**، کوردانی تورکیا و ئارارات قیامیان کرد و چەند سەد هەزار نەفەر لەو قیامانەدا لە ناو چوون و نەتیجە بە دەس نەهات و ئەم راد مەردانە گشتیان لە سەر ئازادی مردن.

تا ئێستا چەند حیزب لە کوردستان بنیاد نراوەو بۆ ئازادی کوردان هەولیان داوەو ئەمانیش لەم پێناوەدا چەند سەد هەزار قوربانیان داوە. لە دیار بەکر دوو سەد هەزار کوردی بە ناو بانگیان کوشت وئەم ملەیە لە کوردستاندا دەوامی بوو تا وەختێ کە ئەرتەشی شاهەنشاهی لە شەهریوەری ۱۳۲۰ بڵاو بوو.

**بە بڵاو بوونەوەی دوو پەر ئاگاهی - بوو بڵاو ئەرتەشی شەهەنشاهی.**

لاوان و گەنجانی مەهاباد دەستیان کرد بە کار و مەرامی موقەدەسیان تەعقیب کرد. لە بن ئەشکەوتان. لە شیوان و لە خانوان بە دزی خڕ دەبوونەوەو فەعالیەتیان بە خەرج دا تا لکی حزبیان لە تەواوی کوردستاندا کردەوەو هەموو کوردێکیان بۆ کار ئامادە کرد و خۆشیان بە هێز کرد تا وابوو چەندە لە مەو بەر مەرامی دیموکراتیان بە دنیا راگەیاند و تەقازای خود موختاریان لە حدودی دەوڵەتی ئێراندا کرد.بەڵام دەوڵەتی ئێران بە جنێو وهەرەشە و بە تانگ و تۆپ و فرۆکە وەڵامی دانەوە. پاشان پێشەوا لە سەر قسەکانی دەروا و دەڵێ:

« دنیای ئەورۆ دنیای تەنازوعی بەقایەو هەر نەتەوەیەک دەیەوێ بۆ خۆی سەر بەست بێ.

ئەی نەتەوەی کورد! ئەگەر کوردستان بیەوێ لە رۆژی پێداویستدا چەند هەزار

لاو وگەنج موسەللەح بکاو بۆ دیفاع لە نیشتمانی خوشەویست . . . بەڕیز بابا کورد ئەو ئیستیعدادەی هەیە کە کور و خۆشەویستی خۆی بۆ مەیدانی کارزار بنێری؟ »

بە جاری دەنگی ئیتاعەت و ئامادەیی بەرز دەبێتەوە. لێرەدایە **شێخ جەلالی تاهیری** دەربەندی رادەبێ و دەڵێ:« ئەی ئاغایان سێ شت بۆ کوردستان زۆر پێویستە: یەکەم پوڵ دووەم پوڵ سێیەم پوڵ. لە سێ شتیش دەبێ دەست هەڵگرین وەک دەستمان هەڵگرتوە: یەکەم تەماع، دووەم خۆ خوری، سێیەم خۆ فرۆشی. دوای ئەو قسانە هەموو دارایی خۆشی پێشکێش بە حیزب دەکات. » (١٣)

## راگەیاندنی کۆماری کوردستان بە جیهان

لە مێژووی ژیانی هەر گەل و نەتەوەیەکدا، هێندێ رۆژی ئەوتۆ هەن کە بە نوختەی بەختەوەری و پیرۆزی گەل دژمێردرێن. ئەم رۆژانە لە مێژووی ئەم نەتەوەیەدا هەتا هەتایە بە زیندوو دەمێننەوەوە لە بیر ناچنەوە.

**رۆژی دووی ڕێبەندانی** ١٣٢٤ - ١٩٤٦/١١/٢٢ لە مێژووی نەتەوەی کوردا بۆتە ئەستێرەیەکی پرشنگدار و رۆژێکی میللی و شوێنێکی تایبەتی پڕ لە شانازی لە لاپەری مێژوودا گرتۆتەوە. راستە ئەم ئەستێرەیە لە بەشێکی نیشتمانی دابەشکراوی کورد، لە رۆژ هەڵاتی کوردستان سەری وەدەرنا، بەڵام پرشنگی هاویشتە هەموو بەشەکانی کوردستان. لە هەموو بەشەکانی ترەوە نوێنەرانی کورد بەو تیشکەوە دەهاتن و لە ئاهەنگ و شادی دا بەشدار دەبوون.

«کوردستان ببوە چرایەکی روناک و رێ نیشاندەری هەموو گەلی کورد. لە تورکیا و عیراق و سوریا کوردەکان پیرۆز باییان لە کۆماری کوردستان دەکرد

وئامادەیی خوێن بۆ هەموو چەشنە هاوکاریەک رادەگەیاند.»(١٤)

سەبارەت بە گرنگی بزووتنەوەی ١٩٤٦-١٩٤٢ی رۆژ هەلاتی کوردستان زۆر لە نووسەرانی خۆمالی و بێگانە نووسیویانە و رۆژی دووی رێبەندا و دامەزرانی کۆماری کوردستانیان لە مێژووی خەباتی نەتەوەی کورد دا بە رووداوی هەرە گرنگ داناوە. « مەهاباد لە روانگەی سیاسیەوە ببوە ناوەندێک کە هەموو کورد چاویان تێ بریبوو. کۆرە کولتوریەکانی بێروت وبەغدا و ئەستەمبول، هەر وەها کوردە چیا نشینەکان گشتیان لە سەر هەست و ئامادە بوون تا بزانن بزوتنەوەی قازی محەممەد سەر دەکەوێ و یا ناکام دەبێت. پەیام هێنەران لە هەموو دەستەو پۆلی کورد، نەک هەر کوردەکانی عیراق، بەلکوو کوردانی سوریا و تورکیاش پەیامیان بۆ دەهێنا.»(١٥)

تێکۆشەر جەلال تالەبانی لە بارەی بەرهەمی رۆژی دووی رێبەندانەوە دەنووسێ:« لە سەرە تای ١٩٤٦دا کۆماری دیموکراتی کوردستان دامەزرا. بەم جۆرە بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردستاندا جەمهوریەتێکی دیموکراتی نیشتمانی پێک هات. ئەم روو داوە مێژووییە زۆر گرنگە لە مێژووی کوردا هەموو کوردستانی هاژاند و کۆمەلانی خەلکی هەموو کوردستانی هێنایە جۆش و خرۆش. کوردایەتی زۆر تر فراوان و پتر جەماهیری کرد.»(١٦)

راگەیاندنی کۆماری کوردستان نەک هەر راستەو خۆ کاری کردە سەر هاژاندنی هەموو بەشەکانی کوردستان، بەلکوو حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستانیشی خستە بیر کردنەوەو رێکخستنی پلان و بەربەرەکانی بۆ تێکدانی.

ماموستا محەممەد رەسول هاوار لە کتێبی خۆیدا بە ناوی(کوێرەوەری و بیرەوەری)لاپەرەی ٥٩ دەنووسێ:« کە کوماری مەهاباد دروست بوو ئینگلیزەکان و میری ترسیان لێ نیشت کە لە کوردستانی عیراقیش بتەنێتەوە. لەبەر ئەوە بە هەموو جۆر هەولیان ئەدا بەربەستی بکەن و پارەیان بە راست و چەپدا بلاو دەکردەوە بو ئەوە خەلک بێدەنگ بکەن. خەبیرێکی ئینگلیزی بە ناوی( مستر

سمیث ) بە زور دەچوە سەر لیژنەی فەحصی توتنەکان‌و ئەمری پێدەکردن بە مومتازو دەرەجە یەک زیان نووسن. کە چی هەر کوماری مەهاباد روخا هەموو شتێک گوڕا. نرخی توتن کەم کرایەوە. هەر ئەو مستر سمیثە دەی شیراند بە سەر لیژنەکاندا دەیوت: ئەم توتنانە ئەو گۆنیانە ناهێنن کە تییدەکەن. کە چی توتنیش هەر توتنەکەی جاران بوو. »

ئەم کومارەی بە قەولی مام جەلال (هەموو کوردستانی هاژاند و کومەلانی خەلکی هەموو کوردستانی هێنایە جوش و خروش) لە روژی دووی ڕێبەندان لە کوبوونەوەیەکی ۲۰ هەزار کەسیدا ڕاگەیەنرا. هەر بویەش ئەم روژە بە روژی میللی نەتەوەی کورد ناسراوە و لە هەموو بەشەکانی کوردستان یادی دەکەنەوە. هەر لێرەشدایە کە هەودای پێوەندی ژێر دەستی لە گەل حکومەتی تاران دێتە قەتاندن و گورانکاری لە بەرنامەی خود موختاری حیزبی دیموکراتی کوردستانیشدا بەدی دەکری.

روژ نامەی کوردستان لە ژمارە ۱۰ی ۱۵ی ڕێبەندانی ۱۳۲٤-۱۹٤٦/۱۱/٤ لە ژێر سەر دێری «جێژنی سەر بەخویی و ئیستیقلالی کوردستان یا دروشینی ئەستێرەی خوشبەختی کوردان» دەنووسی:« روژی ۲۸ی بەفرانباری ۱۳۲٤ هەیئەتی مودیرەی هەموو لکەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان و نوینەرانی قەبایل و عەشایر و تەواوی طەبەقات لە مالیک و غەیرە مالیک هەر یەک لە چەند سەد فرسەنگ ڕێگاوە بو کانونی ئیحساساتی میللی و قیبلەی ئارەزو وروناکیدەری ئەفکاری هەموانی خویان: شاری پر ئیفتخاری میللی مەهاباد، وەکو بلبل بو لای گول و وەکو پەپولە بو دەوری چرا هاتن و کو بوونەوە....... ئەی کوردستانی مەزن ! ئەی دایکی نیشتمانی ۹ میلیون کورانی رەشیدی کورد ! سەرت لە دوشەگی بیماری و دیلی هەلێنەو نیقابی سپی بەفر لە رووی خوت هەلگرە بو کفن بو کورەکانتی واگوزار کە، ئەوەتا ئەرشەدی کورانی تو ئیعجازی کرد و ئاخر رایەل و پوی فیل و تەلەکەی نا بەکارانی لە بەر یەک

دەرێناو ژیان و خۆشبەختی بە یەکجاری تۆو کورانتی ساز و قایم کرد.........

ئەوەتا ڕۆژی دووەمی ڕێبەندان( بهمن ماه ) ۱۳۲٤ ساتی هەشتی بەیانی خۆشتر و ڕوناکتر ڕۆژانی مێژووی شەش هەزار ساڵەی تۆ گەیشتوە، لە سێ‌ڕێی قازی هێزی بە هێزی دیموکرات بە سازو بەرگ و ئەسلەحەوە لە لایەکەوە قوتابییەکانی کچان و کورانی هەموو قوتابخانەکانو لە لایەکی دی بیست هەزار نەفەر لە تەواوی طەبەقاتی نەتەوەی بەرزی کورد هەر یەک لە جێی خۆی بە تەرتیب ریزیان بەستوە و ئالای سێ ڕەنگی کوردستان لە هەموو لایەکی مێتینگەکەوە لە ڕاست و چەپی تایبەتی پێشەوای گەورە کە لە قەلبی مێتینگدا قەراری گرتوە دەلارێتەوە....»

ڕۆژنامەی کوردستان هەر لەم ژمارەیەدا بە بۆنەی (**جێژنی سەر بە خۆیی و ئیستقلالی کوردستان**)ەوە وتاری پێشەواو سەر کۆماری بەرزی کوردستانی چاپ کردوە. پێشەوا لە باسی هەڵکەوتی جوغرافیایی کوردستان و مێژووی خەباتی بێ وچان و بەر دەوامی کورد بۆ ئازادی دەفەرموێ:« کوردستان مەوقعیەتی جوغرافیاییکی مەخسوسی هەیە کە بێ پسانەوە و بێ‌ئەوەی نەتەوەو میللەتێکی کە لە نێویاندا فاسیل و لێکیان بپچڕێنەوە، کورد بە سەر یەکەوەو پێکەوە سکونەتیان تێدا هەیە و دارای مالکیەتی میللین دەوێدا. بەسەر هات و سەوابیقی تاریخیان یەکە و عومومەن تێدا شەریکن. خاوەنی ئاداب و عادات و ڕسومی میللیەکی وان کە هیچ جورە سەدەمە و حەوادسێک نەیتوانیوە سستیەک لە بناغەی میللیەتی ئەواندا پەیدا بکات.

کورد لە قەدیمڕا هەزاران پادشا و حوکمدار و تەشکیلاتیان بووە. هەر لەم کوردستانی ئازادی ئێستادا بنە ماڵەی ئومەرای موکری کە سەر سلسلەی ئەوان ئەمیر سەیفەددین بوە تا( ۱۲۰۱ی کۆچی) بیل‌ئیستیقلال یەک لە دووی یەک

**ئەمیر سەیفەددین، سارم بەگ، شێخ حەیدەر، ئەمیر بەگ، ئەمیر پاشا**، تا دەگاتە قوباد خان بە دەسەلات و قودرەتەوە حکومەتیان کردوە.

میللەتی ڕەشید و بە غیرەتی کورد لە هەموو دەورو زەمانێکدا هەر کەس خەیاڵی ئیستیلای ئیشتمانی ئەواتی بوبێ بەرەنگاری بوون بەر بەرەکانیان کردوەو لە هیچ فیدا کاریبەک دەستیان دانەنواندوە. لە پاش لە دەست چوونی سەلتەنەت و حوکمداریشیان بۆ وەگیر خستنەوەی ئیستیقلال و ئازادی بە میلیۆن قوربانیان داوە و لە بەرئەوەی کە هەمیشە لە موبارەزەو ملە دابوون هیچ جورە ئەزیبەت و ئازارێک نەماوە نەی چێژن و نەی بینن.

لە گەڵ ئەوەش هەموو کوێرەوەری‌و کوشتن و برینێکیان تەحەمول کردوەو قەت لە ئامانج و ئارەزووی خۆیان شل نەبوونەوە و لە ڕێی وەدەست خستنەوەی ئازادیدا وچانیان نەداوە. بە دڵێکی ئەوەندە بە هێز وعەزمێکی هێندە سابیتەوە تێکۆشاون تا ئێستا هێزێکی وا پەیدا نەبوە بتوانێ تێکڕا خەفەیان بکا، میرە کوێرەیان کوشتوە بابان سەریان هەڵداوە، بابانیان بێدەنگ کردوە ئەردەڵان بڵێند بوون، ئەوانیان لە عەرزی داوە بیتلیسی بەرز بوونەوە و هەزاری دیکەی وەک ئەوان.

تا لەو دواییانەدا لە پاش شەری بەینەلمیلەلی پێشووە کە دیکتاتۆری ئێران و تورکیا هاتنە سەر کار و زمان و عادات ومەزهەب و خوسوسیاتی میللی کوردیان بە جارێک لاواز و کزو کەنەفت کرد، لە هیچ وەحشیەت ودڕندەییەک ڕانەوەستان، خوێندن و نووسینی زمانی کوردی مەمنوع و پۆشینی لیباسمان قەدەغە بوو. نەیاندەهێشت لە هیچ جورە مەزایا وحقوقێکی بەشەرییەت بەشمان ببێ، ڕێگای فێر بوونی عیلم و سەنعەتیان لێ بڕیبوونەوە. هەر ڕۆژە بە بەهانەیەک و هەر دەمەی بە تەشقەڵەیەک دەستە دەستە و پۆل پۆل کوردی هەژار و بەدبەختیان حەپس و تەبعید دەکرد و دەیان کوشت و لە بەینیان دەبردن حاسڵ و دەسترەنجی ئەو میللەتە بێچارەیان دەبرد بۆ خۆیان و ئەوانیشیان برسی و تینوو ڕووت و قووت دەهێشتەوە.

تا لە شەهریوەری ١٣٢٠دا فریشتەی ئازادی دەستگای دیکتاتۆری و فاشیستی ڕەزاخانی تێک شکاند. کورد سەری لەو هەموو فشار وئەزیبەتە کەمێ فارغ بوو،

فەوری ئیحساسی کرد چۆن دەبێ لە فورسەت ئیستیفادە بکات. ورنگای سەلاح و وەدەست خستنی ئازادی ئەو میللەتە چیە و چبکا. پیاوانێکی بە بیر و هۆش وبە شەرەف کە زۆر لە مێژ بوو خوێناوی دڵی خۆیان دەخواردەوە و بۆ زەلیلی ئەو میللەتە دوکەڵ لە دەرونیان دەهاتە دەرێ زۆر زوو تەشخیسیان دا کە وەختی کارە و لەو فورسەتە دەبێ بەهرە وەر گیرێ و ئەوە تەواو ئەو رۆژەیە کە پشتاو پشتمان چاوە روانی بوون. یەکجارو خێرا، بێوچان و راوەستان، دەستیان بە کارکرد حیزبی دێموکراتی کوردستانیان تەشکیل داو بە دەستو برد خەریکی کارو باری میللی بوون و بە چاوێکی وردو بە دیقەت ئیحتیاج و پێداویستی کوردیان تەشخیس دا و بەدی کرد......

پێشەوا پاشان لە وتاری خۆیدا باسی لابردنی ئیختیلافاتی عەشایری و دانانی مەدرەسەی کچان و کوران و چاپی کتێب و خوێندن بە زمانی کوردی و دانانی چاپخانە و دەرکردنی گۆڤارو رۆژنامە و رێگا دۆزینەوەی بازرگانی ئابووری کوردستان‌و پێک هێنانی هێزی بەرگری میللی دەکاو دەڵێ:... دیارە موەفەقییەتی ئێمە سەراسەر لە عەینی مەرامی دێموکراسی و لە نەتیجەی فەعالیەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان و بە پشتیوانی عالەمی دێموکراتە لە بەر ئەوە دەڵێین: بژی مونەسیبینی دێموکرات.

میللەتی کورد هەزاران سەد و بەر هەڵستی سەخت و سەهەندەی لە رێدا بوو دەستەو دایرەی دیکتاتۆری بێ وچان کار شکێنی ئێمەیان دەکردو لە هیچ نامەردیەک رانەدەوەستان. ئیختیلافاتی عەشایر بۆ داخلیش ئیشکالێکی گەورە بوو بۆ ئێمە. ئەمما ئەوانە هیچ کامێکیان نەیانتوانی پێش بە ئێمە بگرن بە دڵێکی بە هێز پایەداریمان کرد و ئیدامەمان بە فەعالیەتی خۆمان دا تا ئیستیقلاڵ و ئازادی نەتەوەی کوردمان وەدەست هێنا...»

لە گەڵ داوای لێبوردن لە کورت کردنەوەی وتاری پێشەوا داوا لە خوێنەری بە رێز دەکەم بۆ شارەزایی تەواو و چێژە وەر گرتن لە ئاهەنگ و شایی و مەراسیمی

رۆژی دووی ڕێبەندان، ڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان و بۆ ئاگاداری لە وتاری ئەغاو سەرۆک عاشیرەت و ئەندامانی ڕێبەرایەتی حیزب و شتی تر، بڕوانێتە کتێبی( حکومەتی کوردستان- کورد لە گەمەی سۆڤیێتیدا) نووسینی **نوشیروان مستەفا** ئەمین کە بە شێوەیەکی لە ڕادە بەدەر جوان و ڕازاوە و سیستماتیک تەواوی کۆ کردوونەوە و چاپی کردوون.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم جارێکی دیکەش هێندێ خاڵی گرنگ بخەمە بەر چاوی خوێنەری بە ڕێز کە لە کتێبی کاک نوشیروانیشدا هاتوون و لە لاپەڕەکانی پێشووشدا باسێک لەو مەتلەبە کراوە کە پێوەندیان بە وشەی( خودموختاریەوە ) هەیە کە هێندێ لە نووسەرانی کورد بە ناهەق بە وشەی (کۆمار)ی کوردستانیەوە دەلکێنن :

- هەڵکردنی ئاڵای کوردستان و کۆتایی پێهێنان بە دەسەڵات و شوێنەواری حکومەتی ناوەندی تاران. ئەمە پێم واتیە لە گەڵ دابی خود موختاری ڕێک بکەوێ. ئەو کەسانەی بە بیانووی ئەوە کە گۆیا (ناوچەی خود موختاریش ئاڵای خۆی هەیە)دەیانەوێ لە گرنگی ئەم ڕووداوە مێژووییە کەم بکەنەوە، نابێ لە بیریان بچێ کە پێک هێنانی خود موختاری خۆی پێویستی بە موافەقەتی حکومەتی ناوەندی و بزووتنەوەی ناوچەی خود موختار هەیە.

- پێک هێنانی هەیئەتی ڕەئیسەی میللی کوردستان). من وای بۆ دەچم کە ئەم ئۆرگانە لە پێش دامەزرانی کۆماری کوردستان و دیاریکردنی حکومەتی میللی کوردستان واتە کابینە یا هەیئەتی وەزیران هەڵبژێراوە. دەبێ ئەم هەیئەتە لە جێگای مەجلیسی میللی دانرا بێ. ئەوەتا پێشەوا لە وەڵامی ڕۆژنامە نووساندا دەڵێ:« دەگەڵ نوێنەرانی گەورەی میللەتی کورد کە چەندێ لە وەی پێش لە مەهاباد حازر بوون ئینتیخاباتمان کرد و هەیئەتێکی(٩) نەفەری بەتێوی هەیئەتی میللی هەڵبژێردران و سەرۆکی ئەم هەیئەتە بە خۆمە.

هەیئەتی ڕەئیسەی میللی (٩) کەس بوون و بەڵام هەیئەتی وەزیرانی کۆماری

کوردستان ١٤ کەسن. چەند کەس لە ئەندامانی هەیئەتی رەئیسەی میللی لە هەیئەتی وەزیراندا نین و چەند کەسیش لە وەزیران ئەندامی هەیئەتی رەئیسەی میللین. وا دیارە هەیئەتی رەئیسەی میللی هەر دوای کۆنگرەی حیزبی دیموکرات هەڵبژێراون. وەک مامۆستا هێمنی رەحمەتی باس دەکات، دەبێ پێش هەڵکردنی ئاڵای کوردستان دامەزرا بێ. « حیزبی دیموکراتی کوردستان کۆڕێکی بە ناوی ( هەیئەتی رەئیسەی میللی) هەڵبژارد کە منیش یەکێک لە وان بووم لە ئەندامەکان.. » (١٧)

کە وابوو ناکرێ هەیئەتی رەئیسەی میللی کوردستان لە گەڵ هەیئەتی وەزیرانی کۆماری کوردستان،واتە (کابینەی دەوڵەتی) بکەینە یەک. هەیئەتی رەئیسەی میللی دەکری بە شێوە پارلمانێن حیساب بکری .

**- دامەزرانی کۆماری کوردستان و ئایینی سوێند خواردنی سەر کۆمار و وەزیران.:**

« ئەمن بە خودا، بە کەلامی عەزیی خودا، بە نیشتمان، بە شەرافەتی میللی کورد، بە ئاڵای موقەدەسی کوردستان سوێند دەخۆم کە تا ئاخر هەناسەی ژیانم و رژاندنی ئاخر تنۆکی خوێنم بە گیان و بە ماڵ لە رێی راگرتنی سەر بە خۆیی و بەرز کردنەوەی ئاڵای کوردستاندا تێدەکۆشم و نیسبەت بە رەئیسی جمهوری کوردستان و یەکێتی کورد و ئازربایجان موطیع و وەفادار دەبم. »(١٨)

گۆڤاری هەلاڵە لە ژمارە ١ ساڵی ١٩٤٦ لاپەرەی ٧٠دا کە سوێند خواردنی پێشەوای چاپکردوە و ئەم دێرەی ئاخری (وەفا داری بە رەئیس جەمهور و یەکێتی کورد و ئازربایجانی) تێدا نیە. هەر دەبێ ئەوەش راست بێ. ناکری پێشەوا ' خۆی بڵێ بە رەئیس جەمهور وەفادار دەبم. مەگەر ئەوەی سەرەوەیان سوێندی وەزیرەکار بێ .

- بریاری کۆبوونەوەی گشتی دووی رێبەندان:

«ئەمە نوماینیدانی تەواوی طەبەقات و کوردانی شیمالی کوردستان لە

میتینگێک کە لە شاری مەهاباد سازمان کردوە و ژمارەمان ۲۰ هەزار نەفەرە، ئەورۆ ئارەزووی عمومی خۆمان ئیظهار دەکەین و لە کومیتەی مەرکەزی حیزبی دیموکرات و ئەنجومەنی خۆمان خواهیش دەکەین و ئیختیاری دەدەینێ:

۱ - لەو جێگایانەدا کە ئێستا کوردی تێدا دەژین بە ئیستیقلالی تەواو بگا.

۲ - ئینتیخاباتی مەجلیسی شورا دەست پێ بکەن

۳ - حکومەتی میللی کوردستان ووەزیران و ئیدارەکانی ساز بکەن

٤ - هێزی موسەللەحی میللی کورد تەشکیل بدەن

٥ - لە گەڵ دەوڵەتانی هەمسایە رابیتەی تیجارەتی و ئیقتیسادی بەر قەرار بکەن

٦ - لە گەڵ برا ئازەربایجانیەکان هاوکاری و دۆستایەتی مەحکەم بکەن (۱۹)»

- سازدانی هێزی پێشمەرگە و رێکخستنی هێزی بەر گری و گۆڕینی ناو و پلەی ئەفسەران و تەشکیلاتی ئەرتەشی

- پێک هێنانی دەوڵەتی کۆماری کوردستان لە ١٤ وەزیر بە چەشنی خوارەوە

۱ - سەرەک وەزیر - **حاجی بابە شێخ**

۲ - وەزیری بەر گری - **حەمە حوسێنخانی سەیفی قازی**

۳ - وەزیری نێو خۆ - **حەمەدەمینی موعینی**

٤ - وەزیری ئابووری - **ئەحمەدی ئیلاهی**

٥ - وەزیری پۆست و تێلگراف - **کەریمی ئەحمەدەین**

٦ - وەزیری تەبلیغات - **سەدیقی حەیدەری**

۷ - وەزیری کار - **خەلیلی خوسرەوی**

۸ - وەزیری بازرگانی - **حاجی مستەفای داودی**

۹ - وەزیری کشت وکاڵ - **مەحمودی وەلی زادە**

١٠ - وەزیری رێگاو بان - **سمایلی ئیلخانیزادە**

١١ - وەزیری لەشساخی - **سەید محەمەدی تەهوویان**

١٢ - وەزیری فەرهەنگ - **مەناقی گەریی**

١٣ - وەزیری مشاویر - **عەبدولرەحمانی ئیلخانیزادە** - (ئیگلتون بە وەزیری دەرەوەی ناو دەبات )

لە (کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری) دا،«دانانی نووسەر» **ماموستا مەلا حوسێنی مەجدی** بە وەزیری داد ناو براوە. بەڵام لە رۆژنامەی کوردستاندا ناو براو بە رەئیسی عەدلیە ناوی هاتوە. دیارە نووسینەکەی من تەواو نەبوە.

بە کورتی ئەم داب و دەستور و تەشکیلاتە وا ویندەچی زیاتر لە ئەو ( خود موختاری )یەی کە بۆی هەڵدەبەستن قاچی راکێشا بێ. پێم وانیە لە جیهاندا دیاردەی ئاوا رووی دابێ کە ولاتێکدا رژێمی پاشایەتی بێت و لە قوژبنێکی ئەم ولاتەشدا (کۆماریکی خود موختار) بە هەموو تەشکیلاتێکی دەولەتی و تایبەتی جیا لە تەشکیلاتی ناوەندی دابمەزرێ.

یا ساخبوونەوەی ئەم داموو دەزگایە بۆ بیروڕای مێژوو نووسانی کورد و روو بوونی فاکت و بەڵگەی زیاتری سەردەمی کۆماری کوردستان بە جێ بێلین.

بەڵام لێ ورد بوونەوەیەکی تەرکیبی هەیئەتی وەزیرانی کۆماری کوردستان مرۆ دەخاتە سەر ئەم بیرە کە بەم هەڵبژاردن و دامەزراندنە. گەرای ناکۆکی و تەشەنە کردنی ناتەبایی لە نێو دامەزراوەی سیاسی کۆماردا دەگووری.

یەکەم - بێجگە لە سەدیقی حەیدەری هیچ یەک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک ئەندامی هەیئەتی وەزیران نین.

دووەم - بێجگە لە دوو ئاغای ئیلخانیزادە هیچ یەک لەو خاوەن مڵک و سەرۆک عەشیرەتانەی کە لە یەکەم کۆنگرەی حیزبدا بەشدار بوون و زۆریشیان بوونە ئەندامی کومیتەی ناوەندی لە هەیئەتی دەولەت دا بەشدار نین و بە کردەوە

لە دەسەلات دوور خراونەوە. ئەگەر سەیرێکی ئەو کەسانەش بکەین کە لە رۆژی ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستاندا وتاریان داوەو سینگیان ڕەپێش خستوە، هەموویان ئاغا و سەرۆک عاشیرەت بوون کە دوای پێک هێنانی حکومەتی میللی لە دەسەلات دا بەشدار نین و چوونەوە سەر ئاغایەتی خۆیان.

لە بارەی بەشداری ئەم دوو ئێلخانیزادەش ئیگلتون دەنووسێ :

«هێناتە نێو کابینەی ئەم دوو نوێنەری خاوەن نفوزی بۆکانی لە عێلی دێبۆکری کە رەقیبی قازی بوون لە ڕوانگەی سیاسیەوە پێویست بوو.... بەم چەشنە دەسەلاتی حکومەت لە مەهاباد کەوتبوە دەست بنەماڵەکانی دەست ڕۆیشتوو یا ژێر نفوزی ئەوان. ئەم دەستەیە لە گەڵ مەسەلەکانی سیاسی و ئابوری پارێزکارانە و قەدیمیانە بوون و جگە لە مە هیچی تر لە وان چاوە ڕوان نەدەکرا. بەلام لە ڕوانگەی کۆمەلایەتی وکولتوری‌یەوە پێشکەوتوو بوون. ئەگەر بە ئینسافەوە چاو لێ بکەین، دەبێ بیژین کابینە بزووتنەوەی میللی کوردی بە باشی خستبوە ژێرچاوە دێری و ڕێبەرایەتی دەکرد و شاری مەهابادی باش بە ڕێوە دەبرد. بەلام ناوچەی گرنگی ورمێ و لە خوارووش سەقز و سەر دەشت لە ژێر دەسەلاتی ئەواندا نەبوو. لە کوردستانی گەورە و لە دەرەوەی سنووریش نوێنەرێک لە کابینەدا نەبوو. کابینە نەیتوانی کەسانی هەلبژاردەو هەلکەوتووی عێل و عەشایر بێنێتە نێو خۆی. دیارە ئەوە بەو مانایە نە بوو کە تەنیا دەستەیەکی مەهابادی دەیانەوێ گشت کارەکان لە دەستی ئەواندا بن و خۆیان بە سەر هەمواندا بسەپێنن.»(٢٠)

یەکی دیکە لە نووسەرانی بێگانە کە خۆی تا ڕادەیەک بە مەسەلەی کوردەوە ماندوو کردوە لەم بوارەدا دەنووسێ:

« ڕۆژی دووەمی مانگی کوردی «ڕێبەندان» یا بیست و دووەمی ژانویەی ١٩٤٦ قازی محەمەد لە کاتێکا لیباسی نیزامی لە بەر دابوو، بەلام مێزەری تایبەتی ڕوحانیانی هەر پاراستبوو لە بەرانبەر کۆمەلێک لە گەورە پیاوانی شار و سەرۆک عەشیرەتان دامەزرانی کۆماری کوردستانی ڕاگەیاند. جەوهەر و

کوشراوەی قسەکانی **قازی محەممەد** ئەوە بوو کە کورد نەتەوەیەکی جیاوازە و مافی دیاریکردنی چارە نووسی خۆی هەیە. وەخەبەر هاتوە و دۆستی بە هێزیشی هەیە. یەکێک لە ئەفسەرانی رووسی لە دوورەوە شاهید و چاوە دێری ئەم ئاهەنگە بوو. ئەو لەم کۆبوونەوەیەدا هاو بەشی نەکرد چونکە بە پێچەوانەی سەلیقەی یەکێتی سۆڤیێتی بوو کە ئەوان زیندەیی یا سەر پشکی بۆ ئازەربایجان قایل بوون.»(٢١)

ئەم بۆ چوونە کە دامەزرانی کۆماری کوردستان بە پێچەوانەی سەلیقەی رووسەکان بوە، بۆ چوونێکی راستە. ئەوان بە تایبەت **جەعفەر باقروف** و ئەفسەرانی کار بە دەستی ئازەربایجانی شورەوی هەر لە سەرە تاوە لایەنگری ئەوە نەبوون کە لە کوردستان دەسەلاتێکی نەتەوەیی کورد لە گوێن حکومەتی ئازەربایجان دابمەزرێ. ئەم بیروڕایە لە قسەکانی **باغروف** لە کاتی سەفەری دووەمی رێبەرانی کورد بۆ باکۆ دیاریان دابوو. بەلام هەم ئەو دەم و هەم لە پاشانیش **قازی محەممەد** نەچوە ژێر باری ئەم ئامۆژگاریە شوڤێنیستیە و داوم ودەزگای سەربە خۆی کوردیان دامەزراند.

«لە چاو پێکەوتنی هەیئەتی کورد لە تەوریز رووسەکان پێیان گوتن دەیانەوێ بزانن کۆماری کوردستان بۆ چی و بە کام بۆنەوە دامەزراوە. **قازی محەممەد** بۆ تەوریز بانگ کرا و روونی کردەوە کە ( **پەرماکۆف** ) لە دامەزران و راگەیاندنی کۆماردا شاهید و چاوە دێر بوە. رووسەکان وتەی پێشووی خۆیان دووپات کردەوە. کە رێگای وەدیهاتنی ئاواتی میللی خەڵکی کورد تا ئازاد بوونی عیراق و تورکیا یەکێتی و رێک کەوتنە لە گەڵ ئازەربایجان.» (٢٢)

**ئیگلتون** درێژ تر باسی ئەم مەسەلەیە دەکا و دەنووسێ:

« ئەفرادی رووسی لە تەوریز بوون. خەبەریان بە **قازی** دا کە لە گەڵ بەر پرسانی حکومەتی مەهاباد بێتە تەوریز و لە گەڵ **میرزا ئیبراهیموف** وەزیری فەرهەنگی ئازەربایجانی شورەوی و ژەنراڵ **قولیوف** وتو وێژ بکا.

سەر کۆمار **قازی محەممەد**، سەرۆک وەزیر **حاجی بابە شێخ**، وەزیری جەنگ **سەیفی قازی**، **مەنافی کەریمی** وەزیری فەرهەنگ، سەید **محەممەدی تەیوبیان** وەزیری لەشساخی، **عەبولای قادری** سەرۆکی عێلی قادری مامەش، **کاکە سواری** مەنگور و **کاک هەمزەی ئەمیر عەشایری** مامەش چوونە تەورێز.

لەوێ **میرزا ئیبراهیم ئۆف** وتاری دا و بەرژەوەندی و ئیستیفادەی یەکێتی کورد و ئازەربایجانی روون کردەوە. هەر وەها ئەوەشی وەبیر هێنانەوە کە ئاواتی ئێوە کاتێ وەدی دێ کە لە گەڵ خەباتی کوردەکانی عیراق و تورکیا بۆ ئازادی یەک بگرێت. پاشان پرسی :« کێ رێگای بە ئێوە داوە کە حکومەتی سەر بە خۆ دابمەزرێنن »؟

وەڵامی ئەوان هەر وەک پێشوو گوتیان « **بەرماکۆف**» لە سەرەتاوە ئاگادار بوە. رووسەکان لە سەر ئەوە پێیان دادەگرت کە قازی نەیتوانیوە ماوەیەک خۆ رابگرێ و هەموو شتێکی ئاشکرا کردوە. ئەم مەسەلەیان دەهێناوە کە: « ئەخۆش پێویستە بە گوێرەی رێنوێنی دوکتور بجوڵێتەوە.»

**سەیفی قازی** و **حاجی بابە شێخ** لە گەڵ ئەم بیرورایە نەبوون. ئەوان بە ژێر بێژی بەڵگەیان دەهێناوە و دەیانگوت: ئێوە خەڵکی رووسیە لە ئێمە پێشکەوتوو ترن. هاواری ئازادیخوازیتان دنیای پر کردوە. ئێمە بە گوێرەی قسەکانی ئێوە بزوتووینەوە. جگە لەوە راگەیاندنی کۆماری کوردستان ویستی خەڵک بوە و کاری شەخسی ئێمە نەبوە. ئێوە دەڵێن کە لە بەرانبەر ویستی خەڵک دا وێستا باین و بە پێچەوانەی ویستی خەڵک جولابایینەوە؟ ئەگەر دەڵێن خەڵکی کورد میللەتێکی موحتاج و بێ هێزە و پێویستە پشت بە دەسەڵاتێکی بێگانەوە ببەستێ، کە وابوو بۆ چی سەر لە نوێ نە چینەوە ژێر دەسەڵاتی ناوەندی تاران.؟

رووسەکان داوایان لەم هەیئەتە کرد کە ٢٤ سەعات سەفەرەکەیان وە دوا بخەن تا وەڵام لە باکۆوە دێتەوە. راست لە کاتی خۆیدا وەڵام هاتەوە کە « کوردەکان

دەتوانن حکومەتی سەر بە خۆی خۆیانیان هەبێ.»(٢٣)

لێ ورد بوونەوەی رەوتی رووداوەکان تا رادەیێک وا نیشان دەدا کە دەست تێوەردانی بێ جێی کاربەدەستانی ئازەربایجانی شورەوی بە هاو دەستی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی ئێران، کەمتر لە سیاسەتی حکومەتی تاران ژانە سەری بۆ رێبەرانی کۆماری کوردستان پێک نەهێناوە. ئەوان هەولی ئەوەیان بوە کە کوردستانی ئێران لە چوار چێوەی حکومەتی ئازەربایجاندا بتوێننەوە. و بیکەن بە فەرمانداریەکی ئازەربایجان.

ئەم هەلوێستەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لە بەرنامەی حکومەتی میللی ئازەربایجان و لە کێشە ساز کردنی شارەکانی هاو سنوری کوردستان وەک میاندواو ورمێ و سەلماس وماکۆ و خۆ و تەنانەت هەوشار و سایتقەلاش خۆ دەنوێنێ. ئەم هەلوێستە لە نامەی رەئیسی ستادی هێزی دیموکراتی میاندوا بە جوانی نیشاندراوە. ئەمەش دەقی نامەکەیە : « وەزارەتی هێزی کوردستان - مقام محترم معاوەنتی فەرماندەی کل قوا

لە پاش عرض سلام بە عرضت دەگەینم اگر لە خصوصی اوضاعاتی ستاد هیزی میاندواو سوآل بفرموی روژانە مرتبا مشغول کارین و میرزا سلطان کە بو سابلاغی رویوە جاری نە هاتوتەوە. و جناب حاجی سید عبداله افندی دەگەڵ کوری سید طە هاتنە ایرە لە پاش شەویک معطلی بو طرفی مراغە حرکتیان کرد گویا بە خطی توریزدا بو مالی خویان دەچنوە و حضرت رئیس جمهوریش بە توسط ستاد هیز میاندواو لە اسماعیل شیخ آغائی نوسیوە کە روژی ٢٤/١١/١٧ دەبی خوی لە سابلاغ معرفی بکا منتظرین کە ئەو رو حرکتی بکا لازم بو بە عرضت بگەینم وە فرماندە پول ساینقلا نوسیویتی کە اهل هوشار و ساینقلا لە دست حزبی دیوکرات آزربایجان شکایتی لە ایمەدەکن ایمە کە مائموری خومان دەنیرین جوابمان نادەنەوە.آیا ایمە حقی تیر خالی کردنمان هەیە یا خیر امن لە جواب‌وی نوسیمەوە کە ابدا بهیچ جور حقی تیر خالی کردن و یا کوشتن نیە بو گزاریش نەوشم بە

عرضت گەیانت.وە تەواوی افسرانی ستاد هیز مياندواو عرض و سلامت بخدمت دەگەیتن. رئیس ستاد هیز دیموکرات میاندواو - اسحاقی »

رۆژنامەی (رەهبەر) چاپی تاران لە ژمارەی ١٢ی مانگی مای ١٩٤٦ نامەی هەزاران کەس لە روناکبیران و لاوانی خەڵکی سنەو کرماشانی بەم دەقەی خوارەوە بلاو کرد بۆوە : « جەنابی قازی محەممەد! روناکبیران ولاوانی ئازادیخوازی ناوچەکانی سنەو کرماشان هیواو هومێدیان بە جولانەوەی ئێوە هەیە. هەزاران پیرە مێرد و پیرێژنی زەحمەتکێش. هەزاران دیهاتی و شارستانی کە لە چنگالی زاڵمانەی مستێ بێ شەرەفی خوێنخۆردا دەچەوسێنەوە، بە چاوی بە ئەسرینەوە چاوی هیوایان بڕیوەتە مەهاباد و هەموو بە دەنگی بەرزەوە ئێژن : « ئەی برایانی قارەمانی کورد، ئەی ئەو کەسانەی کە بە دنیاتان راگەیاند کە مافی میللەتان نادرێ، بەڵکوو دەستێنرێ، ئێمەش نەجات بدەن و لە ئامێزمان گرن»

## دەست بە کار بوونی حکومەتی میللی کوردستان و هەنگاوە پێشکەوتوەکانی:

سەرەرای تەنگ و چەڵەمەی نێو خۆ و ئاژاوە نانەوەی ئازەربایجانیەکان لە سنوور و شارەکانی ژینگەی هاو بەشی کورد و ئازەری و ناتەواوی داهات و دارایی و هەرەشەو لەشکر کێشی حکومەتی تاران، حکومەتی میللی کوردستان دەستیکرد بە هێندێ ئیسلاحاتی کۆمەلایەتی و دانانی هێندێ یاساو قانوونی پێشکەوتوانە و دامەزراندن و رێک و پێک کردنی هێزی چەکدار و رێکخستنی کارو باری ئیداری حکومەتی.

وەک دەزانین یەکێ لە بەندەکانی بەرنامەی حیزبی دیموکرات بە رەسمی کردنی زمانی کوردی بوو لە قوتابخانەو لە ئیدارەکانی دەوڵەتی. خوێندن لە

قوتابخانەکان کرا بە کوردی و لە ئیدارەکانی حکومەتیش نووسین بە کوردی دەستپێکرا. هەر چەندە پێشتر کەس بە کوردی نەینووسیبوو. دەرس گوتنەوەش بە کوردی دژوار بوو، بەلاْم هاتنی هێندێ لە ماموستایانی نیشتمانپەروەری کوردستانی خوارو یارمەتیەکی باش بوو بۆ دەرس گوتنەوەی قوتابخانەکان. لە سەر فەرمانی پێشەوا خوێندن بۆ مندالاْنی تەمەن حەوت سالْی بوو بە ئیجباری، بۆ گەورە سالاْنیش مەدرەسەی شەوانە دانرا. بریار درا کە مندالْی بێ سەر پەرست و سوالْکەر کۆ بکرێنەوە و پێیان بخوێنن. ناوی مەدرەسەکان کە پا شماوەی شوێنەواری رێژیی شوومی پەهلەوی بوو، کران بە کوردی. بە دەستوری پێشەوا رەئیس جمهوری کوردستان مەدرەسەی پەهلەوی بە نێوی مەکتەبی کرمانجی کوردستان نێو دار بێ. ( رۆژنامەی کوردستان ژمارە ۱. رێبەندانی ۱۳۲٤)

تا ئەو دەم مەلای کورد پێی وابوو ئەگەر خوتبەی جومعە بە کوردی بخوێنێتەوە وەر دەگەرێ. مەلا شوکرانەی خوداشی بە کوردی تەدەکرد. « بە ئەمری پێشەواو رەئیس جەمهوری بەرزی کوردستان لە لایەن حیزبەوە بە جەنابی ماموستا مەلا حوسێنی مەجدی امام جمعە و سەید محەمەدی حەمیدی ئەمر دراوە کە خوتبەی جمعە لە سەر دەستوری ژێرو تەنزیم بکرێ. مبارزە دەگەڵ خورافات و ئیحترامی قانون و دین، بهداری و ایجاد بیمارستان، تەسیری ئەمنیەت لە سەر کەوتنی نیشتماندا، تەمەدونی کوردستانی قەدیم، اعتماد بە نەفس و ئەهمیەتی سەربازی وەزیفە و بوونی ئەو. ژن دەبێ لە جامعەدا چلون بێ رێگاو مەنفەعەتی ئەوی، تهیەی کودکستان. چلون دەبێ پیش بە تەراخوم بگیرێ، روحی سەلەحشۆری، وەحدەتی ملی، عواقبی تبە کاری، سخن چینی و دوو زبانی. دەستور دراوە جەنابی امامی جمعە ئەمانە رەچاو بکاوخرتیەی دیهاتیش لەم دەستورە پشتیوانی بکا.» ( کوردستان ژمارە ۱. ۱۵ی رێبەندانی ۱۹٤٦)

« له سەر قەراری کومیتەی مەرکەزی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە تەواوی مەئمورینی حکومەتی کوردستان رادەگەیەندری هەر کەس لە هەر مەمەریکەوە بە هەر نیونک لە ئەمنیک تا چەند ئەمن بو هەلسوراندنی کاریکی(چ شەرع و چ قانونی و غەیرە) بەرتیل ریشوە بدات و یا وەر بگریٚ، له پاش مەعلوم بوون، بە خاینی ملت و مەملەکەت دەناسری قەراری مجازاتی ئەو کەسانەش لە ۱۰ سال حەپس هەتا کوشتن (اعدام) تصویب و مقرر کراوە» (کوردستان ژمارە ۱۲ ریبەندانی ۱۹٤٦)

«له سەر دەستوری وەزیری بەرزی جنگ بە تەواوی برایانی کورد و هاو نیشتمانانی کوردستان رادەگەیندریت کە هەر گاە کاریکی خلافی اصولی دیموکراسی و برایەتی لە لایەن مەئمورانی هیزی کوردستان بەر لە پیشمەرگە یا ئەفسەر نسبت بە افرادی نەتەوەی کورد روو بدات و یا داوای رشوە و غیرە بو پیک هینانی کار و بار بکەن پیویستە بە زوویی مقاماتی هیز و ایدیکە لە حقیقەتی موضوع ئاگادار بفەرموون والا بە پیچەوانەی ئەو بەخشنامە اگر رفتار بکری قطعا مجازاتی هەر دوک لا بە اندازەی یەک دەبی» ( کوردستان ژمارە ۵۹ جۆ زەردانی ۱۹٤٦)

« لە لایەن وەزیری بهداری کوردستانەوە راگەیەنراوە کە ئەوانەی فەقیر و دەست نەرویون نامەی ئیدارەی شارداری لە مەر هەژاری خزیان وەر گرن بە خورایی معالجە دەکرین و دەر مانیان دەدریتی» ( کوردستان ژمارە ٦٨ پوشپەری ۱۹٤٦)

« کیشان بۆ محاکەمە - ئەحمەدی بابانزادە کە کراوەتە سەرۆکی گومرگی خانی (لاجان) بە تاوانی صادر کردنی چەند جەوازی غەیرە رەسمی و جەعلی لە سەر کار دەر کرا و بۆ دادگایی کردن بانگ کراوە. » ( کوردستان ژمارە ٥٤ جۆ زەردانی ۱۹٤٦)

لە ژمارە ٤١ی شەمۆ ۹ی بانەمەری ۱۳۲۵ - ۲۹ی آوریلی

**١٩٤٦ی ڕۆژنامەی کوردستان دا ، یاسای سزادان چاپکراوە، بۆ بەراورد و پێکگرتن لە گەڵ بارودخی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کورد دوای نیزیکەی ٥٠ ساڵ لێرەدا بڵاوی دەکەینەوە :**

**تەصویبی قانونی مجازات** : بەرابەر بە ئەمریەی ژمارە ١٦٠٧ - ٢٥/٢/١ی کومیتەی مەرکەزی حیزب و دیوانی حەربی هێزی دیموکراتی تەشکیل و قانونی موجازاتیش وەک لە خوارەوە نووسراوە تەسویب بوو:

**قانون: مادە ١** - جاسوسی کە بە بەقین گەیشت جەزای ئەو ئیعدامە ئەمما ئەگەر دەلیلی تەخفیف لە کاردا بێن تەواوی دارایی ئەو کەسە دەبێتە هی دەوڵەت. یان زیندانی بە کار لە شەش مانگەوە تا مردن.

**مادەی ٢** - مەستی و هەرزەیی لە دەرزۆەوە تا یەک مانگ زیندانی لە گەڵ کارو لە پەنجا تا دووسەد قەمچی هەر نۆبەی لە پەنجا قەمچی زیاتر نەبێ.

**مادەی ٣** - دزین یا لە نێو بردنی ماڵی دەوڵەت لە چاو ئەو گوناحە کە کردوویە ئیعدام یا هەڵ گرتنی دارایی ئەو کەسە بۆ دەوڵەت و یان زیندانی بە در لە دوو مانگەوە تا مردن و لە هەموو حاڵدا دەر کردن لە خدمەت. کەسانێک کە بە تفەنگو یان ئەسلەحەیەکی شەر جەردەیی و رێگری و یان دزی بکەن ئەوانیش جەزایان هەر وایە.

**مادەی ٤** - زۆر هێنان بۆ هاو سەر یابۆ کەسانی دی یەکساڵ زیندانی بەکارو لێ ئەستاندنەوەی ئەوەی کە سەندوویە.

**مادەی ٥** - تریاک کێشان بێ بەش بوون لە تەوای حقوقی مەدەنی ئەوانەش کە لە سەر خزمەتن ئەگەر لە دوایە فێری تریاک بن لە دوای یەک ساڵ زیندانی بەکار لەسەر خزمەت دەردەکرێن.

**مادەی ٦** - هەڵاتن لە شەرداو ئەسلەحە بە دوژمن دان جەزای ئیعدامە.

**مادەی ٧** - خەیانەت بە میللەت یا بەدەوڵەت یان نیشتمان ئیعدامە. ئەمما ئەگەر دەلیلی تەخفیف لەبەین دابێ وەک لە مادە ١ نووسراوە رەفتار دەکرێ.

مادە ٨ - دەس درێژی بە نامووسی خەڵک جەزای هەر بەو جورەیە کە لە هەیئەتی رەئیسەی میللی دا گوزەراوە.
مادەی ٩ - بەرتیل وەرگرتنیش هەروەها.
(تێبینی ١) تەواوی گرتوان ( دوکتور لیسانس دیپلۆمە و ناقص نەبی) لە رۆژی گیرانەوە بە ئەمری ئەو مەقاماتەی کە سەلاحییەتیان هەیە مومکینە کاریان پێبکرێ ئەمما رۆژێ لە ٦سەعات زیاتر ناو رۆژانی تەعتیلیش هەرنا.
( تێبینی ٢) ئەفسەران و ئەفەراتی هێزی دێموکراتی کوردستان و جاسوسانی خاریج ئەگەر یەکێک لەو گوناحانەی لێ روو بدا هەر لە دیوانی حەرب پێیرادەگەن. خەڵکی خاریج لە هێزەوەش بە پێی فەرمانی ریاسەتی موعەززەمی جەمهور ئەم دیوانە حوکمیان دەکات.» سەرۆکی دیوانی حەربی هێزی دێموکراتی کوردستان : ئیبراهیم صلاح. (لە باری رێنووسەوە دەستکاری کراوە.)
ئەو یاسا و بریارانەی کە نیزیکەی .٥ ساڵ لە مەو بەر کۆماری کوردستان بۆ ئیسلاحات و چاک کردنی بارو دۆخی کۆمەڵی کوردەواری داینا‌ون، تا ئێستاش لە هیچ ولاتێکی رۆژ هەڵاتی نێوە راست دا دا نە نراون و بە رێوە نە چوون.
خۆ ئەگەر لە گەڵ کردەوەو ئاکاری رێبەر و بەر پرسانی راپەرینو شۆرشەکانی کوردی دوای کۆماری کوردستان مقایسە بکرێن ، ئیتر هیچ !!
دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان و بلاو کردنەوەی رۆژنامەو گۆڤاری کوردی. دەزگای بلاو کردنەوەی دەنگو باس، هێنانی ژنان بۆ کۆری تێکۆشانی کولتوری و سیاسی بەشێکی تر لە هەنگاوە پێشکەوتوەکانی حکومەتی میللی کوردستان بوو. دانانیهەیئەتێکی فەرهەنگی بۆ ساخکردنەوەو دۆزینەوەی وشەی رەسەنی کوردی هەنگاوێک بوو بۆ ئەوە کە نەبێتە پاشا گەردانی و تێکدانی زمانی کوردی. بۆ ئەوەی (پۆلیس نەکرێتە حەیتە و وەزیر نەکرێتە شاڵیار و سیاسەت نەکرێتە رامیاری) ئەم بەلایە بە سەر زماندا نەیە. زاناو زمان ناس کۆ دەبوونەوە و وشەی رەسەنی کوردیان دەدۆزیەوە.

حکومەتی میللی کوردستان هێندێ یاساو بریاری شەرعی و کۆمەلأیەتی دەر کردن کە تا ئەو دەم لە کۆمەڵی کوردەواریدا نەدیترا بوون ، وەک شیر پایی وەر گرتن و رەدوو کەوتنی ژنی بە مێرد و دەست درێژی بۆ ژنان و بە شوو دانی کچ بە تۆبزی و کردەوەی تری دزێو و دوور لە شارستانیەت قەدەغە کران و سزایان بۆ دیاری کرا. بۆ خەیانەت بە کۆمار و جاسوسی و بەرتیل وەر گرتن و ڕێگری و تریاک کێشان و دەست درێژی بۆ ناموسی خەڵک یاسای تایبەتی بە سزای قورسەوە دەر کران و لە رۆژنامەی کوردستاندا بلأو کرانەوە.

لەوانە گرنگتر دامەزراندن و رێکخستنی هێزی بەر گری کوردستان بوو کە بتوانێ پەلاماری دوژمن تێک بشکێنێ و دەسکەوتی میللەت بپارێزێ. بە داخەوە بە بروای من ئەم بەشەیان کە گرنگترین بەشی دام و دەزگای کۆماری کوردستان بوو، لاوازترین بەش و ناجور ترین دەزگای هێزی بەر گری بوو. دەکرێ بۆ لاوازی و ناجوری ئەم بەشە گرنگە دوو هۆی سەرەکی دەست نیشان بکەین.

یەکەم نە بوونی کادری نیزامی و ئەفسەری زانستگا دیتوو و پێکراوی ئەرتەشی. لە سەرانسەری کوردستانی ئێران ۱۰ ئەفسەری کوردی وا نەبوو کە زانکۆ و زانستگای نیزامی تەواو کرد بێت و رابردووی چەند ساڵەی سوپایی هەبێت. ئەم ناتەواویە وای کرد بوو کە بۆ جەبهەی شەر و بەر گری حیساب لە سەر سوارەی عەشایر و سەرۆک عەشیرەت و خاوەن مڵکان بکرێ. ئەوانیش بۆ مەسەلەیەکی ئاوا گرنگ قەت ناتوانن جێگای بروا و دڵنیایی بن.

دووەم سیاسەتی بەر گری و پاراستنی کۆمار لە لای رێبەرانی بزووتنەوە روون نەبوو. ئەوان پتر چاویان بریبوە ئەنجامی وتو وێژی تەوریز - تاران و هەڵوێستی حکومەتی ئێران بۆ ناسینی خود موختاری وچارە سەر کردنی کێشەی کورد لە رێگای هێمنانەوە. لەم بوارەدا هێزی پێکراو ودڵسۆزی کوردستان بارزانیەکان بوون کە بە داخەوە گرنگی پێویستیان پێ نە دەدرا.

ناتەبایێکی گەورە کەوتبوە نێوان سیاسەتی کردەوەیی و سیاسەتی وتار و

راگەیاندنی کۆماری کوردستان. لە وتو ویژ و وتاری رەسمیدا، قسە لە خود موختاری و ئەنجومەنی ئەیالەتی دەکرا، بەلاّم بە کردەوە سپای میللی دادەمەزرا و ژەنراڵ و سەر هەنگ و سەروان و پولکۆونیک و پۆت بۆلکۆنیک و مایور و کاپیتان بە پێچەوانەی داب و دەستوری ئەرتەشی حکومەتی ناوەندی ناو دێر دەکران کە لام وانیە لە گەڵ خود موختاری یەک بگرنەوە. بۆ ناوچەی خود موختار رەنگە پولیس و مەعموری شارداری چەندی بتەوێ رابگری. بەلاّم ئەرتەشی جیاوازو سەربەخۆ بۆ دەوڵەتی سەربەخۆ دەگونجێ.

با سەبرێکی نووسراوەی پەسند کراوی کۆ بوونەوەی ئەفسەرانی هێزی دیموکراتی کوردستان بکەین

« بړواری ۱۳۲٤/۱۱/۳

نووسراوی مەجلیسی تەواوی ئەفسەرانی هێزی دیموکراتی کوردستان لە دانیشتنی شەوی سێ شەمەی بړواری ۱۳۲٤/۱۱/۳ لە وەتاغی شورای ئەفسەران بە حضوری معاوەنەتی بەرزی فەرماندەی کل قوا وتەواوی ئەفسەرانی هیز اغایاتی غەني خسروی و دوو نەفەر نومایندەی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات آغای منافی کریمی و صدیق حیدری دا تصویب کرا.

۱ - دو هەزار نەفەر سوار و هەزار نەفەر پیادە. ساخلویان لە سابلاخ بی.

لەوەی پینصد سوار بو لای تازە قەلا بنیردری و پینصد سوار بو قباغکندی بنیردری

۲ - تصویب کرا لەشکریک لە میاندواو تشکیل بدری بە شرح ژیرەوە. مەرکەزی ستادی میاندواو بی. ۲ پوڵ( ٤٨٠ نەفەر ) لە مەرکەزی ستادی میاندواو بێ.

۳ - بوکان - دوو پوڵ. ۳٦٠ نەفەر لە داخلی بوکان و ۱۲٠ نەفەر لە گلولان بی.

٤ - هەوشار - ۲ پوڵ ٤٨٠ نەفەر. ساخلوی لە ساینقەلا و محمود جغ بی

٥ - قەرە موسانی . ١٢

٦ - یەکشەوە . ١٢

٧ - حاجی لک دەستەیەک . ٤ نەفەر

٨ - باعلوجە = = . ٤ نەفەر

٩ - سەراو چلیک . ١٢ نەفەر

١٠ - وشتە پە . ٢ نەفەر

١١ - مەنگور . ٢٤ بە شەرحی ژیرەوە : بستام بەگ . ٤ نەفەر، مەرکەزی خەلیفان . ١٤ نەفەر، گوێچکە دەری . ٤ نەفەر

١٢ - لاجانی مامەش . ٢٤ نەفەر مەرکەز پەسوە

١٣ - لاجانی پیران . ٢٤ مەرکەز خانی

١٤ - هەرکی و دەشتە بیل - قیسمەت» طە . ١٢ نەفەر، قیسمەتی زیرو ١٢ نەفەر.

١٥ - شنو . ٢٤ نەفەر مەوکەز شنو

١٦ - رضائیە پولیکی تیکەڵ ( ٩٨. نەفەر

موضوعی نیشان و دەرەجە

١ - نیشانی ئەفسەران عەینی عەلامەتی ئالایە بۆ کلاوی

٢ - نیشانی نەفەرات عەلامەتی سی رەنگی ئالایە بە شکلی مستە تیل

٣ - عەلامەتی پاگونی صنفی پیادە سەوز

٤ - == == == سوار عاسمانی

٥ - عەلامەتی پاگونی صنفی ستاد رەش

٦ - == == == توپخانە قاوەیی

٧ - == == == بهداری سورر

٨ - == == == مهندس و نەقلیە سورمەیی

٩ - کلاوی زستانی کلیە توک

١٠ - كلاوي هاويني ئەفسەران كاسكيت - ئەفەرات قورمي سيترە
١١ - حقوقي پيشمەرگەی وەظيفە (٢٠) تومان و جيرەش لە سەر دەولەتە
١٢ - داو طلب (١٢٠) تومان جيرەو ليباس لە سەر دەولەتە
١٣ - سەر جوگە ١١٠ تمەن
١٤ - گروهبان ٣ ١١٥ تمەن
١٥ - گروهبان ٢ ١٢٠ تمەن
١٦ - گروهبان ١ ١٢٥ تمەن
١٧ - استوار ٢ ١٣٠ تمەز
١٨ - استوار ١ ١٣٥ تمەنئەفسەران ليباس لە دەولەت وەر دەگرن و امتيازيک بو ليباسی ئەفسەران قايل دەبن
١٩ - ستوان ٣ ١٨٠ تمەن
٢٠ - ستوان ٢ ٢٠٠ تمەن
٢١ - ستوان ١ ٢٢٥ تمەن
٢٢ - سەروان ٢٥٠ تمەن
٢٣ - سەر گورد ٣٠٠ تمەن
٢٤ - نايب سەرهەنگ ٤٠٠ تمەن
٢٥ - سەرهەنگ ٥٠٠ تمەن
٢٦ - سەر تيپ ٦٠٠ تمەن
٢٧ - سەر لەشكر ٧٥٠ تمەن

تەرزی پاگون هەر دوک لا آچغە لە نيوە راستی بو ئەفسەران هەر کەسە لە رەنگی صنفی خوی باندازەی يک قيطان نصبی دەکا

نيشانی سەر جوگە عەلامەتيکی لە رەنگی صنفی لە سەو قولي چەپەی بە شکل مستطيل عمودی

نيشانی گروهبان ٣ دوو خط بە شکلی نيو بردوو

نیشانی گروهیان ۲ ۳ خط == ==
== == ۱ ٤ خط == ==
نیشانی استوار ۲ یەک خط لە رەنگی صنفی خوی لە سەر شانی باندازەی یەک قامک
== == ۱ دوو خط == ===
ئەفسەران موسەلەسیک بۆ ستوان ۳
== = دوو موسەلەس بو ستوان ۲
== = ۳ موسەلەس بو ستوان ۱
== = ٤ موسەلەس بو سەروان
== قوبەیەک بە شکلی نیو روژ بو سەر گورد
== دوو قوبە بە شکلی نیو روژ بو نایب سەرهەنگ
== قوبەیەک بە شکلی نیو روژ و عەلامەتی ئالا بو سەر تیپ
== دوو قوبە بە شکلی نیو روژ و عەلامەتی ئالا بو سەر لەشکر
== قوبەیەک بە شکلی روژی تەواو لە دەوری قوبەکەی دوو ئاڵ بو سوپەبود
عەلامەتی صنفان بۆ ئەفسەران
۱ - پیادە دوو خەنجەر لە طرفین ئەستوی
۲ - سوار دوو ئاڵ == == ==
۳ - ستاد قەلەم == === ==
٤ - مهندس بیل == == ==
٥ - توپخانە عەلامەتی لولە توپ
٦ - نقلیە عەلامەتی ماشین
۷ - بهداری شوشە دەوا» ( **ئەم تصویب نامەیە لە ئارشیوی دوکتور رەحیمی قازی وەر گیراوە.)**
لام وانیە پیویست بیّ موناقەشەی ئەوە بکریّ کە داخوا کۆماری کوردستا ن

حکومەتێکی سەربەخۆ بوە و یان خود موختارو یان « دی فاکتو» و «دی ژور» کەس بە رەسمی ناسیوە و یان نەیناسیوە و یان بە قەولی دوکتور **قاسملوی** **شەهید**( لاسای سۆڤیێتی کردۆتەوە) و یان بە کردەوە دەسەلاتی نەتەوایەتی‌لەو کوردستانە پچوکە دا وەک دەسەلاتی دەولەتی کورد بە کار هێناوە.؟ بە لام دەکرێ خوێنەری بە رێز لێکی بداتەوە داخوا ئەم تەشکیلات و دام و دەزگایە هی خود موختاری و یا لاسا کردنەوەیە ؟

## بارو دۆخی کوردستان دوای دامەزرانی کۆمار

دوای دامەزرانی کۆماری کوردستان و پێکهێنانی حکومەت و دام و دەزگای ئیداری بارو دۆخی کوردستان و کەش و هەوای نێو نەتەوەیی تا دەهات بە زیانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد گۆرانی بە سەردا دەهات.

ئەم گۆرانکاریە لە سێ خەتەوە بە جوانی خۆی نیشان دەدا. هێشتا کۆماری کوردستان بە تەواوی خۆی نەگرتبوو، نە بە گارو باری پێویستی نێو خۆی راگەیشتبوو، نە لە باری بەر گری و هێزی چەکدارەوە خۆی پەرداخ و پتەو کردبوو نە کێشەو هەرای سنوور لە گەل ئازەربایجان چار کرابوو، کە چی کەوتبوە نێو کێژاوی سیاسەتی سێ لایەنی نا لە بار و نا تەبا لە گەل مەسەلەی کورد.

**لایەنی یەکەم** بریتی بوو لە سیاسەتی حکومەتی ئێران. تاران بە پشت ئەستوری دەولەتانی ئینگلیز و ئەمریکاو بە پالدان بە پەیمانی سێ قۆلی ئێران و ئینگلیز و سۆڤێت کە ٦ مانگ دوای تەواو بوونی شەر لەشکریان لە ئێران بەرنە دەر و تەواویەتی خاکی ئێران بپارێزن، گوێی بۆ ویست و داخوازی کورد شل نەدەکرد و نەک هەر ئەوە رۆژ بە رۆژیش زیاتر لەشکری بەرەو کوردستان دەنارد و خۆی بۆ ئەم رۆژە ئامادە دەکرد کە ئوردووی سوور لە ئێران وەدەر کەوێ. لە پەنا

چالاکی عەسکەریدا هێندێ جار بە داو نانەوەی فێڵ و درۆ و هێندێ جاریش بە ساز کردنی دوو بەرەکی و کڕینی سەرۆک عەشایری خۆ فرۆش ئاژاوەی لە کوردستان ساز دەکرد. هەر لەو کاتەشدا لە ریگای جۆر بەجۆرەوە خەریک بوو دۆستایەتی نێوان دوو حکومەتی کوردستان و ئازەرزایجان بنکۆڵ بکا و لەناکۆکی ئەوان کەلک وەر بگرێ.

**لایەنی دووەم** سیاسەتی دەوڵەتەکانی ئینگلیز و ئەمریکا بوو سەبارەت بە کورد و مەسەلەی ئازەربایجان. ئەوان جگە لە وەی پەیمان و بەڵێنیان دابوو کە تەواوبەتی ئەرزی ئێران بپارێزن، لە ئەساسدا سەبارەت بە مەسەلەی کورد رووی خۆشیان نیشان نەدەدا. ناوچەی خوارووی کوردستان کە لە ژێر کونترۆڵی ئەرتەشی ئینگلیز دابوو، هەموو بزووتنەوەیەکی کوردی لێ قەدەخە کرا بوو. لەشکری ئینگلیز نەک هەر دەستی ئەرتەشی ئێرانی لەم ناوچەیەدا بۆ لێدانی بزوتنەوەی کورد والا کرد بوو. بەڵکوو لە ئامۆژگاری و یارمەتیدانیشیان درێغی نەدەکرد. زیاتر لەوە کاتێکی ئینگلیزەکان دیتیان کە وا بزوتنەوەی ئازربایجان و کوردستان دێ خۆ بگرێ و لەوانەیە لەگەڵ سەرۆک وەزیری کۆنە کار قەوام بگەنە جۆرە رێک کەوتنێک، بزوتنەوەی یاشوریان ساز کرد. عێل و عەشیرەتی قەشقایی و بەختیاریان هاندا کە راپەرن و ئەوانیش بۆ ناوچەی فارس داوای خود موختاری بکەن.

« .. کۆنە پەرستی ئێران کە بە یارمەتی ئیمپریالیستەکانی ئینگلیز و ئەمریکایی جێ پێی خۆی قایم کرد بوو، لە پاییزی ١٩٤٦ بە ئاشکرا دژی هێزە دێموکراتیەکانی ئێران و لە پلەی یەکەمدا دژی دێموکراتەکانی ئازەربایجان دەست بە کار بوو. لە نیوەی مانگی سیپتامبر بە هاندانی ئینگلیز و ئەمریکا و کۆنە پەرستەکانی تاران عەشیرەتی قەشقایی و عەشیرەتگەلی دیکەی باشور کەوتنە جمو جوڵ. ئاژاوەی عەشیرەتگەلی جنوب کاتێ پەرەی گرت کە وتو وێژی نهێنی **قەوامی** سەرۆک وەزیر لە گەڵ **ناسرخانی** قەشقایی و رێبەرانی عێل و

عەشیرەتی باشور کۆتایی پێهاتبوو. قەوام خسرو خانی کرد بوە مەعمور کە لقی حیزبی ( دیموکرات) لە فارس دابمەزرێنێ.

دەستەی چەکداری عێل و عەشایری باشور، قەشقایی، بویر ئەحمەدی، مەمەسەنی لە چارەی مانگی سیپتامبر دەستیان کرد بە چەککردنی پۆستی ژاندارمەو شارەکانی کازرون و بوشەرو چەند شاری دیکەی فارسیان گرتن. دەستیان کرد بە کوشتاری ئەندامانی حیزبی تودە و ئەندامانی یەکیتی کرێکاری و وەرزێری و بەشدارانی بزوتنەوەی دیموکراتی.

ناسر خانی قەشقایی و رێبەرانی کۆنە پەرستی ئەو عێلە بە ئاشکرا دژی ئازەربایجانی دیموکراتی دەست بە کار بوون. داوایان کرد کە وەزیرانی تودەیی لە دەولەت دەر بکرێن و لە ژێر ئالای عەشایردا خود موختاری بدرێ بە خەلکی فارس.

نوێنەرانی رەسمی دەولەت و ئەرتەش بە قسە دژی ئەم ئاژاوە چیانە هیچیان تێدا نەدەهێشتەوە. سەر کردەکانیان بە خاین و کۆنە پەرست ناو دەبرد. بەلام بە کردەوە بۆ سەر کوت کردنیان هیچیان نە دەکرد. ئەم ئاژاوەیە بە تەواوی مارکی سیاسی هەبوو. مەبەست لە ساز کردنی ئەم ئاژاوەیە ئەوە بوو کە دەستی قەوام لە سەر کوتکردنی بزوتنەوەی ئازەربایجاندا تەواو ئاوالە بێت. پاشان ناسر خانی قەشقایی و رێبەرانی دیکەی ئاژاوە دانیان پێدا هێنا.

لە ٧ی ئوکتوبری ١٩٤٦ رێک کەوتنێک لە نێوان خانگەلی باشورو دەولەت دا واژۆ کرا. لە ویدا ئاژاوەی خانگەلی باشور بە ( بزوتنەوەی میللی ) ناو نرا بوو کە گۆیا لە سەر بنە مای « نیشتمانپەروەری و دیفاع لە تەواویەتی عەرزی و سەر بە خۆیی ئیران» پێکهاتوە. دەولەت لە تەواوی عەشیرەتەکانی باشور خۆشبوو . (٢٤)

**لایەنی سێیەم سیاسەتی بێ قەولی و خۆ پارێزی دەولەتی شورەوی.**

سیاسەتی شورەوی لە پێوەندی لە گەڵ مەسەلەی کورد هەر ئەوە نەبوو کە لە بواری یارمەتی و ناردنی چەک و کەرەسەی پێویست بەڵێن و قەولی خۆیان نە بردە سەر. هەر ئەوەش نەبوو کە لە سارد کردنەوەی ورەی شورشگێری و پەلامار و بڕیاری بەرگری و هیوا بە خۆ بوونی ڕێبەرانی کۆماری کوردستان نەخشێکی نا پیرۆزیان هەبوو، بەڵکوو ببوونە بنەمای ئاڵۆزی مەسەلەکە و بزوتنەوەی کورد کرا بوو بە بارمتەی سەوداو مامڵە و کێشەی نێوان شورەوی‌و ئینگلیز و ئەمریکا. دەوڵەتانی ڕۆژ ئاوا لە ڕوانگەی پێوەندی کورد و شورەوی سەیری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردیان دەکرد ومەسەلەی کورد بەسترابۆوە بە ئازەربایجان.

« .. لە کاتێکا کوردەکان لە مەهاباد لە ژێر ڕێبەرایەتی حکومەتێک ساخڵەم و دروستدا بە ڕێگای بەختەوەری خۆیاندا دەچوونە بێش، چارە نووسی ئەم حکومەتە لە کێشەو هەرای نێوان یەکیتی‌شورەوی و دەوڵەتانی ڕۆژ ئاوادا بە ڕێبەرایەتی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دیاریی دەکرا. کاتێکی شەری دووەمی دنیاگر تەواو بوو، ستالین خەریک بوو ناوچەکانی ئاسیای ڕژ ئاوا کە لە کاتی شەری یەکەمی دنیاگر دا بەشێک بوون لە رووسیا و بەلشەویکەکان بە گوێرەی پەیمانی ساڵی ١٩١٧ دابوویانەوە بە وڵاتانی دراوسێ، بیان ئەستێنێتەوە. لە کاتێکا کە تورکیا لەم بابەتەوە لە ژێر گوشار دابوو، رووسەکان دەیانویست ئیمتیازی هێنانە دەری نەوتی شیماڵ لە ئێران وەر بگرن. ڕێژێکی تودەیی ستالینیستی تەورێزیش پتر وە وەی دەچوو کە بێشەکی لکاندنی ئازەربایجانی ئێران بێت بە ئازەربایجانی سۆڤێتیەوە. چونکە بەر لە شەری یەکەمی دنیا گر ئەم ناوچەیەش وەک بەشێک لە تورکیا لە لایەن هێزەکانی رووسیاوە داگیر کرا بوو. هێزە ڕۆژ ئاواییەکان لە مەسەلەی ئێراندا لە بەرانبەر تەقەلای شورەوی بەر بەرەکانیان دەکرد و ئەم بەر بەرە کانیەیان گەیاندە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکانیش.» (٢٥)

ئەم بۆ چوونە گەرایەکی ڕاستیی تێدا بەدی دەکرێت. هێزەکانی ڕۆژ ئاوا کوردستانیان بە ئازەربایجان حیساب دەکرد و لە کاتی کێشەو باسی ئێراندا تەنیا

ناوی ئازەربایجان دەهاتە گۆری. دیارە مەسەلەی ئازەربایجانیشیان بە دەستکردی سۆڤێت دادەنا. « لە مانگی دیسامبری ١٩٤٥ لە موسکۆ دوو کەس بە ناوی ئاغای بایرنیز Byrnes وئاغای بێوین Bevin زۆریان هەوڵ دا بە ڵکوو کێشەو گرفتاری ئازەربایجان لە چوار چێوەی ریفۆرمێکی نوستانی(ناوچەیی) ئێراندا چارە سەر بکەن. بەلاّم تێکۆشانی ئەوان لە لایەن ژۆزێف ستالینەوە وەستێنرا و بێ نەتیجە بوو. چونکە ئەو لەم بروایەدا بوو کە زۆر دژوارە ئێران وەک ولاّتێکی یەک پارچە بمێنێتەوە و بەر دەوام بێت » (٢٦)

لە راستیشدا ئازەربایجان لەم کێشەو هەرایەدا بۆ کورد جێی ئەم مەسەلە مەشهورەی کوردی گرتبۆوە کە دەڵێ:( .....سپی بۆ باری لۆکەی زەرەوە.) ئازەربایجان لە بواری سیاسەتی دەرەکیدا تەمی خستبوە سەر مەسەلەی کورد و ئەگەر ئاژانسی هەندەران دەنگو باسێکیان لە بارەی رۆژ ئاوای ئێران بلاّو کرد بایەوە، بە ناوی ئازەربایجان بلاّو دەکرایەوە و بە دەگمەن ئەگەر ناوی کوردستان هاتبایە. لە ناوەوەش هەمیشە ژانە سەر و کێشەی بۆ کۆماری کوردستان ساز دەکرد و تەنانەت لە وتو وێژ لە گەڵ حکومەتی تارانیش خۆی بە دەراستی کوردستان دادەنا. هەر چەندە لە رۆژنامەی کوردستان پتر لە پێویست بە شاخ و باڵی برایەتی کورد وئازەربایجان هەلا دەگوترا و دروشمی ( بەر قەرار و پایەدار بێ برایەتی کورد و ئا زەربایجانی) لە قەڵەمی هێندێ لە نووسەرانی رۆژنامەی کوردستان دەتکاوە، بەلاّم ناکۆکیەکە وا نەبوو کە بە دروشمدان چار بکرێ. « ناکۆکی نێوان هەر دو لا چەند لایەنێکی هەبوو. سروشتی هەر دو حکومەت و حیزب جیاواز بوو لە یەکتری. حکومەتی ئازەربایجان و فیرقەی دێموکرات رەنگی کومونیستی هەبوو، حکومەتی کوردستان و حیزبی دێموکرات رەنگی دێموکراتی و نەتەوەیی. ئازەریەکان ئەیان ویست کوردستان بەشێ بێ لە وان.حکومەتی کوردستانیش ئەیویست ئەویش وەک ئەوان خود موختار بێ و راستەو خۆ سەر بە حکومەتی ناوەندی بێ. لەوانەش هەموی گرنگتر ناکۆکی ئەرزی بو لە سەر سنوری

دەسەلاتی هەر دو حکومەت. کورد شارو ناوچەکانی دەوری گۆمی ورمێ: میاندواو، ورمێ، سەلماس، خوی، ماکوی بە بەشێکی سەر زەمینی کوردستان دائەنا. بەلاّم ئازەریەکان بە پارچەیەک ئەرزی ئازەربایجانیان لە قەلەم ئەدا وئامادە نە بوون بخرێنە سەر حکومەتی مەهاباد.» (۲۷)

ئاشکرایە لە بارو دۆخێکی ئاوا ئالۆزو و لە کۆمەلگایەکی دەرەبەگی و عێل و عەشیرەتی دوا کەوتوودا، سەر دەر کردن لە گێژەلوکەی سیاسەتی ملهور و زۆر داران رەنگە زۆر هاسان نەبێ. رێبەرانی کۆماری کوردستان هەولیان داوە کە بە مانۆری سیاسی رێگا چارەیەک بدۆزنەوەو بارێکی شەرعیەتی و قانونی پەسند کراو بۆ بزووتنەوەی کوردستان وەدەست بێنن. لە نووسراوە و وتار و بۆ چوونی رێبەرانی ئەوسای حکومەتی کوردستان وا هەست پێدەکرێ کە بۆ دەرباز بوون لەم گێژاوەیە سێ بوار و رێگا یان رەچاو کردوە.

یەکەم بروا بە خۆ بوون و پشت بەستن بە هێز و تواناو فیداکاری و ئیرادەی میللەتی کورد. بە داخەوە دەبێ بلێین ئەوەی ئەو دەم وەک مەقولە(گۆتە)ی میللەتی کورد حیسابی لە سەر دەکرا، بریتی بوو لە دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەت و خاوەن ملکی گەورە کە هەموو هەولْ و تەقەلایان بۆ گیرفان پڕکردن بوە و لە کاتی پێویست و تەنگانەشدا، سەرەڕای سوێندی وەفاداری و دەست بە قورئان دادانی سەر دەمی کۆمەلەی ژ.ک، پشتیان دە بزووتنەوە کرد و تەنانەت بەرەو خەیانەتیش هەنگاویان نا. بارو دۆخی ئەو دەمی کوردستان و دوا کەوتوویی کۆمەلی کوردەواری و نزمی پلەی کولتور و تێگەیشتنی خەلک نەگەیشتبوە ئەم رادەیە کە دەرەبەگ و سەرۆک عەشایر پشتاو بکرێن و لە خەبات و بریارداندا پشت بە کۆمەلانی خەلک ببەسترێ کە دلسۆز و هێزی بنچینەیی کۆماری کوردستان بوون. زەحمەتکێشانی گوندی هێشتا هەر ژێر دەستی ئاغاو دەرەبەگ بوون و دەسەلاتی هیچیان نەبوو. زەحمەتکێشانی کورد بۆ جەبهەی شەر دەچوون و بەلاّم لە بەر دەستی فلاّن سەروک عەشیرەت و فلاّن ئاغادا بوون

و چەک و موچە و لیباس و کەرەسەی پێویست بۆ جەبهەی شەر دەدرا بە ئاغا و سەرۆک عەشیرەت و ئەویش بەسەر نۆکەرو باوەر پێکراوانی خۆیدا دابەشی دەکرد. دەر کەوت لە کاتی پێویست و تەنگانەدا، تاقە هێزی وەفادار بە کۆماری کوردستان هەر هێزی شۆرشگێری بارزان بە سەرۆکایەتی بارزانیی نەمر مابەوە. ڕێبەرانی کۆماری کوردستان نەپرژان لەم ڕێگایە، واتە لە هێز و توانای کۆمەڵانی خەڵک بۆ بردنە پێشی سیاسەتی خۆیان بە تەواوی کەلک وەر بگرن.

دووەم هیوا بە سیاسەتی نێو نەتەوەیی وەک بەیانتامەی ئاتلانتیک و پروپاگاندەی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ئازادی گەلان و شتی وا، کە هەر گیز بۆ بەرژەوەندی گەلانی ژێر دەست و بەشخوراو لە بەیت و باو تێ نەپەریوە.

لەم بوارەدا ڕێبەراتی کۆماری کوردستان بە نووسین و لە ئاخافتن و و تو وێژدا سیاسەتێکی روون و ژیرانەیان بە کار هێناوە. ئەوان هەر لە سەرەتاوە، واتە لە سەردەمی کۆمەڵەی ژ.ێکافەوە سەرنجی دەوڵەتانی گەورە و بیرو رای گشتی جیهانیان بۆ مەسەلەی رەوای کورد راکێشاوە. لەم بوارەدا سیاسەت و کردەوەو شێوەی بەرێوە بردنی کارو باری حکومەتیش لە گەڵ هینەکەی ئازربایجان فەرقی هەبوو. نووسەر و سەرنجدەرانی بێگانە کە ئەو دەم هاتوونە کوردستان پێشەوا قازی محەمەدیان بە سەرۆکێکی دیموکرات و ئازادیخواز ناو بردوە.

«... جۆری حکومەت لە کۆماری ئازەربایجان و کوردستان فەرقێکی زۆری هەبوو. حکومەتی تەورێز نیزامێکی ستالینی و پر لە مەترسی بوو.لە کوردستان پۆلیسی نهێنی و کادری فێر کراوی سۆڤیتی لە کاردا نەبوون. ئیسلاحاتی ئەرزی و شۆرشی کۆمەڵایەتیش باسی نەبوو.» (٢٨)

وەک دەزانین پێشەوا بەر لە راگەیاندنی کۆماری کوردستان ناردوویەتە کن کونسولی بەریتانیا و داوای کردوە کە ڕێگای پێوەندی و دیدار بگرێتەوە. « لە ئاخری مانگی دیسامبر قازی ئیختیاری دا بە عەبدلرەحمانی زەبیحی و عەلی ریحانی کە بچنە تەورێز و لە گەڵ کونسولی بەریتانیا وتو وێژ بکەن و

هەل و مەرجێک پێک بێنن کە لە داهاتوودا کار بەدەستە بەرزەکانی بەریتانی و زلهێزە رۆژ ئاواییەکانی دیکەش پێوەندی رەسمی یان لە گەڵ کوردستانی ئازادا هەبێ. لە روانگەی نوێنەرانی قازی یەوە وەڵامی کونسولی بەریتانیا ناروون و جێگای هیوا و هومێد نەبوو.» (٢٩)

رێبەرانی کۆماری کوردستان لە پێوەندی لە گەڵ سیاسەتی نێو نەتەوەیی دا هەولیان داوە کە ویستی رەوای میللەتی کورد، جیاو سەر بە خۆ لە مەسەلەی ئازەربایجان رابگەیەنن. « قازی بە نوێنەری ئەمریکای گوت : کوردەکانی ئێران بە واتای واقیعی وشەی دێموکرات دەیانەوێ لە ژێر چاوە دێری رێژیمێکی فیدراڵ دا بە رێوە بچن. هەر وەک لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دا هەیە. ئەگەر حکومەتی ئەمریکا ناتوانێ لە ئاواتی خەڵکی کورد پشتیوانی بکات، لانی کەم دوژمنایەتیمان نەکات.» (٣٠)

ئارچیبالد روزولت وابەستەی نیزامی باڵیوزی ئەمریکا لە تاران کە ئەو دەم چۆتە کوردستان و چاوی بە پێشەوا قازی کەوتوە دەنووسێ :« ... کاتێکی لە دەفتەری قازی محەممەد وەژوور کەوتم لە پشت مێزێک لە پەنا نەخشەیەکی گەورەی کوردستانی مەزن دانیشتبوو. قازی محەممەد پیاوێکی کورتە باڵای بەرێز و گران و سەنگین، کۆتێکی دەبەر کراوی سەر بازی لەبەر دا بوو. پاش ئەوەی بۆم روون کردەوە کە ئێمە کێین و مەعموریەتمان چی یە، کوتە کاغەزێکی لە سەر مێزی هەڵگرت و قسە ئامادە کراوەکانی بە زمانی فارسی بۆ خوێندینەوە. وشەکانی بە تەواوی روون و ئارام بوون. لە توێی خوێندنەوەدا بە چاوی پڕ لە رەنج و موشەقەتەوە سەیرێکی ئێمەی دەکرد. لە وەڵامی ئەو دا گوتم : وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەمیشە لایەنگری ئازادی و مافی مرۆڤی هەموو ئینسانان بوە. ئێمە هیوا دارین کە رۆژێک تەواوی گەلانی جیهان بە ئامانجی خۆیان بگەن. ئێمە هاتووینە کوردستان تا لە وەزعی کوردەکان بکۆڵینەوە و راپۆرت بدەینەوە بە دەوڵەتمان. هیوا دارین کە وەزعی کوردەکان باش بێت و کوردەکان جۆرە سەرە

رۆژێک بە چەشنە سەرە رۆژێکی دیکە نە گۆڕنەوە....کاتێ لە گیرو گرفتی ئێمە لە سەر سنوری دەوڵەتەکەی خۆی ئاگادار بوو، تێکچوو. هەروەها کاتێ کە پێم گوت: لەوە سەو سوڕ ماوم کە دەبینم بارەگای ئەو لە پۆستیری شورەوی داپۆشراوە.

ئەوگوتی : کوردەکان ناچارن یارمەتی لە هەر لایەک بێ وەری بگرن. بەڵام ناچنە ژێر دەسەلاتی هیچ کەسێکەوە. ئێمە شکایەت و سکالای خۆمان بۆ سێ دەوڵەتی سەرکەوتوو لە کونفرانسی پوتسدام نارد. بەڵام ئینگلیز و ئەمریکا گوێیان نەدا بە سکالای ئێمە، ئەو ئاماژەی بۆ بەیاننامەی ئاتلانتیک کرد و گوتی

کوردەکان هەموو هیوا دار بوون وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا - پێشکەوتوترین میللەتی جیهان - یارمەتیان پێبکات تا بە سەر دوا کەوتوویدا سەرکەون. ئەگەر ئەمریکا لە جیاتی ناردنی سی هەزارسەرباز بۆ ئێران سەد ماموستای بۆ ئەم وڵاتە نارد بایە چی دەبوو؟ بەڵام ئەمریکاییەکان لە جیاتی یارمەتی بە ئێمە، یارمەتیان بە دوژمنانی ئێمە، بۆ نمونە بە تورکەکان کرد لە رێگای دانی چەک و قورخانە بۆ سەر کرتکردنی ئێمە. پاشان سەرکۆنەی ئینگلیزەکانی کرد و کردەوەی ئەوانی لە ماوەی دەیان ساڵی رابردوودا لە بارەی سەر کوتکردنی کوردەکان باس کرد و بە کارە ساتی مەلا مستەفا کۆتایی پێ هێنا. لە لایەکی ترەوە سەبارەت بە فەرەنسەییەکان نەزەرێکی باشی هەبوو کە یارمەتیان بە کوردەکانی سوریا کرد بوو.» ( ٣١ ).

بەمجورە دەردەکەوێ پێشەوا قازی محەممەد و رێبەرانی کۆماری کوردستان بە پێچەوانەی بۆ چوونی هێندێ نووسەرانی کورد و بێگانە وابەستە و پێڕەوی وشک و لە قالبدراوی نوێنەر و ئەفسەرانی شورەوی و ئازەربایجانی نەبوون. بەڵام وەک لە بەڵگەو نووسراوەکاندا دەر دەکەوێ لە هیچ لایەکی ترەوە رووناکیان شک نە دەبرد.

**سێیەم** - گۆڕینی کەش و هەوای دوای راگەیاندنی( ئیستیقلال و سەربەخۆیی ) بەرەو وتو وێژ و هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی خود موختاری و یا

هێمنانەوە. لە بواری سیاسی ودیپلوماسیدا، ئەمەیان وەنەبێ جێگا ڕەخنەبێ . لە بارو دۆخی سیاسەتی نێو نەتەوەیی سەبارەت بە ئێران و چوونە دەری ئۆردووی سوور لە ئێرانو وتو وێژی شورەوی و ئێران بۆ وەدەست هێنانی نەوتی شیماڵ، هەنگاوێکی بابەتانەو گونجاو بوو.

وەک دەزانین چاک یا خەراب هێزێکی کە ئەو دەم بە پشتیوان و داشداری بزوتنەوەی کورد ناسرا بوو، تەنیا شورەوی بوو. ئەویش کاتێکی لە مەیداندا بوو لە گەڵ کۆماری کوردستانیش لە پێوەندی وراوێژ کاری دا بوو، قەول و بەڵێنەکانی خۆی نە بردە سەرو لە یاری کەرەسەی بەرگریشەوە کۆماری کوردستانی بێ نیاز نەکرد. جا ئێستا دەهات لە ژێر گوشاری ئینگلیز و ئەمریکا و بە گوێرەی قەرار دادی سێ قۆڵی نێوان ئێران و شورەوی و ئینگلیز لەشکری خۆی لە ئێران دەبردە دەر. جگە لەوانەش قەوامی فێڵە زان و سیاسەتمەداری سەرۆک وەزیری ئێرانیش بۆ گرێدانی پەیمانی نەوتی شیماڵ بە درۆ چاوی لێداگرتبوون و ئیتر دروشمی ئینترناسیونالیستی و لایەنگری لە مافی نەتەوانی ژێر دەست و بە لێنی یارمەتی بە بزوتنەوەی کوردیش کەوتبوە ژێر تەم و مژی خەیاڵیی وەدەستهێنانی ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی شیماڵ.

تاقە هومێدێکی بێ هیوا کە بۆ ئازەربایجان و کوردستان دوای چوونەدەری ئۆردووی سوور بە جێما بوو، ئەوە بوو کە لە مادە ۳ی رێک کەوتننامەی نێوان قەوامی سەرۆک وەزیری ئێران وسادچیکۆف باڵیۆزی شورەوی لە تاراندا گوترا بوو:«لە بەر ئەوەی کێشەی ئازەربایجان مەسەلەیەکی نێو خۆی ئێرانە ڕێ و شوێنێکی هێمنانە بۆ ئیسلاحات بە پێی قانونەکانی ئێستا و بە گیانی خێر خوازی بەرانبەر خەڵکی ئازەربایجان لە نێوان حکومەت و خەڵکی ئازەربایجان دادەنرێ. »

جا لە بارو دۆخێکی ئاوادا، هەنگاونان بەرەو وتو وێژ و هەوڵدان بۆ چارە سەرکردنی هێمنانە کارێکی ژیر بێژی و ئاسایی بوو. بە لام ئەوەی لێرەدا و لەم

برگەیەدا سەرنجی رەخنەیی رادەکێشێ و لە گەڵ هەڵوێستی شۆرشگێری تایەتەوە سارد کردنەوەی هەست و هەڵچونی شۆرشگێری و کزکردنی ورەی پێشمەرگەو دانی ئیمتیاز لە خەتی جەبهەدا بە لەشکری دوژمن و دەست راگرتن لە پەلاماری سەرکەوتوانە و کەلک وەر نە گرتن لە کزی و بێ ورەیی هێزی دوژمن و چاوە روانی دەستە وستانی بە هیوای ئەنجامی وتو وێژنکی بێ سەر ئەنجام.

لە یاسای خەباتی شۆرشگێریدا هەنگاو نان بۆ وتو وێژ لە گەڵ دوژمن بە مانای دەست راگرتن لە لێدان و فرسەت لە دەست دان نیە مادام کە وتو وێژ نەگەیوەتە ئەنجام و رێک کەوتن ئیمزا نەکراوە هێزی شۆرشگێر هەق نیە دەست رابگرێ و فرسەت لە دەست بدات. بەداخەوە لە کوردستان ئەم رەوتە بەریوە نەبرا.

هەر چۆنێک بێ لەشکری شورەوی لە مانگی مای ١٩٤٦ ئێرانی بە جێ هێشت. حکومەتی کوردستان و ئازەربایجان هەستیان‌کرد کە دوای چوونە دەری لەشکری شورەوی لە ئێران مەترسی هەرەشەیان لێدەکا. بۆ بەرگری لەم هەرەشەیە لە مانگی ئەپریلی ١٩٤٦ ئەم پەیمانەی خوارەوە لە لایەن دەستەی نوێنەرانی کۆماری کوردستان و حکومەتی ئازەربایجان واژۆ کرا. ئەمەش دەقی پەیمانەکەیە :

« بۆ قایم و محکم کردنی دوستایەتی کە لە بەینی ئازەربایجان و ملتی کوردستان دا بوە بو پایداری و صمیمیت و دوستایەتی زیاتر لە بەینی ئەم دو میلەتەدا ئەو قەرارانەی خوارەوەیان قبوڵ کرد و هەر دوکیان لەوە دوا لە گەڵ ژیانی خویان تطبیقی دەکەن.

١ - لەو جیگایانەی پیویست بزانن هەر دو حکومەتی میللی نوێنەر دەگۆرنەوە.

٢ - لە ئازەربایجاندا ئەو جیگایانەی کە دانیشتوانی کورد بن کاری ئیداراتی دەولەتی بە کوردان دەبێ. وە هەر وەها لە کوردستانیش لەو جێگایانەی کە بەشی زۆری دانیشتوانی ئازەربایجانی بن لە طرف مأمورانی حکومەتی میللی ئازەربایجانەوە ادارە دەکری.

۳- بو حل بونی موضوع اقتصادی له بەینی هەر دوک میلەتان کومیسیونیکی تیکەلاو دادەمەزری و قراری ئەو کومیسیونه به کوششی سەرانی ئەو دو حکومەته اجرا دەکری

٤- له کاتی بیویست دا له بەینی حکومەتی ئازەربایجان و کوردەستان هاو کاری پیشمەرگەیی دەکری و دەبی ئەوەی لازم بی بو کومەگی یەکتری ئەنجام بدری

٥- هەر کاتیک پیویست بیٚ له گەل حکومەتی تاران قسه بکریٚ دەبیٚ موافقی نظری حکومەتی میلی ئازەربایجان و حکومەتی میللی کوردستان بیٚ

٦- حکومەتی میلی ئازەربایجان بو ئەو کوردانەی له خاکی ئازەربایجاندا دەژین تا ئەو ئەندازەی که بتوانی بو پیشکەوتنی زمان و ترقی پیدانی فەرهەنگی میلی وان هەول دەدا.هەروەها حکومەتی میلی کوردیش بو ئەو ئازەربایجانیانەی که له خاکی کوردستاندا دەژین بو پیشکەوتنی زمان‌و ترقی پیدانی فەرهەنگی میلی وان ئەو ئەندازەی که بتوانی هەول بدا.

۷ - هەر کەس بو تیکدانی دوستایەتی تآریخی نەتەوەی ئازربایجان‌و کورد و له بەین بردنی برایەتی‌و دیموکراسی میلی و یا لکه دار کردنی یەکەیەتی وان هەول بدا هەر دو لا به یەک دەست ئەو مرتکبانه به جزای خویان دەگەیینن. »

له لایەن حکومەتی میلی کوردستانەوه ئەم کەسانه بەشدار بوون:رەئیسی حکومەتی‌میلی کوردستان جنابی ئاغای قاضی محمد، ئاغای سید عبدالله گیلانی عضوی کومیتەیمرکزی حزبی دیموکراتی کوردستان،ئاغای عمرخانی شەریفی‌عضوی کومیتەی مرکزی حیزبی دیموکراتی کوردستان و رەئیسی عیلی شکاک، ئاغای محمد حسینی سیف قاضی وزیری هیزی بەرگری حزبی دیموکراتی کوردستان، ئاغای رشید بگ جهانگیری عضوی کومیتەی مرکزی حزبی دیموکراتی کوردستان و رئیسی عیلی هەرکی، ئاغای زیرو بگی بهادری عضو کومیتەی مرکزی حزبی دیموکراتی کوردستان و نوینەری کوردی شنو ئاغای قاضی محمد خضری.

له لایەن حکومەتی‌میلی ئازەربایجانەوە :«رئیسی مەجلسی‌ملی ئازەربایجان ئاغای حاجی‌میرزا علی شبستری، سەروک وەزیری حکومەتی میلی ئازەربایجان جناب ئاغای سید جعفر پیشەوەری، معاون صدر فرقەی دیموکراتی ئازەربایجان ئاغای پادگان، وزیری داخلەی ئازەربایجان دوکتر سلام‌الله جاوید، وزیر فرهنگ ئازەربایجان محمد بیریا (۳۲)

بەستنی ئەم پەیمانە لە نێوان دوو حکومەتی میللی کوردستان وئازەربایجان حکومەتی ئێرانی تووشی دڵە کوتە و تورەیی کرد. لە تاران وایان لێک دەدایەوە کە کوردستان و ئازەربایجان وەک دوو دەوڵەتی جیاواز پێکەوە پەیمانیان گرێداوە. جگە لە بۆ چوونی تاران سەرنج راکێش ئەوەیە کە لە کوردستان دەقی ئەم پەیمانە بە پێشوازیەکی گەرمەوە لە رۆژنامەی کوردستاندا بڵاو کرایەوە و چەند وتاری لە سەر نووسران. بەڵام لە ئازەربایجان لە هیچ بڵاو کراوەیەکی رەسمیدا بڵاو نەکرایەوە. لە کتێبێکدا بە ناوی ( ۱۲ی شهریور) کە بە بۆنەی یەکەمین ساڵ تێپەر سورانی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان لە لایەن لقی ناوەندی تەبلیغاتی فیرقەدا بڵاو کراوەتەوە تەواوی روو داوەکانی ساڵ و وتار و بریارەکانی فیرقە و وتوو وێژی تاران و ئازەربایجانی بڵاو کردۆتەوە ئەوەی باسی نەکراوە پەیمانی نێوان کۆماری کوردستان و حکومەتی ئازەربایجانە.

هەر ئەمە خۆی نیشانەی ئەوە بوو کە پەیمانەکە تەنیا لە سەر کاغەز ئیمزا کرا بوو بێ ئەوەی بتوانێ هێزێکی کردەوەیی بێت بۆ چارە سەر کردنی ناکۆکیەکانی سنووری کوردستان و ئازەربایجان. هەر بۆیەش دوای گرێدانی پەیمانی ناو براویش لە چەند شاری وەک ورمێ و سەلماس و میانداو و ناوچەی ماکۆش ناکۆکی گەیشتە رادەی پێکدادانیش و بە تەواوی چارە سەر نەکرا. حکومەتی ئێران زۆر وەستایانە لەم ناکۆکیەی نێوان ئازەربایجان و کوردستان کەلکی وەر گرت و داوای لە حکومەتی میللی ئازەربایجان کرد کە دەستەیەکی نوێنەرایەتی بۆ وتو وێژ بنێرێتە تاران. بۆ روون بوونەوەی پتری رەوتی وتو وێژی حکومەتی تاران و

ئازەربایجان باشترە کەلک لە نووسراوە رەسمیەکانی حکومەتی میللی ئازەربایجان وەر بگرین. بەیاننامەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لە بارەی وتو ویژی نوێنەرانی ئازەربایجان لە گەڵ حکومەتی تاران: « لە سەر داوەتی سەرەک وەزیری ئێران ئاغای قەوام السلطنە ١٣٢٥/١/٢٨ هەیئەتێک بە سەرۆکایەتی سەرۆک وەزیری حکومەتی میللی ئاغای پیشەوەری بۆ چاری هێنانەی مەسەلەی ئازەربایجان و پێشگری لە رژانی خوێنی برا چوە تاران. ئەم هەیئەتە لە گەڵ بەر پرسانی حکومەتی تاران وتو ویژی دەست پێکرد و دەیوایە رێک کەوتننامەی ئامادە کراو دوای پەسند کردنی مەجلیسی میللی ئازەربایجان و ئاغای قەوام السلطنە رەسمیەت پەیدا بکات. رۆژی دووشەمۆ ١٣٢٥/٢/٩ وتو وێژ دەست پێکرا. رۆژی دوایی هەیئەتی نوێنەرایەتی حکومەتی تاران راگەیاندنی دەوڵەتی بە ئێمە نیشاندا کە ١٢٣٥/٢/١ ئامادە کرا بوو.*

هەیئەتی نوێنەرایەتی ئازەربایجان لە بەرانبەر ئەم راگەیاندنەدا پێشنیار و بیرو رای خۆی لە ٣٣ مادەدا تەسلیمی هەیئەتی نوێنەرانی دەوڵەتی تاران دەکات کە لەو کەسانە پێکهاتبوو: ئاغایان صادق صادق( مستشار الدولە) فەر مانفەرمائیان. ئیپەکچیان، لەتکەرانی، سپهر(مورخ‌الدولەو موزەفەر فیروز.

نوێنەرانی ئازەربایجان بریتی بوون لە : ئاغایان پیشەوەری، صادق پادگان، دوکتور جهانشاهلو، فەریدون ئیبراهیمی، صادق دیلمقانی و هەر وەها ئاغای محەممەد حوسێنخانی قازی نوێنەری کوردستانی ئازەربایجان.»

وەک گوترا پێشنیاری هەیئەتی نوێنەرایەتی ئازەربایجان لە ٣٣ مادە پێکهاتوە. بەلاّم من لێرەدا تەنیا ئەو ماددانە باس دەکەم کە بە راستی یا بە

---

* – راگەیاندنی دەوڵەتی قەوام لە ٧ مادەدا یەک وشەی باسی کورد و بزوتنەوەی کوردستان تێدا نیە. بە پێویست نە زانرا لێرە بیهێنمەوە. بروانە بلاّو کەرەوەی (١٢ی شهریور تآریخچە نهضت دمکراتیک آزربایجان)

هەڵکەوت و سوتفە وشەی« **کوردستانی ئازربایجان**»ی تێدا هاتوە و لە درێژ دادریەکەی تر دەست دەپارێزم. جارێ لە سەرەتاوە گوتراوە : « بزوتنەوەیەک کە لە ١٢ی شەریوەر پێکهاتوە، وەک بزوتنەوەیەکی پێشکەوتوو، دێموکرات و دەستە بەری ئازادی و سەر بە خۆیی و تەواویەتی ئەرزی ئێران دەناسرێ

مادەی ٢ - ئازەربایجان کە ئوستانەکانی ٣و٤ی پێشو ووڵاتی خەمسە دەگرێتەوە، سەر زەمینێکە دیاری و بە شکڵی خود موختاری بەشێکی وڵاتی ئێرانە و ناوەندەکەشی شاری تەورێزە.(تبصره) :**ناوەندی کوردستانی ئازەربایجان شاری مەهابادە.**

مادەی ١٠ - لە ئیدارە دەوڵەتیەکانی ئازەربایجان و هەیئەتە میللی‌یەکان نووسراوە بە زمانی ئازەربایجانی و لە **کوردستانی ئازەربایجان** بە زمانی کوردی دەبن. بەلاّم زمانی فارسی وەک زمانی رەسمی دەوڵەتی ئێران لە نووسراوەکانی نێو دەوڵەتی ناوەندی لە گەڵ ئازەربایجان و **کوردستانی ئازەربایجان** قەی ناکا.

مادەی ١١ - خوێندن لە قوتابخانە سەرە تاییەکانی ئازەربایجان، بە زمانی ئازەربایجانی و لە **کوردستانی ئازەربایجان** بە زمانی کوردی، لە مەدرەسەی بەرز و نێوەنجی بە هەر تک زمانی ئازەربایجانی و فارسی و کوردی و فارسی دەبن،

مادەی ١٣ - مڵکی خالیسە (دەوڵەتی) و زەوی دوژمنانی ئازادی و مەشروتە و سامانی ئەوان کە بە سەر وەرزێرانی ئازەربایجان و **کوردستانی ئازەربایجاندا**، دابەشکراوە، بە رەسمی دەناسرێ و نادرێتەوە.

مادەی ١٧ - ماف دەدرێ بە ئازەربایجان و کوردستان کە بە گوێرەی حەشیمەتی خۆیان کە سێ یەکی حەشیمەتی ئێرانە نوێنەر بۆ پارلمان هەڵبژێرن.

مادەی ٢٠ - لە مالیاتی ئازەربایجان وکوردستان ٢٥٪دەدرێ بە دەوڵەت. بەلاّم ئەم ساڵ لە بەرئەوەی خەڵکی ئازەربایجان و کوردستان بۆ وەدەست هێنانی

ئازادی و دیموکراسی توشی خەرجی زیادی بوون، لە دانی مالْیات تەرخان دەکرین.

مادەی ٢٣ - هەیئەتی میللی ئازەربایجان و کوردستان پێویستە ئیسلاحاتی فەرهەنگی و لەش ساخی و کشت و کالْی بە ئازادی ئەنجام بدەن.

مادەی ٢٤ - سامانی سروشتی و کانگای ئازەربایجان و کوردستان تەنیا بۆ پێداویستی ئەوانە و بەرێوە بردنی کارخانەکانی ئەم ناوچانە لە ئەستۆی خۆیانە،

مادەی ٢٥ - لە کاتی پێویست چاوە دێری بە سەر کارخانەکانی تایبەتی و شەخسی لە ئازەربایجان و کوردستان لە ئەستوی هەیئەتی میللی و حکومەتی میللی ئازەربایجان و کوردستان دەبیّ.

مادەی ٢٦ - بلاْو کردنەوەی تەواوی چاپەمەنی لە ئازەربایجان و کوردستان لە لایەن هەیئەتی میللی‌یەوە پەسند دەکریّ. تیاتر و سینەما و رادیۆ بە زمانی ئازەربایجانی و کوردی بە رێوە دەچن.

مادەی ٢٧ - تەواوی بانگی کشت و کالْ و پیشە سازی( میللی و دەولْەتی) لە ئازەربایجان و کوردستان لە لایەن هەیئەتی میللی‌یەوە بە رێوە دەچن.

مادەی ٢٨ - تەواوی داهاتی باج و مالْیات دەدریّ بە خەزینەداری ناوچەیی ئازەربایجان و کوردستان و راستەو خۆ بۆ کاری پێویست خەرج دەکرێت.

مادەی ٣٠ - دەولْەتی ناوەندی بەلْێن دەدا کە ئەم ناوچانەی ئوستانی ٣و٤ و ولاْتی خەمسە وەک ( تکاب و سەقز و سەردەشت کە بە دەست دوژمنانی ئازادیەوەن چۆلیان دەکا و دەیانداتەوە بە ئازەربایجان و کوردستان.»

دیارە هەیئەتی دەولْەتی ناوەندی لە گەلْ ئەم پێشنیارە موافەقەت ناکا و پێشنیارێکی تازە لە پێنج مادە دا دەدا بە هەیئەتی ئازەربایجان کە یەک وشە باسی کوردستانی تێدا نیە.

ئەمجارە هەیئەتی ئازەربایجان پێشنیاری پێشووی دەسکاری دەکا و پێشنیارێکی تازە لە ١٢ مادەدا پێشکێش بە هەیئەتی دەولْەت دەکا وشەی

کوردستان لە هەمووی لا دەچێ و تەنیا لە مادەی ١٢ دا گوتراوە :

« ١٢ - مادەکانی ئەم قەرار دادە کوردستانی ئازەربایجانیش دەگرێتەوە. »

دوای وتو ویژ و گۆرینی پێشنیار لە لایەن پێشەوەری و قەوامالسلطنە بریار دەدەن کە لایحەیەکی تازە بە بەشداری موزەفەر فیروز معاونی سیاسی قەوام ئامادە بکرێ و ببێتە بەردی بناخەی رێک کەوتنی ئازەربایجان و تاران. لایحەی ناو براو لە ١٦ مادەدا ئامادە دەکرێ و رۆژی ١٣٢٥/٢/١٩ دەدرێ بە نوێنەرانی ئازەربایجان. لە دەقی لایحەی تازەی دەولەت دا بە هیچ جور باسی کوردستان نەکراوە. لە مادەی ١٥دا گوتراوە: « ئازەربایجان ئوستانگەلی ٣و٤و ولاتی خەمسە دەگرێتەوە.

لە مادەی ١٤ دا گوتراوە:« بە گوێرەی مادەی ١٥ی ئەم موافەقەتنامەیە ئەو کەمایەتیانەی لە ئازەربایجان دادەنیشن وەک : کوردەکان، ئەرمەنیەکان، ئاسوریەکان، لە قوتابخانەی سەرەتایی تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بە زمانی دایکیان دەخوێنن. » (٣٣)

بە جوانی دەبینین کە مەسەلەی کوردستان و بزوتنەوەکەی لە نێو وتو ویژ و لە ژێر تەمی سیاسەتی شۆڤێنیستی حکومەتی تاران و ئازەربایجاندا بزردەبێ و حکومەتی میللی کوردستانیش بە هیوای ئەنجامی ئەم وتو ویژە سەردەنێتەوە.

دوای سەرنەکەوتنی ئەم وتو ویژە نوێنەری کۆماری کوردستان حەمە حوسێنخانی سەیفی قازی لە ١٣٢٥/٢/٢٦ دە گەرێتەوە بۆ مەهاباد و لە مێتینگێکی گەورەی جەماوەریدا راپورتی سەفەرو وتوویژ بە خەڵک رادەگەیەنێ.*

دوای گەرانەوەی نوێنەری کۆماری کوردستان هەر چەندە روون بوو کە ئەگەر حکومەتی تاران و ئازەربایجان لە سەر هێندێ خاڵ رێکیش بکەون، مافی کوردو

---

* بروانە : نوشیروان مستەفا ئەمین ، حکومەتی کوردستان .

مەسەلەی کۆماری کوردستان بە ژێر لێچەوە دەکرێ و لەم بەینەدا شوێنێک بۆ کوردستان لە بەرچاو ناگیرێ، دیسان رێبەرانی کۆماری کوردستان بۆ پاڵەو پەستۆ دانی ئێران و فشار بۆ لەشکری تاران لە جەبهەی سەقز هیچ هەنگاوێکی ناویشت. هەر چەندە لەو کاتەدا بارو دۆخی جەبهە لە بەرژەوەندی هێزی کوردستان دا بوو ئەرتەشی ئێران لە ترس و بێ ورەییدا دەژیا. ئەم راستیەش لە فەرمایشاتی پێشەوادا بە جوانی دیارە کە گەلی کورد بە هەموو تاقم و توێژی کۆمەڵەوە ئامادەی فیدا کاری بوون. پێشەوا لە مێتینگی رۆژی ١٣٢٥/٢/٢١ - ١٩٤٦/٥/٣ کە هەموو سەر کردەو سەرۆک عەشایرو گەورە پیاوانی کوردستان و جەماوەری خەڵک بەشداریان کرد بوو، گوتی : « .... برا خۆشەویستەکانم . مەعلومە تەسدیقی دەفەرموون کە دەگەڵ ئەو هەموو ئیختیلاف و دو بەرەکی کە دەنێو کورداندا هەبوو کە نێوان ناخۆشی وای لێهاتبوو تەئسیری دە خانەوادانیشدا کرد بوو و نێوانی برایانیش تێکچو بوو و حەتتا باب و کوریش پێکەوە یەک نەبوون. پێشرەفتی کارو دانانی تەشکیلات چەند موشکیل بوو وەلی چونکو لە مەردان کار حاسیە نابێ و مێر بە سەرهەرجورە چەوت و چەڵەمەیەکدا فایق دەبێ بە هۆی رەنج و زەحمەت و حەوڵ دانی چەند کەسی ساحیب ئیمان و راست تەشکیلاتیش سازکرا و نەزم و تەرتیباتیش دە نێو مەملەکەت دا بەرقەرار کراو دە مودەتێکی کەم دا ئیختیلافات و نا تەباییش دوایی پێدرا. تو خودا کەی چ شاهیدو دەلیلێک لە وەی گەورە تر، هەر ئەوەندەی کە خەبەری خەتەرێک لە جەبهەی سەقز و سەر دەشتێ و تەجاوزی دوژمن بە خاکی کوردستانی ئازاد بە کوردان گەیشت، هەموو پێکەوە لە دوورترین نوقات کوردان خۆیان گەباندە حدودی و هەرگاه لە تەرەف حکومەتی میللی کوردستانەوە ئیجازەیان با وەک شێری ژیان دەیەک سەعات دا تەواوی دوژمنیان ولجر ولجر دەکرد و تا شاری کرماشانیش وەک هەژدیهای دەمان هەر چی هاتبا پێشیان هەڵیان دەلوشی.» وتاری پێشەوا کورت کراوەتەوە.(٣٤)

بۆ چوونی پێشەوا سەبارەت بە فیداکاری و ئازایەتی کوردان زۆر راست بوو. شەری قاراوا کە هێزی ٦٠٠ کەسی بە تۆپخانەوە تێک شکاند و٢١ کەسیان لێ کوژرا و ٤٠ کەسیان لێ بە دیل گیرا، بە جوانی بێ ورەیی ئەرتەشی ئێران و قارەمانەتی بارزانی و پێشمەرگەکانی دێموکراتی بە دنیا نیشاندا. « دوای شەری قاراوا کە هێزی کوردەکان ستوونێکی ئەرتەشی ئێرانی بە جارێک تەرت و تونا کرد، ئیعتیبارو ناوی حیزبی‌دێموکرات گرنگی تایبەتی وەدەست هێنا. ئەمجارە رێبەرانی سیاسی کورد توانیان زۆربەی عەشیرەتەکان لە گەڵ خۆ بکەنە یەک و تەشویقیان بکەن کە بۆ لای خواروو پێشرەوی نیزامی دەست پێ بکەن، بەڵکوو بتوانن کرماشانیش ئازاد بکەن بیلکێنن بە کۆمارەوە. لە بیستی مانگی مای دەستەیەکی دیکەی ئەرتەشی ئێران بە فەرماندەیی سەروان خسرەوی کە کوردێکی سنەیی بوو، لە دەرەوەی سەقز ئۆردوو بەزی کرد بوو، لە نەکاو کەوتە بەر پەلاماری بارزانیان، سەروان خسرەوی و چەند سەر باز گوژران و ئەرتەشی ئێران لەم ناوچەیە بە جارێ خۆی دۆراند و ورەی بەردا.» (٣٥)

لە هەڵ و مەرجێکی ئاوادا کە بە قەولی مەهدی نیا ئەرتەشی ئێران ورەی بەردا بوو، دەستی تە دەکردەوە، رێبەرانی کۆماری کوردستان نەک هەر لەم دەرفەتە بۆ لێدانی دوژمن کەڵکیان وەر نەگرت، بە ڵکوو بە هیوای وتو وێژی تاران دەستیان راگرت و لەوەش خەراپتر رێگایان دا بە ئەرتەشی بەزیوی ئێران کە چەک و ئازوقە بنێرێ بۆ پادگانەکانی بانەو سەر دەشت و خۆی پەرداخ بکا. دەستەی نوێنەرایەتی کوردستان سەر هەنگ عیزەت عەبدولعەزیز و سەرگورد برایم سەلاح و سەرۆکی ستادی هێزی کوردستان جەعفەری کەریمی موافقەتیان کرد کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان چوار کیلۆ میتر لە سەقزو ٣ کیلۆ میتر لە جادەی سەر دەشت بکشێنەوە. لە سەر ئەوەش رێک کەوتن کە نوێنەرێکی دایمی کوردستان لە سەقز بمێنێتەوە و بە سەر شەر وەستاندندا چاوە دێری بکا.

دیارە سەبارەت بە پێوەندی و شەر وەستاندن و کشانەوەو رێگەدان بە ئەرتەشی

ئێران لە نێوان ڕێبەران و فەرماندەکانی هێزی کوردستاندا یەک دەنگی نە بوە. ئەگەر بە قەولی جەعفەری مەهدی نیا « نوێنەرانی کوردستان بە وادەو بەڵێنی فەرماندەکانی ئەرتەشی ئێران لە بارەی خود موختاریەوە دڵخۆش بوون » فەرماندەی هێزی بۆکان و مەنتیقەی سەرا. ژەنراڵ حەمە رەشید خان باشتر لە فێڵ و تەڵەکەی عەجەم گەیشتوە و لەم بارەوە ئەم نامەی خوارەوەی بۆ پێشەوا قازی محەممەد نووسیوە .: « بۆ حەزرەتی پێشەوای بەرزی جمهوریەتی کوردستان

موضوع / حیلەی دوژمن و عدم موافقەتمان بو انسحابی هیزەکانمان

١ - گزارشاتی رۆژی ٢٥/٣/٥/مفصلا عرض وزارتی حەربی هیز کردوە، بە نوسراوەی ژمارە ٣٣٨ - ٢٥/٣/٥ بەلام لە بەر ئەوەی کە ئاغای کەریمی نەگەرێتەوە بو خدمتتان و نتیجەی مذاکراتی خویانت بە عرض نەگەیەنن، مجبور مام کە منیش نظریەی حتمی خومتان عرض بکەم. هیچ امید ناکری کە دوژمن لەم طلبەی دا مقصدیکی راستی دوستایەتی و ریک کەوتنی ببی لە غیر از وقت و فرصت ضایع کردنی ئیمە نە بیْ. اگر دوژمن بهانەی تأمین زەخیرەو وسیلەی معیشتی هیزی بانەو میرەدی و سەقزیەتی، تآمینتان دەکەم لە هەمو جهتیکەوە وسیلەی معیشتیان تەواوە. ئەتوانن هەتا مدەییکی زور بە رفاهیت بە دخائری حاضریان ادارە بکەن. واگر هەر مطلەبیش بهانەیە کە سیطرەتی هیزی ایمە لە سر منطقەی نفوزی خویان دور لخەنەوە، بصورەتی قطعی امکانمان نابی کە یک بست بکشیینەوە دواوە. ئەو جیگایانەیان بو چول بکەین بە قوەتی سیلاح لیمان وەر گرتون. بەلام اگر دەولەتی عەجەم مطلبی آشتی و ریک کەوتنە من ضامنم کە هەتا نهایەتی مذاکرە تقدم و تجاوزات لە طرف هیزی دیموکراتەوە واقع نەبیْ.

جا بەو مناسبتەوە بە واجبم زانی کە نظریەی اداری و عسکری خومتان عرض بکەم. گەرانەوەمان بو پاشەوە زور مشکلە. ایتر ایجابی متوقفی امرتانە. فرماندەی هیزی بوکان و منطقەی سرا.»(٣٦)

پێشەوا لە وەڵامی نامەی حەمە ڕەشید خانیدا ئاماژە بۆ « ئەوضاعی بەینەلمیلەلی دەکاو دەنووسێ:« ئەمە مەجبوورین لە ڕێی صولحەوە تا مومکین بێ تا توانین بە ڕێی دیکەدا بڕۆین. »

ڕۆیشتن بە ڕێی صولح داو گەیشتن بە ئاوات لەم ڕێگایەوە، وەک پێشەوا ئاماژەی بۆ دەکات وە نەبێ جێگای ڕەخنە بێ. بەڵام بەو مەرجەی کە دوژمنیش ئەم ڕێگایە بگرێتە بەر. چەوتی کارەکە لە وەدا بوە کە ڕێبەرانی کۆماری کوردستان یەک لایەنە خۆیان بە خەیاڵی ئاشتی و وتو وێژەوە خەریک کردوە. وتو وێژی حکومەتی تاران و ئازربایجان کوردستانیان بە تەواوی پشتاو کردوە و بە قەولی نوشیروان مستەفا : (کوردستان خراوەتە سەبەتەی ئازربایجانەوە.) ڕێبەرانی کۆماری کوردستان سەرەرای زیدەی هێز بە سەردوژمندا و هەڵکەوتی لەبارتر لە جەبهەدا،، بۆ ڕاگرتنی شەرو کشانەوە بە قازانجی هێزی دوژمن لە دوژمن بە تاڵوکە تر بوون.

چونی حاجی بابە شێخ، سەروکی حکومەتی میللی کوردستان بۆ وتو وێژ لە گەڵ ئەفسەرێکی ئێرانی بۆ جیا کردنەوەی هێزەکان، بێجگە لە هێنانە خواری پرستێژ و نفوزی کۆماری کوردستان، مانایەکی تری نە بەخشیوە. لەوەش قەباحەتتر چوونی پێشەوا سەر کۆماری کوردستان بوە، بۆ دانیشتن لە گەڵ فەرماندەی لەشکری ئێران لە جەبهە کە لە گەڵ هیچ هەنگاوێکی دیپلوماسی و سیاسیدا نایەتەوە. خۆ ئەفسەری لێهاتووی کورد کەم نە بوون کە بچن لە گەڵ ڕەزمارا دابنیشن و وتو وێژ بکەن.

ڕەنگە خوێنەری بەڕێز بێژێ ئاکرێ بە چاوی ئێستا سەیری ڕوو داوەکانی پێش ٥٠ ساڵ بکەی و هەڵوێستی ئەو دەمی ڕێبەرانی کۆماری کوردستان بدەیە بەر نەشتەری ڕەخنە. بەڵام با خوێنەری بە ڕێز پشوی لە سەر خۆ بێ و بشزانی کە نووسینەکەی من « پێدا چونەوەیە». لام وایە خەباتی نەتەوەی کورد دوایی نەهاتوە و چ قەیدیش نیە ئەگەر بیرو ڕای جیاواز و ڕەخنە گرانەش بە مەبەستی

دەرس وەر گرتن و ئەزموون وەدەستهێنان بێنە سەر لاپەڕی کاغەزو بلاویش بکرێنەوە. ئەوە هیچ لە گرنگی مەسەلەکە کەم ناکاتەوە. یەک لە کەم و کوڕی مێژووی بزووتنەوەی خوێناوی و دوور ودرێژی کورد ئەوەیە کە دوای شکان و نسکۆ و سەر نەکەوتن، قەت نەبوە هۆیەکان شیبکرێنەوەو کەم و کوڕیەکان دەست نیشان بکرێن و بە ڕاشکاوی ڕەخنە لە ناتەواویەکانی بگیرێ و ببێتە چەکێکی مشت وماڵکراو بە دەست تێکۆشەرانی دوا ڕۆژی ڕووداوی سەر نەکەوتوو. بە داخەوە بۆ کورد واهاتوە، دەرس لە بەسەرهاتی رابردوو وەر ناگرێ و هەر بەم ڕێگایەدا دەڕواتەوە کە پێشتر تێیدا سەر نەکەوتووە. با ڕوونتر باسی بکەین: پێشەوای کورد، سەر کۆماری یەکەمین دەوڵەت و دەسەلاتی نەتەوەیی کوردستان، ڕێ دادەگرێ دەچێ لە گەڵ کۆنە قازاخێکی ئەرتەشی وڕە دابەزیوی دوژمن دادەنیشێ و وتو وێژ دەکا. خۆ ئەوە قەی ناکا کە فەرمانی شەر ونستان بدات و لە ڕێگای وتو وێژەوە بخوازێ مەسەلەی کورد چارە سەر بکا. بەلام زۆر کەسری شانە کە سەر کۆماری ولات و پێشەوای نەتەوەیەک و بزووتنەوەیەک بچێ لە گەڵ ئەفسەرێکی ئەرتەشی دوژمن وتو وێژ بکا. لام وایە کورد نەبێ کەس کاری وا ناکا.

پاش چل و چەند ساڵ ڕێبەری حیزبێک و زاناو سیاسەتمەدارێکی کورد بچی بە نهێنی بێ پارێزەر و بێ ئاگاداری کۆڕ و کۆمەلی جیهانی و بێ خەبەردانی دەوڵەتی میواندار، لە گەڵ پاسدارێکی جنایەتکاری بەرەلای پیاو کوژ دابنیشێ، گویا باسی مەسەلەی کوردی لە گەڵ بکا و بە سوک و هاسانی بکەوێتە بەر گوللەی دوژمن و بە فیرۆ بڕوا. ئەو حیزب و دەوڵەت و سەرۆکەش کە ساڵها تەبلیغاتی بۆ دەکرد و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانی بە هێنا نە سەر ڕێبازی برنۆ کرایسکی (مستقل و سەر بەخۆ)دەکرد، نەک هەر مرتەقی لە بەر نەیەتە دەر، بەڵکو پیاو کوژەکانیش سوک و هاسان بنێرێتەوە تاران و دەزگای «داد پەروەری و پارێزەری مافی ئینسانی و دێموکراسی» ئەم ولاتەش پەروەندەکە

ببەستن و وەک هیچ کەس نە کوژرا بێ و هیچ شتێک رووی نەدابێ. حیزبەکەی خۆشی لە پێ هەڵا گرتنی ئازایەتی خۆ بە کوشت دان وشێن گێڕانی ساڵانە زیاتر، هیچی دیکە لە بارەی ئەم کارەساتەوە بۆ کۆمەڵانی خەڵک روون نەکاتەوە.

نەک هەر ئەوە. رێبەرانی یەکێ لە بزوتنەوەی هەرە خوێناوی و هەرە پڕ لە کارەساتی کورد، راست لەو کاتەدا کە شەڕێکی لابەلادوژمنەکە زەلیل دەکا و میللەتەکە رادەپەری وشوێنەواری جنایەت و زوڵم و سەرەڕۆیی لە کوردستان پاک دەکاتەوە، تەقڵە کوت خۆ دەگەیێننە بەر دەرگای بارەگای دوژمنی خوێنخۆری ئەنفالچی و بۆ ماچ کردنی نگریسترین دوژمنی کورد بە سەف رادەوەستن. بێ ئەوەی لە دەرفەت کەلک وەر بگرن و دوژمن رابکێشنە ولاتێکی تر و لە ژێر چاوە دێری دەوڵەتێکی تر و یا کۆڕێکی نێو نەتەوەیی ماچ و موچی لە تەکا بکەن.

بۆ چما هەر ئەوە ؟ رێبەرێکی تری هەمان حیزب بچێ لە رەستوران بە دەم لێو تەر کردنەوە هاو کاری و هاو خەباتی لە گەڵ « هێزە دیموکراتەکانی ئیران» مسۆگەر بکات و بکەوێتە بەرگوللەی پیاو کوژانی ئیسلام و لە تێو ئەو هەمو دیموکراتەشدا سێ کوردی لە ئیرانی ئیرانیتر سەریان تێدا بچێ. سەیریش ئەوەیە هیچ یەک لەم سێ روو داوە باسکراوە شی نەکرێنەوەو بە راشکاوی باسیان نەکرێ و ئەگەر خوا نەخواستە جێگای رەختە ش‌بوو بن رەخنەیان لێ نەگیرێ و دوور نیە ئەوەندە نووسینە دڵسۆزانەی منیش بە لای هێندێ دەروێشەوە بە کوفر دانەنرێ.

با لە رچە ئەسڵیەکە لا نەدەم و پێدا چوونەوەش چاری ئەم زامە تەشەنادارەی کوردەواری ناکا. بە لای منەوە دوای چوونە دەری لەشکری شورەوی لە ئیران ئیتر لە بەر چاو گرتنی « ئەوضاعی بەینەلمیلەلی» وەک پێشەوا لە وەڵامی نامەی حەمە رەشید خاندا ئاماژەی بۆ دەکا، ئیتر واتاو مەفهومی خۆی لەدەست دەدا. ئەمریکاو ئینگلیز بە ئاشکرا پشتی حکومەتی ئیران دەگرن. شورەوی بە هیوای وەدەستهێنانی ئیمتیازی نەوتی شیماڵ گشت بەڵێن و دروشمی لایەنگری مافی گەلان دەخاتە ژێر پێوە.. ئەوضاعی نێو نەتەوەیی چی وای تێدا نامێنێ کە کورد

له بەر چاوی بگریٚ. و له لاوازی دوژمن دەرفەت نەهێنیٚ. « به لای باوەری خۆمەوە چ گلەیی ناکریٚ له بەرەی سوسیالیزم له وەدا نەیتوانیوە یا خود نەیویستوە بە ئەرکێکی زلْ کۆماری مەهاباد بپاریزیٚ. بەلاّم ئەگەر کورد پێی کرا با کۆمارەکە بپاریزیٚ، دەبوا بیپاریزی وەلەو دەجارانیش شەری گەورە یا گچکە لەو پاراستنەی پەیدا بوو با. هیچ میللەتێک ئامادە نیە خۆ بکاتە « مسیح »ی سەر دەمی چەرخی بیستەم لە پێناو جیهاندا. بۆ دەبیٚ کورد خۆ بکاتە « مسیح » خۆ کردنە « مسیح » کاری نا چاریە. »( ۳۷ )

به راستی کورد لەم برگەو بارودۆخەدا لە پێناو پاراستنی ئاشتی جیهانی دا بوو مەسیح و دوای لە چوار میخە دانیشی کەس تازیەی بۆ دانەکرت.

« رۆژی ۳۰ جۆزەردانی ۱۳۲۵- ۲۱یولی ۱۹٤٦ هاشمرۆف کە قونسولی شورەوی لە ورمی بوو، چو بو لای پیشەوا قازی و لە گوندی سەرا چاوی پی کەوت. داوای هاشمۆف ئەوە بوو کە هیزی کوماری کوردستان هیرش نە کاتە سەر ئەرتەشی ئیران. چونکە رەنگە شەریکی گەورە ساز ببی کە یەکیتی سوویتی پێی باش نیە و ناشتوانی هیچ یارمەتیەکی نیزامی بە کوماری کوردستان بکات. پیشەوا قازی و بەریوە بەرانی دیکەی حیزبی دیموکرات پیویست بوو وەزعی کوردستان و سەرانسەری ئیران لیک بدەنەوە. لە لایەکەوە لەشکری سور ئیرانی بە جی هیشت بوو، ریک کەوتن نامەی « موزەفەر فیروز- پیشەوەری» لە تەوریز ئیمزا کرا بوو. لە لایەکی دیکەشەوە دەولەتی ئیران و یە کیتی سوویتی ریک کەوتن نامەی دانانی شیرکەتی نەوتی تیکەلیان پەسند کرد بوو. پاش لیکدانەوەی هەمو ئەو عامیلانە پیشەوا قازی هاتە سەر ئەو بروایە کە هیرش کردن بو سەر ئەرتەشی ئیران موناسب نیە رەنگە لە سەر پیوەندیەکانی کوماری کوردستان و یەکیەتی سوویتی ئاسەواری زور نا لە باری هەبی. ئەمە بریاریک بوو کە شوینی خستە سەر چارە نوسی کوماری کوردستانیش» ( ۳۸ )

دوکتور قاسملو (دوو هوکار، دوو عامل) بە هۆی بریاری پێشەوا دەزانیٚ بۆ

هێرش نەکردنی سەر ئەرتەشی ئێران. یەکیان « ئاسەواری نا لە بار لە سەر پێوەندیەکانی کۆماری کوردستان و یەکێتی سۆڤیەتی». ئەوی دیکەشیان « ڕێک کەوتنامەی « موزەفەر فیروز - پیشەوەری» یە کە لە تەورێز ئیمزا کرا بوو.

بە لای منەوە دوای چوونە دەری لەشکری سوور لە ئێران و وەگرتنی بەڵێنی ئیمتیازی نەوت لە ئێران، ئیتر قسە کردن لە « پێوەندی کۆماری کوردستان وشورەوی» خۆ خاپاندنە. ئێستا کە شورەوی لە ئێران دەر کەوتبوو، چارە ڕوان بوو ئیمتیازی نەوتی شیماڵ وەر بگرێ، هیچ پەیمانی هاوکاری و یا پێوەندی‌یەکی رەسمیشی لە گەڵ کۆماری کوردستان گرێ نە دابوو، ئیتر ئەم پێوەندیەی بە ڕێز **دوکتور قاسملو** باسی دەکا مانایەکی نامێنێ. هەر چەند لە پێشوشدا ئەم پێوەندی‌یە وا نەبوو کە ئاسەواری لە بارو چارە نووس ساز بخاتە سەر کۆماری کوردستان. بەلاّم ڕێک کەوتن نامەی « موزەفەر فیروز - پیشەوەری» لام وایە ئەم ڕێک کەوتن نامەیە دەستی کۆماری کوردستانی بۆ هەموو مانۆر و چالاکی و بڕیارێکی سەربە خۆ ئاواڵە کرد بزوە و ئیتر کوردستان لە (سەبەتەی ئازەربایجان)دەر ئاوێژرا بوو. بە گوێرەی ئەم ڕێک کەوتن نامەیە کە ١٩٤٦/٦/١٣ دا لە تەورێز بەسترا، مەجلیسی میللی ئازەربایجان وەک ( ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازەربایجان) دەناسرێ. هێزی چەکداری‌و فەرماندەکان بە بەشێک لە ئەرتەشی ئێران حیساب دەکرێن. لە سەدا ٧٥٪ داهاتی باج و ماڵیاتی ئازەربایجان بۆ موخاریجی ئازەربایجان تەرخان دەکرێت. هێزی فیدایی ئازەربایجان دەکرێ بە ژاندارمەری. ئەیالەتی ئازەربایجان بریتی دەبێ لە ئوستانی ٣و ٤. لە مەدرەسەی نێونجی و بەرزخوێندن بە زمانی فارسی و ئازەربایجانی دەبێ.»

بە کورتی لە ١٥ مادەی ڕێک کەوتن نامەکەدا، بە گەورەیی خۆیان لە مادەی ١٣ دا ناوی کوردستانیشیان هێناوە و گوتراوە « دەوڵەت موافەقەت دەکا کە کوردەکانی دانیشتوی ئازەربایجان لە مەزایای ئەم ڕێک کەوتن نامەیە کەلک وەر بگرن و بە گوێرەی مادەی ٣ی ڕاگەیاندنی دەوڵەت تا پۆلی پێنجی سەرە تایی بە

زمانی خۆیان بخوێنن.» (٣٩)

بەم حاڵە دەبینین کە ئەم رێک کەوتن نامەیە کۆماری کوردستان و بزوتنەوەی کوردی پشتاو کردوە و رێگاشی کردۆتەوە کە کورد خۆی چ دەکات و چی پێدەکرێ با بیکا. بەڵاّم دیارە بۆ چوونی ئەو دەمی دمراستانی مەسەلەی کورد جۆرێکی تر بوە. ئەم رێک کەوتنە تا پیرۆزەی کە کۆماری کوردستان و هێزی پێشمەرگە و فیداکاری خەڵکی کوردی خستۆتە پشت گوێ لە لایەن نووسەرانی رۆژنامەی کوردستانەوە بە گەرمی پێشوازی لێ کراوە و بە شاخ و باڵیان هەلاّگوتوە. لە رۆژنامەی ژمارە ٢٠ی کوردستاندا نووسراوە :« مەسەلەی کورد بەرانبەر سیاسەتی دنیایی شتێکی بە ترسە. پێشەوای مەزنمان لە بەر ئەم نوقتەیە بە سیاسەتی حەکیمانەی خۆی مەسەلەی کوردستانی ئیرانی بە مەسەلەی ئازەربایجان بەستوە و لە وەشدا ماعەدای قازانج هیچ زەرەرێکمان نە کردوە....... جا ئەگەر بەم چەشنە تەماشای مەسەلەی هەموو کوردستانی ئیران بکەین زور بە ئاسانی بومان دەردەکەوی کە کویرەوەری ئەمەندە سالانەمان بە خەسار نە چوە و گەیشتینە مەرام و ئامانجی خومان.... نووسەر لە سەری دەرواو دەنووسێ :« هەر وەکو عەرزم کردن ئیتیفاقیەی ئازەربایجان و تاران تەنیا مەشمولی ئازەربایجان ناکا بەلکو کوردیش حەتتا ئەرمەنی و ئاسوریش لە مەدا بەشدارن. دەبێ هەموو کوردێک ئەم رۆژانە رۆژی شادی و بەم خەبەرە بەختیار بێ ئەوە زۆر سەیر نیە کە نووسەرێکی رۆژنامەی کوردستان بێ ورد بوونەوە لە نێوەرۆکی ئەم « ئیتیفاقیە» شتێکی ئاوا بنووسێ. سەرنج راکێش ئەوەیە کە پێشەوا قازی محەممەدیش دڵی بەو پەیمانە خۆش کردوە و بۆتە هۆی ئەوە کە فەرمانی راگرتنی شەرو کردنەوەی رێگای ئەرتەشی ئیران بۆ سەر دەشت و بانە بدا.

رۆژنامەی کوردستان ژمارە ٦٢، ٢٧ی ژوئینی ١٩٤٦ نوتقی حەزرەتی پێشەوا راجیع بە جنگی مامەشای سەقز ئاوا دەگێرێتەوە: « شەوی

١٣٢٥/٣/٣. حەزرەتی پێشەوای کوردستان کە لە تەورێزرا بۆ پێراگەیشتن بە مەڵبەندەکانی جەبهە تەشریفی چو بۆ گەرایەوە و بەیانی سەعاتی ٨ لە عیمارەتی پێشەوایی حازر بوو بە کارەکانی بەردەستی راگەیشت و لە ساتی ١ی دوای نیوەرو بۆ بە جیهێنانی فەریضەی جومعە چوە مزگەوتی سوور. دوای نوێژ تەشریفی بردە سەر مینبەر و نوتقی ئیراد فەرموو. لە پێشدا حەزرەتی پێشەوا لە بابەت پەیمانێکەوە کە لە نێوان ئازەربایجان و تارانەوە بەستراوە گەلێک دوا و پتری مەوادی پەیمانەکەی تەشریح فەرموو بە تایبەت ئیشارەی بە مادەی ١٣ی پەیمان کرد کە دەڵێ: ( دەولەت موافەقەت دەکا کە کوردەکانی نیشتە جێی ئازەربایجان لە مەزایای ئەم موافەقەتنامەیە ئیستیفادە بکەن و بە پێی مادەی ٣ی ئیبلاغیەی دەولەت تا کلاسی پێنجی ئیبتیدایی بە زمانی خۆیان بخوێنن و فەرمووی: لەم مادەیەدا ئیقراریان بە حەقانیەت و مەوجودیەتی ئێمە کردوە ونەلبەتە ئێمە دەمانەوێ تەواوی کوردستان لەم مەزایایە و لە ئازادیەکی کە لە سەر تا سەری ئێران بە دەستی کوردان بە زۆری بەر قەرار دەکرێت هەمو براکان بەهرە مەند بن.»(٤٠)

دوای ئەم رێک کەوتن نامەی باسکراو قەوامی سەرۆک وەزیری ئێران فەرمان دەدا بە سەر تیپ رەزمارا کە بە هێز و زۆرە ملی رێگا بۆ سەردەشت و بانە بکەنەوە کە هێزی دێموکرات پێشی گرتبوون. لە ئەنجامدا سێ هەزار سەرباز بە ٨ تۆپ و دوو تەیارە و دوو تانگەوە دەکەونە رێ و دەکەونە بەر پەلاماری شێرانەی هێزی کوردستان و شەری مامەشای لێ ساز دەبێ کە لە هەمو نووسراوەکانی کورد و بێگانەدا باسی کراوە . لەم شەرەدایە بە ئەمری پێشەوا میدالی قارەمانی دەدرێ بە ١١ کەس، یەکیان تێکۆشەری بە ناو بانگ ( **کاپیتان قادری** ) محەممەدی قادری مامەشە کە بە (کا حەمەدي سەروکانی) ناسراوە.(کوردستان ژمارە ٦٠، ٤٦/٦/٢).

با بزانین نووسەر و سەرنجدەرانی بێگانە ئیتیفاقیەی تاران ئازەربایجانیان چۆن

هەڵسەنگاندوە. «لە ماوەی مانگەکانی مای و یون دا، ڕێژیمی ئازەربایجان بۆ ڕێک کەوتن لە گەڵ تاران وتو وێژێکی لە گەڵ یاریدەدەری سەرۆک وەزیری ئێران موزەفەر فیروز کە تەمایلی کومونیستی هەبوو پێکهێنا. بە گوێرەی ئەم ڕێک کەوتنە ئازەربایجان سەر لە نوێ بۆ ئێران دەگەڕایەوە. ئەم ڕێک کەوتن نامەیە پارلمانی تەورێزی وەک ئەنجومەنی ئەیالەتی قبوڵ دەکردودەوڵەتی تەورێز بە ساخی دەمایەوە. بەڵام لەم ڕێک کەوتن نامەیەدا باسی حکومەتی کوردستان نەکرا. بەم چەشنە ستالینیستەکان بناخەیەکی قانونیان بۆدرێژە پێدانی حکومەتی خۆیان ئامادە کردوگوێیان نەدا بە نیزامی غەیرە کومونیستی کوردستان» (٤١)

ئارچیبالد روزولت لە بارەی ڕێک کەوتنی تاران - تەورێزەوە دەڵێ: دیارە ئەم تەرتیباتە بە قازانجی کوردەکان نەبوو. چونکە دێموکراتەکانی ئازەربایجانی هەڵکەوتی خۆیان کردە قانونی و قازی محەممەد و دەوڵەتەکەی سەریان بێ کڵاو مابۆوە. کوردەکان کە لە پێشدا کەمایەتی بوون لە دەوڵەتی ئێراندا، ئێستا ببوونە کەمایەتی لە دەوڵەتی تورکی ئازەربایجاندا.» ( ٤٢ )

هەر ئەوە بوو کاتێکی ڕێبەرانی کۆماری کوردستان هەستیان کرد کە ئازەربایجان هاو پەیمانێکی ناراستە و لە پشت سەری کوردستانەوە لە گەڵ تاران ڕێک دەکەوێ، لە مانگی یولی ١٩٤٦ پێشەوا قازی بۆ وتو وێژی ڕاستەو خۆ لە گەڵ دەوڵەتی ئێران لە بارەی مەسەلەی کوردستانەوە دەچێتە تاران و لە گەڵ سەرەک وەزیر قوام السلطنە و کار بەدەستانی دیکەی حکومەتی تاران وتو وێژ دەکا. لە بارەی چونی پێشەوا بۆ تاران و وتو وێژ لە گەڵ حکومەتی تاران بیرو بۆ چوونی جیاواز هاتوونە سەر کاغەز بێ ئەوەی بەڵگەیەکی ڕەسمی لە لایەن حکومەتی تاران یا کۆماری کوردستان بڵاو کرابێتەوە.

« لە مانگی ئوت شورەویەکان بە قازی محەممەدیان گوت بچێتە تاران و بناخەیەکی حقوقی لە نێو حکومەتی ئێراندا بۆ ڕێژیمەکەی خۆی بدۆزێتەوە. قازی ئەم ڕاسپاردەیەی بە جێ گەیاند. سەرەک وەزیری ئێران پێشنیاری کرد کە هەموو

کوردستانی ئێران بکرێتە یەک ئوستان و ئوستاندارێکی بۆ دیاری بکرێ. بڕیارێکی ئەو تۆ لە باری حقوقی‌یەوە حکومەتی کوردستان و ئازەربایجانی لە یەک پلە دادەنا و وەک یەک دەبوون. قازی هەستی کرد کە بە بێ موافەقەتی شورەوی ناتوانێ ئەم پێشنیارە قبوڵ بکا. بەڵام باڵیۆز خانەی شورەوی نە چوە ژێر باری ئەم ( هاو شانیە). قازی کە وای زانی گەڕایەوە بۆ مەهاباد و هیچ گۆڕانێک بە سەر ئەوضاع دا نەهات.» (٤٣)

**ئارچیباڵد** لەم بارەوە دەنووسێ :« **قازی محەمەد** خۆی چوە تاران و داوای لە قەوام کرد کە بیکاتە حاکمی ئوستانی کوردستان کە هەموو شارەکانی کوردستان و ناوچە کورد نشینەکانی ئازەربایجانیش بگرێتەوە. قەوام سەرەک وەزیری بە ئیحتیاتی ئێران پێشنیاری قازی بە مەرجێک قبوڵ کرد کە دوکتور جاویدی حاکمی دیموکراتی ئازەربایجان موافەقەت بکا. دوکتور جاوید بە توڕەیی پێشنیاری قازی ڕەت کردەوە. ناکۆکی و نەسازان لە نێوان کوردەکان و دیموکراتەکانی ئازربایجاندا پەرەی گرت.» (٤٤)

**ئیگلتون** کە زیاتر لە نووسەرانی دیکە بە ڕوو داوەکانی کۆماری کوردستانەوە ماندو بووە دەنووسێ : « لە سەر ڕێنوێنی یەکێتی شورەوی لە سەرە تای مانگی ئوت قازی چوە تاران تا لەوێ ڕێگایەک بدۆزێتەوە تا لە ڕێگای قانونی‌یەوە حکومەتێکی نیوە خود موختار بۆ کورد لە ئوستانێکی ئێراندا بە ڕەسمی بناسرێ. قازی دوو جار لە گەڵ قەوام و جارێک لە گەڵ ژەنراڵ ڕەزمارا دیدار و وتو وێژی کرد. دوو جاریش لە باڵیۆز خانەی‌شورەوی داوەت کرا. لە وێ پێیان گوت: تا دەتوانێ ڕەفتاری لە گەڵ کار بەدەستانی ئێرانی ئارام و لە سەرخۆ بێ. ڕەفتاری قەوام مەنتیقی بوو. ئەوگوتی: تەواوی کوردستانی ئێران لە گەڵ سنەش بە واحدێکی جوغرافیایی حیساب دەکرێ کە لە لایەن دەوڵەتەوە ئوستاندارێکی بۆ دیاری دەکرێ کارو باری ئەوێ بەرێوە بەرێ. هەڵکەوت و وەضعیەتی کوردستان لە گەڵ ئازەربایجان یەکسان دەبێت و بێگومان قازی دەبێتە هەوەڵین ئوستانداری

ئەم ئوستانە. بە جوانی دیار بوو کە پێشنیارەکانی قەوام لە لایەن بەر پرسانی ئازەربایجانەوە لە خەیانەت بە دەر شتێکی دیکە نیە. چونکە تە دەکرا هەم ئەم پێشنیارانە قەبولٚ بکرێن و هەم لایەنی رووسانیش رابگیرێ. لە کاتێکا سەفەرەکەی بێ نەتیجە بوو، بۆ مەهاباد گەرایەوە .»(٤٥) دوکتور قاسملوش دەنووسێ:« لە نیوەی مانگی گەلاوێژی ١٣٢٥ پێشەوا قازی لە گەلٚ چەند کەس لە بە رێوە بەرانی کۆماری کوردستان بو خوی سەفەری بو تاران کرد. ئاکامی ئەو سەفەرە ئەوە بوو کە دەولەتی مەرکەزی و شەخسی قەوام پەسندیان کرد کە ئوستانێکی تازە بە ناوی کوردستان دیاری بکری کە سنوری لە یەکیتی سوویتی یەوە تا نیوان کرماشان و سنە واتە ناوچەی کامیاران دریژەی هەبی و ئەم ئوستانە لە ژیر چاوە دیری کار بە دەستانی کوماری کوردستان دا بی و قازی محمد بو ئوستانداری گشتی دیاری بکری. ناوچەی کرماشان لە چوار چیوەی خاکی ئەم ئوستانەدا نە بوو. بە هیچ جور دەولەتی مەرکەزی نە ئامادەیی هەبوو نە دەشی توانی کرماشان کە نەوتی تیدا بوو و لە لایەن شیرکەتی نەوتی ئینگلیسەوە دەردەهیترا بە بەشیک لە کوماری کوردستان دابنی. لە لایەکی دیکەوە کرماشان بە ناوچەی نفوزی بەریتانیا حیساب دەکرا و پیشەوا قازی پیاویکی واقیع بین بوو ئەو کاتە نەیدەویست ئیگلستان بە تەواوی بکاتە دوژمنی کوماری کوردستان و دەشی زانی کە یەک خستنی ناوچەی کرماشان لە گەلٚ بەشەکانی دیکەی کوردستان لەو کاتەدا نە دەگونجا. قەوام ئەو پیشنیارەی بە روالەت قبولٚ کرد. بەلام زور زیرەکانە رایگەیاند کە پیشنیارەکە بە مەرجیک پەسند دەکا کە دوکتورسەلامولا جاویدیش کە ئوستانداری گشتی ئازەربایجانە دژی نەوەستی.» (٤٦)

ئەم بۆ چوونانە لە بەر ئەوەی لە هیچ سەنەد و بەڵگەی رەسمی و لە وتو وێژەکەشدا بلاو نەکراونەوە، ناکرێ بە دوکومێنت حیساب بکرێن. لە لایەکی تریشەوە گریمان پێشنارێکی ئەوتۆش لە گۆرێدا بووبێ( کە مەعلوم نیە هەبوو

بێت) ئەمە دەکەوتە دوای چوونە دەری ئۆردوی هاو پەیمانەکان لە ئێران و ناوچەی کرماشانیش لە ژێر نفوزی بەریتانیا دەچوە دەر و ئیتر ( دوژمنایەتی ئینگلیز لە گەڵ کۆماری کوردستان) مانایەکی نابێ . چونکە ئەو دەم ئیتر کۆماری کوردستانیش ناوی نامێنێ. دیارە وەک رۆژنامەی کوردستان دەنووسێ سەفەری پێشەواش بۆ تاران ( نیوەی مانگی گەلاوێژ ١٣٢٥ نەبوە رۆژنامەی کوردستان لە ژمارە ٢٥/٤/٣٠ دا دەنووسێ:« پێشەوا رۆژی ٢٥/٤/٢٧ - ١٨/یولی ١٩٤٦ لە سەفەری تاران گەراوەتەوەو گەیوەتەوە مەهاباد.»

بە هەر حاڵ. **پێشەوا قازی** بێ ئەوەی لە سەفەری تاران و وتو وێژ لە گەڵ قەوام نەتیجە وەر بگرێ بۆ مەهاباد دەگەرێتەوە. پێش گەرانەوەی لە وتو وێژێکدا لە وەڵامی پرسیاری ئاغای **قورەیشی** ئەندامی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی رەهبەر لە بارەی سەفەرەکەیدا دەڵێ: «.... ئەمن چەند جەلەسە دەگەل ئاغای **مظفر فیروز** معاونی سیاسی ئاغای **قوام السلطنه** سەرک وەزیرو ئاغای **سەر لەشکر رەزمارا** وە دوو جار لە گەڵ جەنابی سەرەک وەزیر مولاقاتم کردوە. نەزەری ئاغای سەرەک وەزیرم زور تیکەڵ بە حوسنی ظەن و چاک نیەتی دیوە. داخەکەم بەر هەلستیکی کە گفتگوی ئیمەی وەدوا خست نەخوشی جەنابی ئاغای **قوام السلطنه** بوو لە خودام تەلەبە زوتر چا بیتەوە تا موزاکرە بە خێر و خوشی و نەفع و قازانجی ئازادی دوایی بیت.»(٤٧)

بە لای منەوە هیچ گلەیی لە پێشەوا ناکرێ کە لەئاست پیرە رێوی هەڵسورێنەری سیاسەتی ئێران ئاوا حوسنی نیەت نیشان بدات و بە قەوڵ و بەڵێنی قەوام هیوا دار بێ. قەوامێکی کڵاوی لە سەری ستالین نابێ و چاوی دیپلۆماسی رووس بە هومێدی دەر هێنانی نەوتی شیماڵ نووساند بێ، زۆر باش دەتوانێ کوردی بێ پشتیوانی قاڵ نەبووی کورەی سیاسەت بخاپێنێ. با بزانین پێشەوای کورد لە بەر ناچاری چۆن کەوتۆتە ژێر تەئسیری درۆو فیشاڵی قەوامی فێڵباز و بە داخەوە وەک عەجەمی نەناسیبێ وایە.

پێشەوا لە وتارێکی خۆیدا بە بۆنەی سەفەری بۆ لای ورمێ دەڵێ: « ....... تا یەک ڕۆژم لە دنیا مابێ دەست لە فیداکاری هەڵناگرم و بە هەموو کەسێکی دەسەلمێنم کە کورد شایانی ژیانە. و دیسان بۆ خۆتان دەزانن کە لە پێشدا ئێمە بە هیچ جۆرێک داوای تەجزیەی ئێرانمان نەکردوە وتەنیا مەبەستمان ئازادی خومان و پاراستنی دیموکراسی بوو. بەلام لە پێشدا کار بەدەستانی ئێران بێجگە لەوەی جوابیان نەدایەوە شوخیشیان بە داوای ئێمە دەکرد و ناچار بوین حکومەتی میللیمان دامەزراند و هێزی خومان لە بەرانبەر ئەوان تاقیکردەوە. ئەوان کە ویستیان لە مە بێنە پێش، ئێمەش لەوان چوینە پێش. ئێستا ئەوان حازر بوون پاشە کشی بکەن، ئێمەش ئامادە بووین بکشێنیەوە. ئەوان دەگەڵمان هاتونە باری پیاوەتی، ئێمەش گوێیان بو رادەگرین. لە سەفەری تارانم دا لە گەڵ ئاغای قوام السلطنە زوورم گفتگو کرد. ئاغای قوام نەزەرێکی موساعیدی دەگەڵ کوردان هەیە. ڕۆژێک ئاغای قوام پێی گوتم : ئەوا ئێمەش بووینە دیموکرات و حیزبی دیموکراتمان دامەزراندوە. وا بە باش دەزانم کە نێوی حیزبی دیموکراتی کوردستان بگۆرن و نیوی بنێن حیزبی دیموکراتی ئێران. منیش وەلامم داوە: کە من بە بێ تصویبی کومیتەی مەرکەزی هیچ کارێکی ناکەم چونکو دیموکراتی مانای ئەوەیە کە شەخس نە توانی مەسلەحەتی میللەتی بی مشاورە بگرێتە دەستی خوی. ئاغای قوام دانی بەوەدا هێنا کە کوردستان شایانی تەقدیرە و میللەتی کورد ئامادەی هەموو جورە فیداکارییە. بو گەیشتن بە ئازادی ودیموکراتی گوتی :« نیهزەتی دیموکراتی کوردستان بە پشتیوانیکی گەورەی خومان دەزانین و ئومیدمان ئەوەیە کە بە هوی نیوەوە دیموکراتی لە تەواوی ئیراندا بلاو بیتەوە.» (٤٨)

ئەم بیر و بۆ چوونەی پێشەوا ئەگەر بە مانوز و پلانی سیاسیش حیساب بکرێ، لە کردەوەدا بۆ بزووتنەوەی کورد ئەنجامێکی لە باری نە بوو. لە بواری سیاسی و دیپلۆماسیدا کوردستان کرا بوو بە پاشکۆی ئازەربایجان و دام و دەزگای

کۆماری کوردستان و فیدا کاری و ئامادەیی کۆمەلأنی خەڵک و عێل و عەشیرەتی کورد کە پێشەواش لە وتارێکی خۆیدا شانازیان پێوە دەکا، گشتی کرابوونە .( **کوردەکانی داتیشتوی ئازەربایجان** ) و کوردستانیش کرابوە ( **کوردستانی ئازەربایجان**). لە بواری نێو خۆیی و بەرگری و پەلاماردا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان و هێزی نەبەزی بارزان لە جێگای خۆیان لە جەبهە چەقی بوون ودەست و باڵیان بەسترا بوو، بە چاوە روانی چارە نووسی نادیاری خۆیان رۆژیاندەبردە سەر. بە قەولی پێشەوا : ئاغایانی مامەش و پیران و زەرزا و دێبوکری پۆل پۆل بە شەرافەتمەندی چوونە جەبهە و بە سەر بەرزی گەرانەوە.» بە رای من ئەم گەرانەوەو سارد بوونەوە ودەست لە سەر دانانە بوو بە هۆی ئەوە کە هێندێ لە عەشیرەتی دێبوکری و شکاک و هێندێ لە مامەش و مەنگور وگەورک، وردە وردە نەک هەر بێ لایەن و بێ زەبر دابنیشن، بەڵکوو دەستیشیان کرد بە هەڵتۆز هەڵتۆز و رۆیشتن بۆ لای دوژمن وپێوەندی گرتن بە ئەفسەرانی ئێرانی لە سەقز و پێوەندی بە باڵیوز خانەکانی ئینگلیز و ئەمریکا بۆ بنکۆڵ کردنی حکومەتی میللی کوردستان وگاڵتە کردن بە چارە نووسی نەتەوەکەیان. پێشەوا لە وتارێکی خۆیدا ئاماژە بۆ ئەم مەبەستە دەکا و دەڵێ: «.....هێندێ لە برایەکانمان بە قسە کیوی بیستون بوون، بەلأم بە کار میشولەش تەواو نەبوون. کورد ئەوانەی یەک بە یەک ناسی زانی کە بە قسەی گەورە کورد سەر ناکەوێ. بە کار میللەتی کورد دەگاتە هیوای خۆی و لە وەختی خۆیدا هەر کەس بە میزانی خزمەت جەزای دەدرێتەوە. بەشێک ویستیان کە بۆ ئازادی هەوڵ بدەن و مەرامی خۆیان بیەنە سەر، بەلأم داخەکەم هێندێ کاری نا شیرینیان کرد کە بوە لەکە لە سەر خۆیان.برایانی خۆشەویست: ئەمن لە ئێوەم دەوێ کە تەنیا شەڕکەر نەبن بەڵکوو چەکێکی وا هەڵبگرن کە بتوانن بەرامبەری دەگەڵ لەشکری میللەتانی تر بکەن.ئەو چەکەش(عیلمو زانستە). مەرحەلەی شەڕ تەواو بوو نۆبەی هونەرە... ئەمن لە ئێوەم دەوێ کە بە زانست بەربەرەکانی دوژمنان بکەن.«چەک بێ عەقڵ

دوژمن نابرێ»... بەڵام داخەکەم ئاغاکان ئامادە نین کە لە میوەی خوێندن بەهرەوەر بین.ئەگەر بڵێم کورەکانتان، برایەکانتان بهێنن بیان نێرم بۆ جەبهە باکیان نیە، ئەگەر دە کوری هەبێ هەر دەیان دێنێ، بەڵام ئەگەر بڵێم بۆ خوێندنیان دەنێرم رووی خۆیان گرژ دەکەن و عوزری ناموەجە دیهێننەوە.ئەگەر پێیان بڵێم مەدرەسەیەک لە دێیەکان بکەنەوە مات دەبن، ئەو کارە پەستانەش سەبەبی ئەوەیە کە هێشتا لە بەری خوێندەواریان نەخواردوە، نازانن ئینسان« بێ سەواد ئەگەر رۆستەم بێ بە کاری دوو شایی نایە.... » (٤٩)

ئەوەش هەر دەگەرێتەوە بۆ ساوە ساوی سەر کردەکانی کۆماری کوردستان و یەک نەبوونیبۆ چوون و بیرو رای رێبەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستان سەبارەت بە مەسەلەکانی رۆژ و هەڵوێست لە بەرانبەرسیاسەتی حکومەتی تاران و رێک کەوتن نامەی تاران- تەوریز. کاریناشیرینی (هێندێ لە براکان) وەک پێشەوا دەفەرموێ بۆ سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگی چاوە روان کراو بوە. هێندێ لەوانە هەمیشە کاتێ هەست بە لاوازی و بێدەسەلاتی نەتەوەیی دەکرێ، بزوتنەوەو میللەت و نیشتمان فیدای بەرژەوەندی شەخسی دەکەن و رێگای خۆیان لە میللەت جیا دەکەنەوە و هەموو کوردستان بە مەرحەبایەکی دژمن دەفرۆشن. لەو کاتەدا کە پێشەوا باسی ئەوانە دەکات، لە نێو مەنگوران **عەولای بایزاغای**، لە نێو مامەشان **عەزیزی ئەمیر عەشایری**، لە نێو گەورکان **بایزی عەبزاغای** لە گەڵ دارو دەستەی خۆیان رایان کرد بوو چوو بوونە تاران. سەرۆکی عەشیرەتی دێبۆکری **ئەمیر ئەسعەد لە گەڵ** لەشکری ئێران هاتبۆوە سەقز و چاوە روانی دەرفەت بوو کە لە خزمەت ئەفسەرانی ئەرتەشی ئێراندا بێتەوە کوردستان.

ئاغایانی ئێلخانیزادەی دێبۆکری کە سوێند خۆری **کۆمەڵەی ژ.ک** بوون و دوو کەسیان لە حکومەتی میللی دا وەزیر بوون، لەشکر کۆ دەکەنەوە و خۆیان بۆ بەر بەرەکانی و دژایەتی چەکدارانە لە گەڵ حکومەتی میللی ئامادە دەکەن.نامەی

مستەفا بارزانی بۆ حەمە رەشیدخان پیلانی ئیلخانیزادەکان بە جوانی نیشان دەدات:

۱۳۲۵/۲/۱۸ -- ژمارە ۱۰ - هێزی دێموکراتی کوردستان ( لقی بۆکان)

بۆ: فەرماندەی بەرزی هێزی بوکان و سرا جنرال مایور محمد رەشید خان

لە: فرماندەی کل هێزی بارزان جنرال مصطفی بارزانی. موضوع / قضیەی دیبوکری

۱ - لە سایەی هیمەتی هەمو لایەک وە لطف و مەرحمتی حضرتی پیشەوای معظم کاری عەشیرەتی دیبوکری وە ئاغایانی ئیلخاتی زادە تەواو بو وە ایستا آغای محمودآغای ایلخانی زادە وە کورانی محمودآغا و حاجی بایزآغا لە بوکان لە لای منن وە لە بەر ئەوەی حاجی بایزآغا زۆر نەخۆشە اجازەی نەهاتنیم داوە. وە ایستا خوم چاوەروانیتشریف هینانەوەی حضرتی پیشەوا دەکەم کە ئاغایان بچنە خزمەتی وە اظهاری دەستی اطاعت دریژ کردن بو دەولەتی جمهوری کوردستان و حضرتی پیشەوا.

۲ - عدەیەک لە عەشیرەتی زەرزا حالی حاظرلە هەر دوو دیی ناچیت و وشتەپەن. ئەگەر ئەم عدەیە هاتون کە لە جبهەدا اشتراک بکەن دستور بفرمون کە حرکت بکەن چونکە من امرم دا کە لەشکری دیبوکری بلاوە بکات وە فعلا بلاوەیان کرد ایجاب بە عدە ناکات کە لەودو دیبە بن. ژنرال فرماندهی کل هیزی بارزانیتان مصطفی بارزانی. »( ٥ )

لە لاجانی مامەشان عەلی ئەمیر عەشایری و سەلیم خانی شاوەلە بە پیرێژنێکدا نامەی جاسوسی بۆ ئەفسەرانی ئێران دەنێرن. لە رێگا بارزانیەکانی پۆستی گوندی گەرگولێ نامەکە لە بن دیزە ماست دێننە دەر و پیرێژن دەبەنە مەهاباد. حکومەتی میللی کوردستان لە جیاتی سزادان ئەم دوو ئاغایەی هێنا مەهاباد و لەوێ دایان نان سەبری روو داوەکانیان دەکرد و کاتی هاتنەوەی لەشکری ئێرانش بە پێشوازی ئەرتەشی ئێرانەوە چون.

**ئارچیبالد روزولت** وابەستەی نیزامی ئەمریکا کە ئەو دەم سەری کوردستانی داوە دەنووسێ: « ئەمەر خان کە دوای کوشتنی **سمکۆ** بیوە سەرۆکی عیلی شکاک و بۆ ماوەیەکیش وەزیری شەری **قازی محەممەد** بوو، لە مانگی مای لە گەڵ هێندێ لە تایفەی خۆی بۆ شەری دژی ئەرتەشی ئێران چوو بوە ناوچەی سەقز، پاشان خۆی لە **قازی محەممەد** دوور خستبوە و چوو بوو لە گوندی یاو ویاپیرانی لە «زێندەشت» دانیشتبوو. من نامەیەکی **عەولای ئیلخانیزادەم** پێ بوو کە لە تاران بۆی نووسیبوو. ئەو نەیتوانی ئاسنامەکە بخوێنێتەوە دای بە کورەکەی. لێم پرسی لە دەوڵەتی ئێستا دا شوێنی چیە؟ گوتی لە سیاسەت و سیاسەتبازی‌دا زۆرم گوێرە وەری دیوە. دوای حەپس لە زیندانی رەزا شادا لە هەموو جورە سیاسەتێک کشامەوە و تەنیا وێستیاری ئاشتیم بۆ خۆم و تایفەکەم.

دوو حەوتوو دوای چاو پێکەوتنم **ئەمەر خان** رۆژی ٢٧ی سیپتامبر کونسولی ئەمریکا لە تەورێز نامەیەکی لە عومەر خانەوە پێگەیشت کە بیگەیێنێتە **قوام‌السلطنە. ئەمەر خان** لە نامەکەدا وەفاداری خۆی لە ئاست دەوڵەتی ناوەندی راگەیاند بوو.» ( ٥١ )

**ئیگلتون** فراوانتر باسی نامەی **ئەمەر خان** دەکا و دەنووسێ:« **ئەمەر خان** بۆ وەدەست هێنانی موافەقەتێکی مەسڵەحەتی، هەر وەک سەرۆکانی عەشایری هاو فیکری‌داوای لە کونسولی ئەمریکا کرد لە تەورێز کە پەیامێک بۆ قەوام بنێرێ و لە پەیامەکەدا بڵێ: دەوڵەت لە بەرانبەر رەفتاری هێدی و ئارامی خۆی لە ناوچەدا دەتوانێ بە وەفاداری کوردەکان هیوا دار و دڵنیا بێت. قەوام لە وەڵامدا گوتبووی : چۆنیەتی رەفتاری دەوڵەت لە گەڵ خەڵکی ناوچە، بەستراوەتەوە بە نیشاندانی کردەوەی وەفاداری کوردەکان لە ئێستاو دوا رۆژدا بە تایبەت لەم کاتە پەشێو وئالۆزەی ناوچەدا. رۆژی دوازدەی نوامبر نوێنەری **ئەمەر خان** زۆر بە پەلە لە تەورێزەوە بەرەو ناوچەی شکاکان کەوتە رێ تا

خەبەر بەرێ کە لەو نیزیکانە ئەرتەشی ئێران بۆ ناوچە دەگەڕێتەوە .»(٥٢)

ئەمە لە لای شکاک و مەنگور و مامەشان. ئێستا با بزانین کونسولی بەریتانیا لە تەوریز لە راپۆرتی خۆیدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا سوێند خۆرێکی **کۆمەڵەی ژ.ک** و ئەندامی شورای جەنگی کۆماری کوردستان چۆن دەناسێنێ :

Public Record Office Fo 156/2596 xc o333
Consulate - General BRITISH
TABRIZ
September 11th, ١٩٤٦

**نهێنی**

**ژمارە ٣.**

**(٤٦/ ٧ ئەی /٦٤٥/ .٨٥ )**

**لە لایەن جێی . دەبلیو . واڵ کونسولی گشتی بریتانیا ، لە تەوریز**

**بۆ : سر جان ئێچ . لو رۆژ تێل، کەی، سی، ئێم، جی. ئێم ، سی.**

**سەفیری ئەعلا حەزرەت ( سەفیری بریتانیای مەزن ) لە تاران**

**١١ی سێپتامبری ١٩٤٦**

**گەورەم ،**

**به شانازی دەزانم قسەکانی زۆر سەرنجڕاکێشی قاسم ئاغای ئێلخانی زادەی عەشیرەتی دێبۆکریتان سەبارەت بە وەزعی کوردستان پێ ڕابگەیەنم. ئەو دوێنێ چاوی بە من کەوت و لە سەر ئەو دیدارە بە تێلگرامی ژمارە ٢٨٥ ئاگادارم کردن.**

**٢ - قاسم ئاغا کوری بایزیدئاغایە، کە لە گەڵ براکانی مەحمود ئاغا و عەلی ئاغا ( ئەمیر ئەسعەد ) عەشیرەتی‌دێبۆکری کۆنترۆڵ دەکەن و لە ناوچەی**

بزکان که کەوتۆتە خوارووی میاندواو زەوی و زارێکی زۆریان هەیە. **بایزید و مەحمود** لە کۆنەوە لە گەڵ **عەلی ئاغا** کێشەو قڕەیان هەبوە، وتەو بنە ماڵە بە گشتی لەوەتا **قازی محەمەد** سەری هەڵێناوە و رووسان پشتیان گرتوە لە گەڵی لە کێشە دان. قاسم یەک لەو سەرۆک عەشیرەتە کوردانە بوو کە پارەکە لە لایەن دەسەلاتدارانی شورەوییەوە بۆ « زانیاری پێدان » بانگێشتنی باکۆ کران.

ئەگەر چی **قاسم ئاغا** دوای گەڕانەوە لەو سەفەرە باسی وتو وێژەکانی خۆی بۆ گێرامەوە، بەلاّم ئەمن لەو بڕوایەدا نیم ئەو لە سەر یەک ئەو لایەنگرەی بریتانیا بێ کە خۆی دەیەوێ وا نیشان بدا. ساختر ئەوەیە ئەو وەکوو هەموو سەرۆک عەشیرەتێکی دیکە وەک دەستنیژ، هەلپەرست و جێی بروا نە بوون دابندرێ. ئەمن لە دوای شورشی ئازەربایجان لە دیسامبری رابردوو دا چاوم بە **قاسم ئاغا** نە کەوتبوو.

٣ - **قاسم ئاغا** بە گشتی گوتی: کارو بارەکانی حکومەتی نیشتمانی کوردستان، لە قوڕ چەقیوە و چ پارەیەکی ( بۆ راپەراندنی کارو بار) بە دەستەوە نیە. ( ئەو گوتی ) **قازی محەمەد** کە بە رواڵەت سەرۆکی حکومەت و حیزبی دیموکراتی کوردستانە، دەسەلاتێکی زۆر کەمی بە سەر عەشیرەتەکاندا هەیە و ناتوانێ پشت بە وەفا داری هیچ کامێک لە سەرۆک عەشیرەتەکان ببەستێ. کوردەکان لە بەر ئەوە **قازی محەمەد**یان وەک سەرۆکی رواڵەتی قبوڵ کردوە، چونکوو لە حاڵی حازردا کلیلی عەمباری چەک و پارەی رووسانی بە دەستەوەیە. وتو وێژەکانی قازی لە گەڵ **قەوامو سەلتەنە** لە سەرەتای مانگی ژووئیەدا نەگەیشتە هیچ کوێ: **قەوامو سەلتەنە** پێکێشی دەکرد کوردەکان لە ئازەربایجان وەک بەشێک لە دانیشتواتی ئازەربایجان رەفتاریان لە گەڵ دەکرێ و ئەو تەگبیر و هەنگاوانەی کە لە ١٤ی ژوئێن لە نێوان تاران - تەوریز دا رێکەوتنی لە سەر کراوە ئەوانیش دەگرێتەوە. **قازی محەمەد** ئەوەی قەبوڵ نەکردوە.

٤ - **مەلا مستەفای بارزانی** ئارەزووی ئەوەی لە سەر دایە **قازی محەممەد** لە سەرۆکایەتی بزوتنەوەی نیشتمانی کورد وەلا بەرێ. **مەلا مستەفا** و پیاوەکانی لە سەرە تای ئەمسالدا باری قورسی شەڕیان دژی هێزە ئێرانیەکان لە ناوچەی سەردەشت - سەقز بە سەر شانەوە بوو بە پشتیوانیەکی زۆر کەم لە لایەن کوردەکانی ئێرانەوە. **مەلا مستەفا** نێزیکەی هەزار چەکداری هەیە. رووسەکان چەکیان داوتێ و **مەلا مستەفا** بۆ خۆی ئەو پەری هەولێ خۆی دەدا بۆ ئەوەی رووسەکان وا لێ بکا لە جیاتی **قازی محەممەد** پشتیوانی لەوی بکەن. **قاسم** لەو بروایەدا بوو ، **حەمە رەشید** چۆتەوە عیراق.

٥ - سیاسەتی کوردەکانی رەزائیە بە تەواوی هەلپەرستانەیە. **ئەمەر خانی** شکاک، سەرۆک عەشیرەتی هەرە گرنگی ئەو ناوچەیە، ئامادەیە لە هەر کەسێکی پارەی بداتێ لێی وەر بگرێ بە بێ ئەوەی بەلێنی خۆی بە جێ بێنێ و خاوەنی قسەی خۆی بێ. بەهاری رابردوو ئەو ....٢٠ تمەنی لە رووسەکان وەر گرت بۆ ئەوەی هێزێک بنێرێ بۆ جەبهەی سەردەشت - سەقز. ئەو چوە ئەوێ و لە مەهاباد ....٥٠ تمەنی دیکەشی لە **قازی محەممەد** وەر گرت. بەلام پیاوەکانی ج شەڕیان نەکرد و زوو پاشە کشەیان کرد. بەو زوانە ئەو سەری لە تەورێز داوە ( بڕوانە یاد داشتەکەی مانگی ژوئیەی من ) و لە لایەن حکومەتی ئازەربایجانەوە دوو ئوتوموبیل، پارەو چەکی بە دیاری دراوەتێ.

٦ - پێوەندی رووسەکان لە گەڵ کوردەکان بە هۆی سەر دانی جار وباری کار بە دەستانی کونسولی شورەوی دانیشتووی تەورێز و رەزائیە لە مەهاباد درێژەی هەیە. بەلام ( ئەو پێوەندییانە ) بە دەرەجەی یەکەم بە رێگەی نوێنەرێکی دەزگای بازرگانی رووسی دانیشتوی مەهاباد کە گەنم و توتنی کوردی دەکرێ و قەند و شەکر و کوتالی رووسی دەفرۆشێ هەلدەسورێ. ئەو هەر وەها رێکخشە بۆدابینکردنی چەک و وەک نوێنەری سیاسی دەبزوێتەوە. ئەو موسلمانێکی خەلکی باکۆیە.

٧ - لە کاتێکدا کوردەکان بۆ خۆیان تا هومێدانە بلاْو وبێ سەرەن، گشتیان لە دژی بیری توانەوە لە ئازەربایجان دان،. ئەوان سکالاْیانە پەیمانی ئازەربایجان - کوردستان کە لە ٢٣ی ئاوریل ئیمزا کراوە ( گوزاریشی ژمارە ١٩ی من لە .١ی مای ١٩٤٦ ) تا ئەو جێگەیەی کە دەگەرێتەوە سەر شوێنە تێکەلاْوەکانی رەزائیە و میانداو جێ بە جێ نەکراوە. بە پێچەوانە، حکومەتی ئازەربایجان دەسەلاْتی بە سەر مەلْبەندی تەواو کورد نشیندا داگرتوەو بەو زوانە **محەممەد حوسێنی سەیفی قازی** ( وەزیری شەر لە حکومەتی نیشتمانی کوردستان‌دا ) داناوە کە ببێتە فەرمانداری مەهاباد. حکومەتی ئازەربایجان هەر بە هەمان شێوە مافی بە خۆی داوە **غولاْم یەحیای دانشیان** بکاتە فەرماندەی ژاندارمەری لە مەهاباد.

( تیلگرامی ژمارە .٢٧ ی من ). قازی محەممەد زۆر بە توندی دژی ئەو کارە ئیعتیرازی کرد و رایگەیاند کوردەکان رێگە بە چ ( دەزگایەکی) ژاندارمەری جگە لە ئی خۆیان نادەن. لە گەلْ ئەوەشدا دانشیان سەری لە مەهاباد دا، بە روالْەت دوای ئەوەی **قازی محەممەد** بوو بە دەستەبەری هاتن و چوونی بەسلاْمەتی.

٨ - کوردەکانی ماکۆ و خۆیەش هەر ئاوا بێز و قێزیان لە دەسەلاْت بە دەستەوە گرتنی حکومەتی ئازەربایجان دەبێتەوە. ئێستا نوێنەراتی ئەو شوێنانە لە تەورێزن بۆ ئەوەی راوێژ بە **قازی محەممەد** بکەن. **شێخ عەبدولقادر** سەرزک عەشیرەتی کۆنە سالْی کوردە جەلالیەکانی ماکۆ سەری ناوەتەوە و ئێستا کورەکەی **حەسەن‌ئاغا** جێی ئەوی گرتۆتەوە. ئەو قسانەی **قاسم‌ئاغا** سەبارەت بە هەولْی کوردەکان بۆ داگیر کردنی خۆیە لە بەرایی مانگی ژوئیەدا بۆی گێرامەوە تا رادەیەکی زۆر هەر ئەوانەن کە من لە گوزاریشی ژمارە ٢٤ی خۆم پاراگرافی ٨و٩ لە ٢٣ی ژوئیەدا پێم راگەیاندن. ئەو لێی زیاد کرد و گوتی هێزی کوردان لە عەشیرەتی ملی ( یان میلان) پێک هاتبوون و لە ژێر سەرۆکایەتی **سەعیدئاغا** دا بوون. ئەو هەر وەها رایگەیاند کە کوردەکان هێشتاش کومیتەیەکی لە مەر حیزبی خۆیان لە خۆیە هەیە. فەرمانداری ئێستای

ئازەربایجان لە خۆیە، جەبباری زاریع، بە توندی دژی کوردە.

٩ - لە ڕەزائیە کوردەکان چپڕ لە حکومەتی ناوچەییدا بەشدار نین. خاوەن مڵکە کوردەکانی ناوچە حاسلاّت و خەڵەو خەرمان بە پێی سیتمی کوردی دابەش دەکەن، بەلاّم خاوەن موڵکە عەجەمەکان دەبێ قانونی دابەشنەوەی حاسلاّتی ئازەربایجان ڕەچاو کەن.

١٠ - تا ئەو جێگەیەی بگەڕێتەوە سەرسیاسەتی کوردی بە گشتی، **قاسم‌ئاغا** لەو بڕوایە دابوو کە ئیدیعای حیزبی دیموکراتی کوردستان کە دەڵێ هەر داوای خود موختاری لە چوار چێوەی دەوڵەتی ئێراندا دەکا لە بیانوییێک نەبێ زیاتر نیە ، پێشنیاری **قازی محەممەد** بۆ هاو کاری لە گەڵ جەبهەیەکی یەکگرتووی پارتیە ئازادیخوازەکانی ئێران، دڵپاکانە نیە. ئاماٌجی ڕاستە قینە وەک جاران کۆمارێکی بە تەواوی سەر بەخۆی کوردستانە کە کوردەکانی ئێران، عیراق، تورکیا و سوریا بگرێتەوە. **قاسم‌ئاغا** گوتی: گشت بزووتنەوەکە لە لایەن رووسەکانەوە دنە دراوە و بە ڕێوە دەچێ. ئەو رایگەیاند کە قازی محەممەد زۆرجار پێی گوتوە کە ئەو بۆ خۆی ناتوانێ بە پێی ئیرادەی خۆی هیچ بکا، وردێک و ڕاست دەبێ سەر وەبەر فەرمانی رووسەکان بهێنێ.

١١ - **قازی محەممەد** بە پێی ئامۆژگاری رووسەکان، ئەوەی لە دەستی هاتوە کردوویە بۆ ئەوەی عەشیرەتی دێبۆکری ناچار بکا لە گەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستاندا هاو کاری بکەن. پاش ئەوەی کە ئەو بە زمانی خۆش ڕێبەرانی دێبۆکری پێ ڕام نەکرا ئەم هاوینە خەڵکی بە دوادا ناردن کە بیانهێنن بۆ مەهاباد. ئەوان بە قسەیان نە کرد و ملیان تەدا بچن. دوای ئەوە **قازی محەممەد** هێزێکی هەزار کەسی چەکداری ناردە بۆکان. لە ئاقار ئەم مەترسیەدا **قاسم‌ئاغا** ئەندامانی بنە ماڵەی خۆیانی دنە دا بۆ ئەوەی کێشەو دوو بەرەکی ناو کۆیی خۆیان یە لادا بخەن و **ئەمیر ئەسعەد** و براکانی بە یەکەوە ئاشت بوونەوە. کاتێک هێزی ناردراوی مەهاباد گەیشتە بۆکان ئیلخانی زادەکان بەرەو یەکێک لە گوندەکانی

خزیان کە چەند میلێک لە شارەوە دوور بوو پاشە کشەیان کرد، و بە چەک شەتەکدان لە پیرەوەکانیان ، خزیان لە ئاست سەر بازانی کورد ئامادە کرد. لە هەمان گات دا وەلأمیان نارد بۆ گشت ئەندامانی عەشیرەتەکەیان کە وەچیا کەون و لە بەرزاییەکانی قایمی یەکێک لە دێیەکانی خزیان داکوتا و ئامادەی دەستکردنەوە بوون. قازی ئەو جار رووی لە سەرۆک عەشیرەتەکانی لای رۆژ ئاوا نا و هێزێکی تێکەلأوی لە عەشیرەتەکانی شکاک و هەرکی کە ئەندامانیان دە گەیشت بە « هەزاران کەس» کۆ کردەوە و ئەوانە دێبۆکرییەکانیان گەمارۆ دا. ئینجا قازی محەممەد لە ئیلخانی زادەکانی ڕاسپارد بێنە رەدایە. ئەوان هەستیان پێکرد ئەو هێزەی گەمارزی داون زۆر لە وان زیاترە. هەلو مەرجەکانی قازی محەممەدیان قەبولْ کرد.

١٢ - سەرە رای ئەوەش قاسم‌ئاغا لەو بروایە دایە کە بنە مالەکەی لە ژێر مەترسیەکی زۆردایە، چونکوو رووسەکان ئەوان بە دوژمن دەزانن و درەنگ یا زوو بە تەواوی لە ناویان دەبەن. ئەو رایگەیاند کە ئیلخانی زادەکان خۆ رادەگرن، بەلأم چ هیوای بە سەر کەوتن نیە. مەگەر ئەوەی بریتانیای مەزن یارمەتیان پێ بکا. ئەو گوتی : داوای یارمەتی لە سەر تیپ هومایونی فەرماندەی ئێران لە سەقز کردوە، بەلأم سەر تیپ بە ساردی وەلأمی داوەتەوە و گوتوویە کە فەرمانەکانی چی‌یان لێ شێن نابێ. ئێلخانی زادەکان هیچ هیوایان بە پشتیوانی حکومەتی ئێران نیە. قاسم‌ئاغا لەوە دەگەیشت کە ناکرێ بریتانیا بە رێگای تەورێزدا چ یارمەتی بە عەشیرەتەکەی بکا. بەلأم لە بەر ئەوەی کە خەتی پێوەندی ئەوان لە گەلْ عیراق دا جارێ هەر ئاوالەیە داخوازی ئەوە بوو داخوا ناکرێ هێندێک مەعموری حکومەتی بریتانیا لە وێوە بێن و سەر لە بۆکان بدەن و ئامۆژگاری و یارمەتیان پێ بکەن. ئەو رایگەیاند ئەگەر دێبۆکرییەکان لە لایەن بریتانیاوە برێکیان یارمەتی پێکرا بایە، دەیانتوانی حیزبی دیموکراتی کوردستان و گشت بزووتنەوەی نیشتمانی ئەو دراییانە تەنانەت بەر لەوەش کە دەست پێ بکا، تێک

بروو‌خێنن.

۱۳ - ئەمن لە قسەکانم دا هەوڵم دا خاوی کەمەوە و بۆم روون کردەوە کە **قاسم‌ئاغا** بەو پێشنیارەی هەمان شت دەکا کە بە پێی ئەو سەر زەنشتی **قازی محەممەد** دەکا. باشترین شت بۆ ئەو ئەمەیە لە گەڵ **قازی محەممەد** لە ئاشتیدا بێ و بە راشکاوی تێی بگەیێنێ کە تەنێ تا ئەو کاتە دۆستی ئەو دەمێنێتەوە کە **قازی محەممەد** دڵپاکانە بۆ وەدی هێنانی ئاواتە رەواکانی کورد کار بکا و رێگە چارەیەکی هێمنانە لە گەڵ حکومەتی ناوەندی ئێران بدۆزێتەوە. ئا لێرەدا بوو کە **قاسم‌ئاغا** بە دەمەدا هاتەوە و گوتی : قسە کردن لە گەڵ **قازی محەممەد** چ فایدەی نیە چونکوو لە راستیدا ئەو گشت فەرمانەکانی لە رووسەکان وەر دەگرێ.

۱٤ - ئەمن لە کاتێکدا بۆم دەر کەوت چ کەڵکێکی ئەوتۆی نیە قسەکانم سەبارەت بە پرەنسیپی بەرز لە گەڵ پیاوێک درێژە پێ بدەم کە مەیلی سەرەکی ئەوەیە کە چلۆن رەقیبێکی لە مێژینەی خۆی تێک بشکێنێ و دەوڵەت و سامانی ماددی خۆی لە ئاست هەرەشەی کومونیزم بپارێزێ. هەوڵم دا **قاسم‌ئاغا** ئەوە تێبگات کە باشترین موقانە و دڵنیایی بۆ عەشیرەت و بنەماڵەکەی ئارامبوونەوەی گشتی کوردستانە و باشترین داکۆکی لە ئاست تێخزان و نفوزی رووسان بەر هەڵستکاریەکی بە راستی یەکگرتووی خەڵکی ئێرانە. لە گەڵ ئەوەشدا ئەمن هەستم کرد کە **قاسم‌ئاغا** بە بیر کردنەوەی قوڵ لە بزر بوونی تەواوی حکومەتی ئێران لەم ئوستانەدا و دەسەلاتی رارای لە شوێنەکانی دیکەی ئەم پادشاییەدا، دەکرێ لە بەر دڵراوەکێ و بە گومان بوونی مرۆڤ لێی خۆش بێ.

گەورەم ئەمن شانازی بەوە دەکەم خزمەتکاری هەرە گوێ رایەڵی خۆ بە کەمگرتان بم.

ئیمزا : جێی .دەبلیو . واڵ

(sgd) J.W.WALL

sir John H,Le Rougetel . K.C .M . G . , M, C
His Majesty , s Ambassador TEHRAN

حکومەتی میللی کوردستان لە ناو ئەم گێژاوی سیاسەتی دەرەکی و بێ بڕیاری و ناتەبای نێو خۆدا، بۆ دۆزینەوەی ڕێگای دەرباز بوون دیسان لە تێکۆشان نەوەستا و پێشەوا لە تیلگرامێکدا بەشداری حیزبی دێموکراتی کوردستانی لە بەرەی یەکگرتووی حیزبەکانی ئێراندا ڕاگەیاند. ئەم بەرەیە لە پێنج حیزبی وەک حیزبی دێموکراتی قەوام، حیزبی تودەی ئێران، حیزبی ئێران، فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان و حیزبی دێموکراتی کوردستان پێک هات. دوو هێزی سەرەکی ئەو دەمی ئێران واتە حیزبی دێموکراتی قەوام و حیزبی تودە هەر یەک بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان پێکهاتنی بەرەیەکی ئەو توزیان گەرەک بوو. قەوام بۆ وەدەست هێنانی فرسەت تا کابینەی تازەی پێکهێناو تودەییەکانی لە دەوڵەت وەدەر نا. حیزبی تودەش بەو هیوایە کە بتوانێ لە هەڵبژاردنی دەورەی ١٥ی مەجلیسدا کورسی زیاتر وەدەست بێنێ. لەوە زیاتر پێکهێنانی بەرەی یەکگرتووی حیزبەکانی ئێران و ( پەرە گرتنی هێزە دێموکراتەکانی ئێران) کە هێندێ نووسەری کورد باسی دەکەن هیچ ئامانجێکی دیکەی نەبوو. حیزبی دێموکراتی قەوام و حیزبی ئێرانی ئەلالیار سالح بڕوایان بە مافی نەتەوەکان و بە بزووتنەوەی کوردستان و ئازەربایجان نەبوو.

دوکتور کەریمی سەنجابی کە یەکێ لە ڕێبەرانی ناسراوی حیزبی ئێران بوە دەڵێ :« قازی محەممەد چوە دیتنی ڕێبەری ئازەربایجانی شورەوی عەلیۆف یا باقرۆف، ئەوانیش لە کوردستانی سەروو دەستیان کرد بە تێکۆشانی جیاوازیخوازی. لەو کاتەدا یەکێک لە کەسانی سەر بە کۆمەڵی ئێمە لە مەهاباد ڕەئیسی فەرهەنگ بوو. کاتێ کە قازی محەممەد دەستی بە کار کرد ، ئەو بە جێی هێشت و هاتەوە تاران و ڕاپۆرتی ڕووداوەکانی دا بە من. ئەو کەسە دوکتور محەمەدی موکری بوو. دوکتور محەمەدی موکری یەکێ لە هاوکارانی ئێمە بوو. ئەو بە

ئاشكرا بە منی گوت: ئەوانە بە راستی جیاوازی خوازن. لە راستیدا لە ژێر فەرمانی رووسەکانن. ئەگەر بە رواڵەتیش شتێک دەڵێن بە تەواوی بێ بن و بناخەیە. ئێمەش لە بەرانبەر رووداوەکانی ئازەربایجان و مەهاباد دا دروشمی ئازادی و دیموکراسیمان بۆ سەرانسەری ئێران بەرز دەکردەوە. چارو بار کە هەڵدەکەوت لە گەڵ نوێنەرانی ئەوان دابنیشین، پێیانم دەگوت: ئێوە بۆ چی کارێک ناکەن کە بۆ هەموو ئێران بێ، بۆ چی هەر بۆ ناوچەیەکی دیاریکراوی ئێران داوا دەکەن کە خەڵکی دیکەی ئازادیخوازی ئێران و خەڵکی دژی ئیستیعماری ئێران لێتان وەشک بکەون و ئێوە بە پیاوی سیاسەتی دەوڵەتێکی بێگانە بناسێن. بەڵام ئەوان گوێیان بەم قسانە نەدەدا چونکە ئازادی و سەر بە خۆیی کردەوەیان نە بوو. شەری دنیا گریش تەواو دەبوو.. نیشتمانی ئێمە کەوتە قوزرتێکی نێو نەتەوەیی. لەو کاتەدا بوو کە سیاسەتەکانی نێو نەتەوەیی دە فریای ئێران کەوتن و قەوام السلطنەش هاتە سەر کار وتەمەنی مەجلیسی چاردەش کۆتایی پێ هات.»
(٥٣)

دوکتور کەریمی سەنجابی کە بە رەگەز کوردە و بەڵام هەست و بیر و تەنانەت خوێنی کوردی و کوردایەتی لە بەر دا نەماوە ئەوەندەی راست دەکا کە دەڵێ :« سیاسەتەکانی نێو نەتەوەیی دە فریای ئێران کەوتن ». ئەم دەقریا کەوتنە هەر ئەوە نەبوو کە گوشار بخەنە سەر شورەوی و لە ئێرانی وەدەر بنێن، بەڵکوو بە تەواوی یارمەتی حکومەتی ئێرانیشیان دا کە بزوتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان سەر کوت بکا. ئینگلیز وەک لە بەرابیدا باسکرا لە نێو عەشیرەتی قەشقایی و لە باشوری ئێران و تەنانەت لە کوردستانیش ئاژاوەی نایەوە تا قەوام هان بدات کابینەی خۆی لە تودەییان پاک کاتەوەو بە بیانووی ئازادی هەڵبژاردنی پارلمان لەشکر بۆ ئازەربایجان بنێرێ. رۆژنامەی زاریا وەستۆک ( شەفەقی رۆژ هەڵات) چاپی تفلیس لە ژمارەی ٢٩ی نوامبری ١٩٤٦ دا لە ژێر سەر دێری( قازی محەممەد لە بارەی چالاکی ئینگلیسەکان لە ئێرانی) دەنووسی: «

رۆژنامەی کوردستان کە لە مەهاباد دەر دەچێ وتو وێژی ڕێبەری حیزبی دێموکراتی کوردستان **قازی محەممەدی** بلاو کردۆتەوە کە دەڵێ :ئینگلیسەکان بە هەموو تواناوە هەوڵ دەدەن کە لە ئێراندا ئاژاوە ساز بکەن و دەست بخەنە نێو هەڵبژاردنی پارلمان. لە زۆر ناوچەکانی ئێران، بە تایبەت لە تاران و دەور وبەری تاران ئەوان خەڵکی خۆیان هەیە. ئینگلیسەکان لایان وایە بۆ ئاژاوە نانەوە کوردستان و ناوچەکانی خوارووی ئێران لە هەموو شوێنێ لە بار ترن. ئەوان ئێستا لە کوردستان چالاکیەکی توندیان دەست پێکردوە.»

حکومەتی ئەمریکاش کە تازە دەهات جێ پێی خۆی لە ئێران قایم بکات و جێی ئینگلیس بگرێتەوە، بە راشکاوی پشتی حکومەتی ئێرانی دەگرت. چوونی وابەستەی نیزامی باڵیوز خانەی ئەمریکا لە تاران بۆ دیتنی جەبهەکانی بانەو سەقز و سەردانی لە ناوچی ورمێ و لە مەهاباد لە مانگەکانی یوڵ و ئاوگوستی ١٩٤٦دا و دیداری لە گەڵ فەرماندەکانی ئەرتەشی ئێران لە جەبهەی سەقز، بەشێک بوو لە سیاسەتی ئەمریکا بۆ پشت ئەستووری حکومەتی ئێران بۆ لێدانی بزووتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان. نەک هەر ئەوە، بەڵکوو کاتێکی حکومەتی ئێران دەیویست لەشکر بۆ ئازەربایجان و کوردستان بنێرێ، **جورج ئالین** باڵیوزی ئەمریکا لە تاران بە ئاشکرا رایگەیاند:« ئەو مەتڵەبە کە ئێران گوتوویە هێزی نیزامی بۆ دابینکردنی هێمنایەتی بۆ تەوای ناوچەکانی ئێران دەنێرێ، مەتڵەبێکی بە تەواوی راست و سروشتی‌یە.» ئەم ئاخافتنە چرایەکی سەوز بوو بە حکومەتی ئێران نیشان دەدرا و بە ئاشکرا لە سەر کوتکردنی بزووتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان پشتیبرانی لە حکومەتی تاران دەکرد.

«دەوڵەتی ئەمریکا لە ئاخری فەروەردینی١٣٢٥ باڵیوزی تازەی بە ناوی **جورج ئالین** نارد بوە تاران. لە گەڵکو گەیشتە تاران چەند وتار و وتو وێژی چاپەمەنی لە بارەی هەقانیەت و مەزلوومیەتی ئێران پێک هێنا. راوێژکەرانی نیزامیی ئەمریکای هاندا کە ئەرتەشی ئێران بەهێز و تەشویق بکەن. لەو ماوەیەدا کە قەوام

به رواڵەت سیاسەتی چەپایەتی گرتبوە پێش‌و گاڵتەی بە حیزبی تودەو دیموکراتەکانی ئازەربایجان دەکرد، راوێژکەرانی ئەمریکایی توانیان ئەرتەشی ئێران پرچەک و بە هێز بکەن‌و وای لێ بکەن کە توانای پەلاماردانی ئازەربایجانی هەبێ»(٥٤)

رۆژنامەی پراڤدای موسکو لە ژمارە ( ٢ی نوامبری ١٩٤٦ لە ژێر سەر دێری«

نامەی رێبەری کوردە دیموکراتەکان **قازی محەممەد** بۆ سەرۆک وەزیر **قەوام‌السلطنە** » دەنووسێ :« لە نامەکەدا هاتوە : پولکوڤنیکی ئەرتەشی ئێران **پزشکیان** بە فەرمانی دەزگای غەیرە مەسئولی تاران دەستەی کوردەکانی مەهاباد دژی کوردە دیموکراتەکان هان دەدات. ئەفسەرێکی تر بە ناو **ئایرم** ئەم دەستەیەی بانگ کردوە تا رێگای سەر دەشتی بۆ بکەنەوە. پاشان بە ٤٠٠ کەسی چەکدار بە تفەنگ و تانک کوردە دیموکراتەکانی پەلامار داوە. **قازی محەممەد** بە سەرۆک وەزیر رادەگەیەنێ کە ئەم کارانە لەوانەیە هەرای گەورەی لێ ساز بێ.»

بە پشت ئەستوری ئینگلیز و ئەمریکا، مانگی سەرماوەری ١٩٤٦ ئەرتەشی ئێران بەرەو ئازەربایجان کەوتە رێ و رۆژی ٢١ی سەرماوەز بێ ئەوەی لە گەڵ بەر بەرەکانی هێزی فیدایی رو بەروو بێ گەیشتە تەورێز. رێبەرانی ف دیموکرات و تەشکیلاتی فیدایی کە ( مردن هەیەو گەرانەوە نیە) کرد بوویانە درۆشمی رۆژ، بێ تەقە و دەستکردنەوە، رایان کرد وزیشانیاندا کە ( مردن هە یە و گەرانەوەش هە یە ). ئاش بە تاڵی فیرقەی دیموکراتی ئازربایجان بە گوێرەی نوسراوەی گەلێک لە سەرچاوەکان کوشتاری ٢٥ هەزار کەسی بەدواوە بوو. حکومەتی ئێران بە پشتیواتی (سیاسەتی نێو نەتەوەیی) بەم چەشنە هێمنایەتی لە ئازەربایجاندا بەر قەرار کرد.

دوای گرتنی تەورێز، ئیتر کۆماری کوردستانیش کە لە لایەن حکومەتی تاران‌وزلهێزەکانی دەسەلاتدارلە ئێراندا حیسابی ئازەربایجانی بۆ دەکرا، دەبوایە

هەڵوێست و سیاسەتی خۆی روون کاتەوە. وەک نووسەرانی کورد و بێگانە باس دەکەن رۆژی پێنجی دیسامبر پێشەوا کۆبوونەوەیەکی لە رێبەرانی حکومەت و کۆماری کوردستان داوەت کرد کە شوراییکی شەر پێک بێنن. لە کۆبوونەوەی شورادا گەیشتنە ئەو بریارە کە لە بەرانبەر حکومەتی تاراندا بەربەرەکانی بکرێ. بەڵام بریاری ئاخری و لێبڕاو راگیرا بۆ کۆبوونەوەی جەماوەری لە مزگەوتی هەباساغا. لەو کۆبونەوەیەدا سەدری قازی لە بارەی چەپرەکی و بێ هێزی ئەرتەشی ئێران قسەی کرد.« بەڵام لە نێو خەڵکی شاردا هێندێک کەسی وەک مەلا عەولای مودەریسی و مەلا حوسێنی مەجدی قسەیان کردو گوتیان کە بەربەرەکانی کردن بێ سودەویەو جۆرەبیری ئاشبەتاڵیان لە نێو خەڵکدا بلاو کردەوە» (٥٥)

لام وایە تەنیا قسەی مەلا حوسێنی مەجدی و مەلا عەولای مودەریسی وەنەبێ تەئسیرێکی ئەو تۆیان کرد بێتە سەر بریاری شورای شەڕ و یا بیرو رای گشتی لە بارەی بەربەرەکانیەوە. وا وێدەچێ رێبەرانی کۆماری کوردستان بە لەبەرچاو گرتنی بارودۆخی ناوەکیو دەرەکی قووڵتر بیریان لە مەسەلەکە کرد بێتەوە. ئەگەر ئەوەش لە بەرچاو بگرین کە فیکری چارەسەرکردنی هێمنانەی مەسەلەی کورد دەمێک بوو لە بیرو کردەوەی رێبەرانی کۆمارو حکومەتی میللی کوردستاندا جێگای خۆی کرد بۆوە. بە تایبەت دوای سەفەری پێشەوا بۆ تاران و وتووێژی لە گەڵ قەوامی سەرۆک وەزیر، هەوای بەربەرەکانی و پاراستنی دەستکەوتەکانی بزووتنەوە لە رێگای توندو تیژییەوە ساردی بەسەردا هاتبوو. ئەوەتا پێشەوا لەوتاری خۆیدا بە راشکاوی دەڵێ :« مەرحەلەی شەڕ تەواو بوەو نۆبەی هونەرە» دەوڵەتی ئێران لەگەڵ حکومەتی ئازەربایجان رێک کەوتبوو. شورەوی بە خەیاڵی وەرگرتنی ئیمتیازی نەوت پشتی دەجولانەوەی کورد و ئازەری کرد بوو. ئینگلیز و ئەمریکا بۆ سەپاندنی دەسەلاتی تاران بە سەر ئازەربایجاندا ئێرانیان هاندەدا. دەوڵەتی ئێرانیش لە راگەیاندنی

خۆیدا گۆیا بۆ چاوەدێری بەسەر هەڵبژاردنی پارلماندا ئەرتەش دەنێرێتەوە ئازەربایجان نەک بۆ کوشتاری خەڵک وەک لە تەوریز کردیان. سەیرێکی رۆژنامەکانی کوردستانی دوای سەفەری پێشەوا بۆ تاران بکەین، گۆرانی سیاسەتی حکومەتی میللی کوردستانمان بە جوانی بۆ دەردەکەوێ. بە لێکدانەوەی هەمووی ئەم دیاردەو رووداوانەو زۆر شتی دیکەی نادیاریش پێشەوا هەوڵو تەقەلای خۆی بۆ پاراستنی هێمنایەتی لە کوردستان و دوور خستنەوەی مەهاباد لە کارەساتی تەوریز درێژە پێدەدا. بەلاْم بە داخەوە گیانی خۆی لەسەر دادەنێ.

« لە مزگەوتی هەباساغا قازی محەممەد لە وتارێکدا داوای لەسەرخۆیی و نەشەڵژانی لە خەڵک کردو گوتی :هەر بریارێکی بە پەلە دوا رۆژێکی فرە شپرزەوخەفەتباری بەدواوە دەبێ. هەروەها رایگەیاند سەرەرای ئەوە کە مەترسی زۆر نیزیکە و من دەسەلاْت و دەرەتانی چوونەدەر لە ناوچەم هەیە، بەلاْم لە نێو ئێوە ناچمەدەر و گیانم فیدای ئێوەدەکەم.»(٥٦)

بە بروای من دەکرێ جۆرێکی دیکەش بۆ مەسەلەکە بچین. رەنگە هێشتا بۆ شیکردنەوەی ئەم رووداوە گرنگە مێژوویە هەوڵ و تەقەلای زیاتر پێویست بێ. بەلای منەوە پێشەوا سەرۆکێک بوو نەیویست لە سەر حیسابی کوشتارو ماڵوێرانی خەلک و کاولکردنی نیشتمانەکەی ناوو ناوبانگ بۆ خۆی دەربکاو گیرفانیشی بربکا. نەیویست هەر بۆ ئەوەی بڵێن شۆرش دەکات و شۆرشگێرە، میللەتەکەی تووشی کوشت و کوشتار بکا. رێبەرێک بوو بە فیداکردنی گیانی خۆی خەڵکو وڵاتەکەی لە دەست درێژی خائینان و دڵرەشی ئەرتەشی دوژمن پاراست. هەر وەک لە دادگاشدا بەر پرسیەتی هەموو رووداوەکانی گرتە ئەستۆ، بە ئازایەتی دلێرانە لە کردەوە و لە مافی رەوای کورد دیفاعی کرد و بەسەر بەرزی چوەسەردار.

رۆژی ١٩٤٦/١٢/١٦مستەفا بارزانی بۆ ئاخرینجار چاوی بە پێشەوا دەکەوێ. باگفتگۆی قازی .محەممەد و سەرۆک بارزانی لە زمانی

مەلامستەفاوە ببیسین:« چوومە لای قازی محەمەد و لیم پرسی: دەتەوێ چیکەی؟ لەوەلامدا گوتی: دەمەوێ لە پیناو تەرژانی خوینی خەلکی‌مەهاباد خۆم فیدا بکەم و تەسلیمی ئەرتەشی ئیران دەبم. هەیئەتیک دەنیرمە میاندواو کە بە ژەنرال هومایونی رابگەیەنێ. تاوی دەچاوان گەرا و گوتی: جگە لە جەماعەتی خۆت بروا بەکەس مەکە. تەواوی ئەوانەی سوێندی دۆستایەتی و پشتیوانیان خوارد بوو، خەیانەتیان کرد و بۆ راگەیاندنی خزمەت بە ئەرتەشی ئیران پیشبرکەیانە. ئامۆژگاریت دەکەم لە سەرۆک عەشیرەتان خۆت بپاریزە. تکاشم ئەوەیە بە خیرایی لە مەهاباد وەدەرکەون و لە تیک هەلچوون لە گەل ئەرتەشی ئیران خۆتان بپاریزن.

پاشان پرسی: دەتەوێ چیکەی ؟

پیم گوت: خاوروخیزان‌و هیزەکانمان لە ناوچەی شنۆو مەرگەوەر کۆدەکەینەوە تا بەهار دادێ، لە تیک هەلچوونیش لەگەل ئەرتەشی ئیران خۆ دەپاریزین. پاشان هەول دەدەین بۆ رازی‌کردنی حکومەتی عیراق کە لانی کەم بۆ خاو وخیزان لیبووردنی گشتی دەر بکا. ئەگەر لەوە ناهومید بووین روو دەکەینە یەکیتی سۆڤیتی. تەتەسلیمی ئەرتەشی عیراق دەبین‌و نەئەرتەشی ئیران. پاشان لەسەر هاتنەدەری لە مەهاباد لەگەل تیمە پیم داگرت و بە وشەی شەرەف بەلینم دایە کە تا لەگەل‌من بێ لە فیدا کاری‌دریخی ناکەم‌وهەست بە نارەحەتی ناکەی چونکە تۆ رەمزی نەتەوەی. پیمگوت: منیش پیت دەلیم کە بروا بە بەلینی حکومەتی ئیران نەکەی. بۆ ئیمە جیگای تازیەیە هەوەلین سەرکۆماری کوردستان بەدەستی دوژمنان بە دیل بگیرێ.

قازی لە جێ هەستا و هاتە پیش‌و گوتی: با ژیانی من فیدای هاونیشتماتانم بێ‌و دەبیتە هۆی کەم بوونەوەی ترس و کوشتاری کە بەسەریاندا دیت. ئەوەی گوت‌و ئالای کوردستانی هیناو دای بەمن و گوتی: ئەوە رەمزی کوردستانە لیم وەرگرەو ئەمانەت بێ لەئەستۆت چونکە باشترین پاریزگاری. لە کەش‌و هەوایەکی

خەم و خەفەتاویدا مالآوایییم لیکرد و دەرکەوتم و رووم کردە نەغەدە» (٥٧)

ئەرتەشی ئیران کە گۆیا بۆ چاو دێری بە سەر هەڵبژاردنی پارلماندا دەهاتەوە ئازەربایجان، وەک هێزی داگیرکەر هاتەوە کوردستان و بۆ چاو ترساندنی خەڵک لە گرتن و دادگایی کردنی ئازادیخوازان و ئیعدامی هێندێ لە نیشتمانپەروەرانی کوردیش دەستی نەگێرایەوە. لە ناوچەی سەقزی قەیزولابەگی و لە بۆکان ۱۲ کەسی لە رۆڵە نیشتمانپەروەرانی کورد لەداردا کە بریتیین لە :( **ئەحمەد خانی فاروقی ، حەمەمین بەگی باباخان بەگ، حەمەخانی دانیشوەر، عەبدولاخانی مەتین، ئەحمەد خانی شەجیعی، شێخ ئەمینی کەس نەزان، ئاغا سەدیقی بازیبلاغی، عەلیاغای جەوانمەرد، رەسولاغای میرەدێ، عەلیخانی فاتیح، حوسێنخانی جەلالی کانی نیاز و لە بۆکانیش عەلی بەگی شێرزاد** ) لە مەهابادیش چوار ئەفسەری فیداکاری هێزی بەرگری کوردستان، **محەمەدی نازمی، حەمیدی مازوچی، عبدولای روشنفکرو رەسولی نەغەدەیی** لەدار دران.

بەداخەوە پێشەوا **قازی محەمەد** بۆ رۆیشتن لەگەڵ **مەلامستەفا** موافەقەتی نەکرد .رۆژی ۲۱ی مانگی دیسامبر دوای رۆیشتنی **مەلا مستەفا** بۆ تاران **ژەنراڵ هومایونی** فەرمانی گرتنی پێشەواو یارانی داو بردیاننە زیندان..

لە سەر رووداوەکانی مێژوویی زۆر دەبێژرێن وگەلێک دەنووسرێن. زۆربەی بۆ چوونەکانیش لێک جیاوازن. **پێشەوا قازی** دەکرا وەک رەمزی بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی حەماسەی بەر بەرەکانی بخولقێنێ و تەسلیمی دوژمن نەبێ و مێژوو جورێکی تر قەزاوەت بکا، ئێستا دەتوانین هەر ئەوەندە بێژین بە قەولی **دوکتور قاسملوی شەهید**:« **پێشەوا قازی** بەو سوێندەی کە لە ٢٤ی رێبەندانی ۱۳۲٤ بە گەڵ و نیشتمان خوارد بووی وەفادار مایەوە، شەهید بوو بۆ ئەوەی گەلی کورد "سەر بەرز بژی. »

« ... هەر سێ قازی لە دادگایەکی تیزامی بە تهێنی لە مەهاباد دادگایی کران و رۆژی ۲۳ی ژانویە بە مەرگ مەحکوم کران. بە لاّم ئیجرای حوکمی ئیعدامیان لە تاران وەدوا خرا. چونکە قەوام نەیدەویست لە کاتی وتو وێژی گرنگ لە گەڵ رووسەکان هەرای لێ ساز بێ. کەمێک پێش رۆیشتنی من لە تاران لە فیوریەی ساڵی ۱۹٤۷ ژەنراڵ رەزمارا چوە مەهاباد. بەڵگەم بە دەستەوە بوو کە گومانم نە مێنێ چاوە دێری بە سەر ئیعدامی قازیەکاندا بەو سپێردراوە. من چوومە لای جورج ئالینی باڵیۆزمان تا بزانم کارێکمان پێدەکرێ.

باڵیوزلە منی پرسی:« بۆ چی ئەوەندە نیگەرانی وەزعیقازیەکانی ؟ هەر چی بێ ئەوان لە گەڵ شورەوی هاو کاریان کردوە - باشە .. راستە، بەلاّم ئەوان هەوڵیان داوە ئەوەندەی بۆ یان بکرێ بۆ باشبوونی بارو دۆخی خەڵک بیکەن. شورەویش تاقە کەس بوو کە یارمەتیان دەدان. ئەگەر ئەوان ئیعدام بکرێن لە هەموو شوێنێ ئێمە بە شەریکی ئەو کارە دەزانن.

- باشە . دەتەوێ چبکەم ؟

- پێم وایە تۆ داوا لە شا بکەی کە بە رەزمارا بڵێ قازیەکان بۆ دادگایەکی ئاشکرا و مونسیفانە بێننە تاران.

شا لە سەر داوای باڵیوزمان گورج بانگی کرد. باڵیوزمان لەو چاو پێکەوتنەدا هیوا داری نیشان دا کە مەسەلەی عێلات و لەوانە مەسەلەی کوردەکانیش بە باشی چارە سەر بکرێ. پاشان گوتی: هەر چەند قازیەکان لە گەڵ شورەوی هاو کاریان کردوە، بەلاّم لە بواری پەروەردەو فێر کردندا خزمەتی زۆریان بە خەڵک کردوە. لێرەدا شا قسەکانی ئەوی بری و بە زەردە خەنەوە لە باڵیوزی پرسی : « تۆ ترست هەیە کە من ئەوان گوللە باران بکەم؟ ئەگەر مەسەلەکە ئەوەیە، دڵنیا بە بە هیچ جور خەیاڵێکی ئاوام نیە.»

بەیانی رۆژی ۳۱ی مانگی مارسی بە فەرمانی ئەعلاحەزرەتی شاهەنشا قازیەکان لە دار دران. لە وانەیە راست دوای وەدەر کەوتنی باڵیوزمان، شا

دەستوری ئیعدامی ئەوانی راگەیاند بێ.» (٥٨)

**ئەنسیکلوپیدیای گەورەی سۆڤیێتی، چاپی سالی ١٩٥٤ لاپەرەی(٤٦٠.)ی بەرگی(٢٨) لە سەر قازی محەمەدەوە دەنووسێ:**

**« محەمەدی قازی(قازی محەمەد) ١٩٤٧-١٩٠١** یەکێکە لە رێبەرە بە دیمەنە سیاسیەکانی نەتەوەی کورد لە شاری مەهاباد(کوردستانی ئێران) لە خێزانێکی روحانی لە دایک بوە.

پاش سەرکەوتنی شۆرشی فیوریەی سالی ١٩١٧ لە رووسیا، پێوەندی کپ و نیزیکی لە گەل کومیتەی نهێنی شۆرشگێری سەربازانی ئۆردووی قەیسەری رووسیا - کە ئەو دەم لە ئێران بوون-راگرتوە. لە مەلبەندی سابلاغ-مەهابادی ئێستا-بە هاو بەشی ژمارەیەک لە رووناکبیرانی پێشکەوتووی کورد کۆمەلێک رێک دەخا، وە ئەو کۆمەلە دەست دەکا بە بلاو کردنەوەی بیری تێکۆشان بۆ رزگاری کوردستان.

پاش چەند سالێک حکومەتی ئێران لە ژێر زەبری بیروڕای کۆمەلانی هەراوی خەلکی کوردستاندا، ناچار ئەبێ **قازی محەمەد** بکا بە سەرۆکی دائیرەی مەعارف و قازی مەهاباد و دەورو بەری ئەوێ. **قازی محەمەد** ئەو کارە کە لە سەر کار بوو، چەند مەدرەسەیەکی ئاوەدان کردەوە و لەو مەدرەسانەدا بیری رزگاری کردنی گەلی کوردی لە چنگ زولمی ئێران لە ناو لاوەکاندا بلاو دەکردەوە. پاش ئەوەی کە دیکتاتوریەتی رەزاشای پەهلەوی جێی خۆی قایم کرد، حکومەتی ئێران **قازی محەمەدی** لە سەرۆکایەتی دائیرەی مەعارف خست.

دوای ئەوە کە سالی (١٩٤١ دیکتاتوریەتی **رەزاشا رووخا** و بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوایەتی لە ئێراندا پەرەی گرت، **قازی محەمەد** بەتەواوی هێزی خۆی بۆ رزگاریو سەر بەخۆیی میللی گەلی کورد وە لە پێناوی رێکخستن ویەکگرتنی تەواوی هێزە دیموکراتیەکانی کوردستاندا کەوتە خەبات و تێکۆشان.

سالەکانی( ١٩٤٥-١٩٤٢)**قازی محەمەد** سەرۆکی حیزبی پێشکەوتووی

نهێنی کوردستان (کۆمەڵە)بوو. ساڵی ١٩٤٥ کۆنگرەی یەکەمی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە لە چوار چێوەی ئێراندا داوای سەر بەخۆیی گەلی کوردی دەکرد، **قازی محەممەدی** بە سەرۆکی حیزب هەڵبژارد و لە ژێر رێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا حکومەتی میللی دیموکراتیکی کوردستان بە سەرۆکایەتی **قازی محەممەد** دامەزرا. ئەو حکومەتە ریزە ئیسلاحاتێکی دیموکراتیکی بەرێوە برد، وەک ئەسپاردنی هەموو کاروباری دائیرەکانی کوردستان بە دەست کوردان، دامەزرانی ئۆردووی رزگاریخوازی کورد، دانانی گەلێ قوتابخانەی کوردی، دەرکردنی رۆژنامەو کتێب و گووار بە زمانی کوردی و شتی تر... بەلام ئەو حکومەتە ئیسلاحی زەوی جێ بەجێ نەکرد. لە ئاخری ساڵی ١٩٤٦دا حکومەتی کۆنەپەرستی **قەوام‌السلطنه** بە گوێرەی ئەسپاردەی ئیمپریالیستەکانی ئەمریکا، پاش تێک شکاندنی بزوتنەوەی دیموکراتینی ئازەربایجانی ئێران ئۆردووی ئێرانی بۆ سەر کوردستان هاندا. وەجولانەوەی رزگاریخوازی نەتەوایەتی کوردەکانی ئێرانی تێک‌شکاند. **قازی محەممەد** ورابەرەکانی تری گەلی کورد گیران. لە٣١ی مارسی ١٩٤٧لە شاری مەهاباد حکومەتی ئێران بە ئەسپاردەی ژەنراڵ **شوارتسکۆفی** ئەمریکایی **قازی محەممەد** و سەدری **قازی** برای **قازی محەممەد**و نوێنەری پارلمانی ئێران، وەسەیفی **قازی** ئامۆزای (حاکمی مەهاباد)ی هەڵاوەسی».

**(تێبینی: ئەم تێکستەی (ئەنسیکلۆپێدیای سۆڤێتی) لە لایەن دوکتور رەحیمی قازی‌یەوە پێم گەیشتوە)**

پێدا چونەوەی رەوەندی بزووتنەوەی نیشتمانی ودیموکراتیکی کوردستانی ئێران دوای روخانی کۆماری کوردستان بە ئیجازەی خوێنەرانی بە رێز رادەگرین بۆ بەرگی دووەمی پێدا چوونەوە .

# پەراوێزەکانی بەشی حەوتەم

١٠- ئار چی رۆز ولت - کۆماری کورد لە مەهاباد، وەرگێرانی خالدی عزیزی ١٩٩١، ل ٣

٢ - لازاریڤ، بزووتنەوەی کورد لە سەر دەمی نوێ دا. موسکو. ١٩٩٨. ل ١٨.

٣ - جعفر مهدی نیا، زندگی قوام السلطنه. ل ٥٤٣

٤ - نوشیروان مستەفا - حکومەتی کوردستان ، ١٩٩٣، ل ١٣٨

٥ - ئارچی روز ولت همەمان سەر چاوە ، ل ٤٣ - ٤٤

٦ - ئیگلتون ، کۆماری ١٩٤٦ کوردستان، وەرگێرانی سەید محمدی صمدی، ١٣٦٢ ، ل ١٨٦

٧ - دوکتور قاسملو ، چل ساڵ خەبات لە پێناو ئازادیدا، ١٩٨٥ ، ل ٩٨.

٨ - ح. جەمال - ر. کوردستانی نوێ ، ٣ی کانونی دووەم . ١٩٩٢

٩ - روانگەی پێشەوا. گردەوەکۆیی حەسەنە قازی ١٩٩٤ ل ١٩

١٠- ئارچی روزولت، هەمان سەر چاوە ، ل ٣٧ - ٣٨

١١ - لازاریڤ - مەسەلەی میللی لە ولاتانی رۆژ هەلاتی نیزیک و ناوە راست موسکو، ١٩٧. ل ١٠٠.

١٢ - د. قاسملو ، هەمان سەر چاوە ، ل ٩٨ - ٩٩

١٣ - کوردستان ژمارە ٢٢، ١٣ رەشەمەی ١٣٢٤- ٤ی مارسی ١٩٤٦ . گردەوە کۆیی حەسەنی قازی

١٤ - گۆڤاری عصر جدید ، ژمارە ٢٥ ، موسکو ١٩٤٩

١٥ - درگ کینیان ، کوردەکان و کوردستان ، وەر گێرانی برایی یونسی ، ١٣٧٢ ، ل ١٩٧

١٦ - جەلال تاڵەبانی ، کوردایەتی ١٩٦٦ ، ل ٩١

١٦ - کوردستان ، ژمارە ١٠ ، ١٥ی ریبەندانی ١٣٢٤. ٤ی فیوریەی ١٩٤٦ گردەوە کۆیی حەسەنی قازی

١٧ - هێمن - تاریک و روون ، ١٩٧٤ ، ل ٢٣

١٨ - نوشیروان مستەفا ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٣.

١٩ - سەر چاوەی پێشوو ، ل ١٢٩

٢٠ - ئيگلتون ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٢٥ - ١٢٦

٢١ - درک کینیان ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٣٤

٢٢ - سەر چاوەی پێشوو ، ل ١٢٤

٢٣ - ئیگلتون ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٣٧ - ١٣٨

٢٤ - م.س. ئیوانۆف ، تاریخ نوین ایران ، فارسی ، ١٣٥٦ ، ل ١٢٦

٢٥ - درک کینیان ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٢٦ - ١٢٧

٢٦ - جعفر مهدی نیا زندگی قوام السلطنه ل ٤٩٨

٢٧ - نوشیروان مستەفا ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٢٥

٢٨ - درک کینیان ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٢٥

٢٩ - ئیگلتون ، هەمان سەر چاوە ، ل ١١٠

٣٠ - سەر چاوەی پێشوو ، ل ٢٠١

٣١ - ئارچیبالد روزولت ، شوق مطالعه ١٣٧١ ، ل ٣٤٠ - ٣٤١

٣٢ - کەریمی حسامی ، کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خود موختاری ، ١٩٨٦ ، ل ٨١ - ٨٢

٣٣ - ١٢ شهریور ،تاریخچه نهضت دمکراتیک ئازربایجان، نشریه شعبه مرکزی تبلیغات، تبریز، ١٣٢٥.ل ١٢٢-١٣١

٣٤ - روانگەی پێشەوا ، گردەوەکۆیی حەسەنی قازی ١٩٩٤، ل ٢٧

٣٥ - جعفر مهدی نیا ، هەمان سەر چاوە ، ل ٥١٢

٣٦ - محمود مەلا عزەت ، دەولەتی جەمهوری کوردستان نامەو دۆکومێنت، ١٩٩٢ ، ل ١٩٣

٣٧ - مسعود محمد ، حاجی قادری کۆیی ، بەرگی ٢ ١٩٧٤ ، ل ١١٥

٣٨ - د. قاسملو ، هەمان سەر چاوە ، ل ٦١

٣٩ - ١٢ شهریور ، تاریخچه نهضت دمکراتیک ئازربایجان. ١٣٢٥ ، ل ١٤١ - ١٤٣

٤٠ - روانگەی پێشەوا، گردەوە کۆیی حەسەنی قازی ، ١٩٩٤ ، ل ٣١

٤١ - درک کینیان ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٢٧ - ١٢٨

٤٢ - ئارچیبالد روزولت ، هەمان سەر چاوە ، ل ٣٣٢

٤٣ - درگ کینیان ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٢٨

٤٤ - ئارچیبالد روز ولت ، هەمان سەر چاوە ، ل ٣٣٢

٤٥ - ئیگلتون ، هەمان سەر چاوە ، ل ١٩٤
٤٦ - د ، قاسملو ، هەمان سەر چاوە ، ل ٥٧
٤٧ و ٤٨ و ٤٩ کورد ستان ژمارە ٧٢ روانگەی پێشەوا . گردەوە کۆیی حەسەنی قازی ١٩٩٤ ل ٣٧
٥٠- محمود مەلا عزەت ، دەوڵەتی جمهوری کوردستان ١٩٩٢ ، ل ٨٣
٥١ - ئارچیبالد روز ولت هەمان سەر چاوە ، ل ٣٤٥
٥٢ - ئیگلتون ، هەمان سەر چاوە ل ٢٠٢
٥٣ - خاطرات سیاسی دکتر کریم سنجابی امیدها و نا امیدیها ، ١٣٦٨ ، ل ٧٣ - ٧٢
٥٤ - عبدالرضا هوشنگ مهدوی، سیاست خارجی ایران در دوران پهلوی، ١٣٧٣ ، ل ١١٧ - ١١٦
٥٥ - د، قاسملو ، هەمان سەرچاوە ، ل ٦٧
٥٦ - ئیگلتون - هەمان سەرچاوە ، ل ٢٠٦
٥٧ - مسعود البارزانی - البارزانی والحرکه التحرریه تاکردیه ١٩٨٧ ، ل ٣٩ -٣٨
٥٨ - ئارچیبالد روزولت ، هەمان سەر چاوە ، ل ٣٥١

## بەرهەمە نووسراوەکانی نووسەر

١ - کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران
٢ - وەلامێک - کوردی و فارسی
٣ - رێنوێنی شەری پارتیزانی
٤ - لە دەوری رێکخراوی لاوانی دێموکرات کۆ بینەوە.
٥ - رەخنەو لێکۆڵینەوە لە سەر کتێبی حوسێنی مەدەنی
٦ - چەند قسەیەک لە گەڵ خەبات
٧ - کورد و فەرهەنگی بێگانە.
٨ - لێکۆڵینەوەی«کورتە باسێک لە سەر سۆسیالیزم» کوردی‌وفارسی
٩ - تایبەتی کونگرەی شەشەم
١٠ - کۆماری دیموکراتی کوردستان یاخود موختاری

١١ - يادى هێمن

١٢ - لە پێناو چیدا ؟

١٣ - پادانەوە

١٤ - کرو کاش ( چاپ نە کراوە

١٥ - سەفەر بۆ کوردستان

١٦ - لە بیرەوەریەکانم بەرگی: ١-٢-٣-٤-٥-٦-٧-٨-٩

١٧ - پێدا چوونەوە

## ئەو بەرهەمانەی نووسەر کردوونی بە کوردی

١ - دایک - ماکسیم گۆرکی

٢ - ژیان و کردەوەکانی لینین

٣ - ئەفسانە کوردی‌یەکان- رۆدینکۆ

٤ - زەوی پچوک - برێژنێف

٥ - کۆمەڵە چیرۆکی هەڵبژاردە لە ئەدەبی بینگانە

٦ - مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید

٧ - یاسای بنچینەیی ئابووری سۆسیالیستی ( چاپ نەکراوە )

٨ - حەمە چکۆڵ ( نینجە مەمەد) - یاشار کەماڵ چاپ نەکراوە )

٩ - نوسولی سەرەتاییەکانی فەلسەفە ( چاپ نەکراوە )

١٠ - نامەی گوللە بارانکراوەکان ( چاپ نەکراوە )

١١ - رەوشی کوردان - مێژووی بابان و ئەردەڵان

١٢ - ئازادی یا مەرگ - کازانتزاکیس ( چاپ نەکراوە )

١٣ - مەسەلەو زار گۆتنی لوڕی ( چاپ نەکراوە )

١٤ - رۆژەکانی ئیران - ئارچیبالد رووزیلت

# ریزی ناوەکان

ئەلف :

خ:



د :

## ع :

و :



هـ :



ی :

پەیوەند ....



ژمارە ۲۵۴
میژوو ۲۵/۱/۷
** فەوری **

# حزبی دیموکراتی کوردستان

مهاباد
کومیتەی مەرکەزی

کومیتەی حزبی دموکراتی کوردستان عراق

لەجوابی نوسراوی ژمارە ۲۰ ی بەرواری ٦/۱/۲۵ پێویستە لیتان معلم بفەرمونەوە ئەو برا بارزانیانە لە شنودە یان چندە وتانەو زو لەلاین اهالی شنو چلدیان کە تم وەرگرتووە هەرچی زوتر بنوسن تا اندامی پیویست لە بارە یاندا انجام بدرێت .

کومیتەی مەرکەزی حزبی دیموکراتی کوردستان





# وزارەت هێزی کوردستان

مقام محترم معاونتی فەرماندەی کل‌قوا

لەپاش عرض سلام بەعرضتدەگەیێنم اگر لەخصوصی اوضاعاتی ستادهێــز میاندواو سوآل بفرموی روژا نەمرتبا مشغول کارین ومیرزا سلطان جلیلی کە بو سابڵاغی روی ومجاری نەغا توتەوە ٠ وجناب حاجی سید عبداللە افندی دەگەل کوری سید بلەغا تنەایرە لەپاش ئەوێك معطلی بوطرقی مراغە حرکتیان کرد گویا بەمحلی توریزیدا بوما لی خویان دەچنەوە وحضرت رئیس جمهور یش بەتوسط ستاد هێز میاندواو لەاسماعیل شیخ آغاشی نوسی وە کە روژی ۱۱/۱۷ /۲۴ دەبی خوی لەسابڵاغی معرفی بکا منتظرین کە ئەورو حرکتی بکا لازم بو یەعرضت بەگێنم وەفرماندە بول ساینقلاتو سیویتی کە اهل هوشار وساینقلا لەدست حزبی دیموکرا آذربایجان شکایتی لەلیمەدەکەن ایمەکەما مورخومان دەنیرین جوابمان ـ نادەتوە آیا ایمە حقی تیرخالی کردن مان هەیە یاخیر امن لەجویدا نوسیمەوە کەابدا بەهیچ جوری حقی تیرخالی کردن ویا کوشتن نیە بوگزاریش ئەوشم بەعرضت گایانت. وەتەواوی افسرانی ستاد هێز میاندواو عرض وسلامت بخدمتدەگەینن

رئیس ستاد هێز دیموکرات میاندواو ـ اسحاقــی

[CYPHER OTP] 17 SEP 1946

[This telegram is of particular secrecy and should be retained by the authorised recipient and not passed on.]

CABINET DISTRIBUTION

FROM TEHRAN TO FOREIGN OFFICE

Mr. Le Rougetel
No. 1468.
September 14th, 1946.

D. 11.55 a.m. September 15th,1946.
R. 1.50 p.m. September 15th,1946.

Repeated to Government of India

JJJ

Following received from Tabriz telegram No. 285 September 11th.

[Begins]

Qasim Ilkhanizadeh one of the chiefs of Dehbukri Kurds visited me last night. He had little new information but spoke strongly of his tribe's opposition to the Kurdish [grp. undec. ?Democrat] party and asked for British aid in countering its influence, proposing liaison between his house and the British authorities in [grp. undec. ?Iraq] since Democrats control makes contact with me all but impossible. I discouraged this proposal and advised him to use the influence of his tribe to bring about Kurdish-Persian agreement and by contributing to the unity of Persia help more effectively to counter foreign penetration. He naturally found this advice both unrealistic and unpalatable.

2. Number of Kurdish chiefs are now gathered in Tabriz and Qasim hinted at some more vigorous action by Kurdish Government to end the present deadlock with Azerbaijan.

3. Despatch follows.

[Ends]

دەقی راپۆرتی کونسولی ئینگلیز لە تەوریز : دەقی وەرگێڕاوەکەی لە نێو کتێبەکە دایە
پێداچوونەوە



پێشەوا قازی محەممەد لە سەردەمی لاوێتی دا



ڕۆژی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە مەهاباد - ١٧ی دیسامبری ١٩٤٥



له راست بۆ چەپ : هێمن ، پێشەوا قازی محەمەد ، هەژار



پێشەوا لە دەفتەری کاری دا ١٩٤٦



له راسب بۆ چەپ راوەستاوەكان : حەمە حوسێنخانی سەیفی قازی ،جەعفەری كەریمی،نانەوازادە،سەدیقی حەیدەری،
عەزیزی سەدیقی. دانیشتووەكا :هەژار ، پێشەوا، هێمن .



ڕاوەستاوەکان ریزی پشتەوە: رەحیمی، حوسێنی فروهەر، ئەیوبی، مەلای کەریمی، محەمەدی باهۆ، محەممەدی ئەسحابی

ریزی پێشەوە : حاجی مستەفای داودی، خەلیلی خسرەوی، ئەحمەدی ئیلاهی، محەمەدەمینی موعینی، وەهابی بلوریان

عبدالرحمن ئیلخانیزادە، کەریمی ئەحمەدەمین، عەلی ریحانی.



سمكۆ لە سەردەمی دەسەلات دا



سمکۆ لە تورکیا لە گەڵ خورشیدی برای



شێخ مەحمود و سەردار ڕەشیدی ئەردەڵان

مەلبەندی ژێر دەسەلاتی کۆماری کوردستان - ١٩٤٦ وهێڵی پەرینەوەی بارزانیەکان



سمکۆ لە تورکیا لەگەڵ میرزا موسیم خانی خۆیلی

## نێو ئاخن